# تەفسیری زمناكۆیی

بەقەڵەمی

مەلا سعیدی زمناكۆیی

جزمی ﴿١﴾

بەرگی یەكەم

# پێشکەشە

❖ بەگیانی پیرۆزی پێغەمبەر (ﷺ)

❖ پێشکەشە بەگیانی پیرۆزی ئـەو مامۆسـتایانەم کـەفێری خوێندنـەوەی قورئانی پیرۆز و زانستە ئاینیەکانیان کردم .

❖ پێشکەشە بەخێزانی بەوەفام کە لـە خۆشی و ناخۆشیدا هاوڕێم بووە.

❖ پێشکەشە بە کوڕو کچەکانم ، هیوادارم هەمیشـە سـەرکەوتووبن بـۆ ئایین و نەتەوەکەیان .

﴿ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ﴾

سوپاس و ستایش بۆ ئەو یەزدانەی کە ووزەی بەخشــی بەدەســت و پەنجــەمان تــا قەڵەمی پێبگرین و فەرموودە پیرۆزەکانی تەفسیر بکەین ، درووود بۆ ئــەو پێغەمبــەرەی کــە یەزدان ڕەوانەی مرۆڤایەتی کرد و پێش هەموو شتێك فێری خوێندنەوە و ووشەی پــیرۆزی ( إقرأ ) ی کردین .

لەو ڕۆژەوە لە حوجرە و مزگــەوت و قوتابخانــە ئاینیــە پیرۆزەکــانی کوردســتاندا مێشك و دڵ و دەروونم بە ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان گۆش کراو ، لەو ڕۆژەی دەستم دایە خوێندنی زانستە ئیسلامی‌یەکان خولیایەك لــەدەرونمدا چەکــەرەی کــرد ئــەویش خولیــای تەفسیر کردنی قورئانی پیرۆز بوو بەزمانی پاراوی نەتەوەکەم ، هۆی دروســت بوونــی ئــەو خولیایەش دەگەڕایەوە بۆ دوو خاڵی سەرەکی :

یەکەم : ئەوین و خۆشەویستی و ڕێــزی گــەورەم بــۆ ئــەو ئایەتــە پیرۆزانــەی قورئــان ، کەلەشەوی دەیجوری مرۆڤایەتیدا ، وەك چرایەك هەڵکراو هەموو جیهانی ڕوون کــردەوە ، چرایەك تاهەتایە نورەکەی بەسەر هەموو دنیادا بەخش ئەبێت و ، هەرگیز خامۆش نابێت.

دووەم : هاوسۆزیم لەگەڵ زمانی نەتەوە چەوساوە موسڵمانەکەمدا ، کەسەرەڕای ئەوەی خزمەتێکی گەورەی ئایتی ئیسلامی پــیرۆزی کــردووە ، هەمیشــە لەلایــەن دوژمنەکانیــەوە چەوساوەتەوە و ، تاڵی جەور و ستەمی چەشتوە . دواتر گەیشتمە ئــەو بڕوایــەی کەیــەکێ لەهۆکاری دواکەوتویی نەتەوەکەم پشت گوێ خستنی زمانی نەتەوەکەمە .

بۆیە خولیای تەفسیر کردنی قورئانی پیرۆز بــەزمانی پــاراوی کــوردی هــەر لەســەرەتای ژیانی لاویتیمەوە لە مێشك و دەروندا گەشەی کرد .

ڕۆژ هات و ڕۆی ، نەتەوەکەم زۆر شۆڕش و نوچدان و هەڵسانەوەی بینی ، نەتەوەکــەم لەڕێگای شۆڕش و کۆششی ڕۆڵە بەجەرگەکانیەوە توانــی زۆر دەســتکەوتی کولتــوری و ڕۆشنبیری بەدەست بێنێ بۆ خزمەت کردنی زمان و ئــەدەبیاتی کــوردی ... لــەو بەینــەدا

چەند زانایەکی گەورە و پایەبەرزی وەك مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و خوالێخۆشبوان مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ و مامۆستا مەلا عوسمانی مەلا عەبدولعەزیز و شێخ محەمەدی بالیسانی و مامۆستا مەلا محەمەدی قازی پێنجوێنی و چەند زانایەکی تری پایە بەرز لە هەولێر و سلێمانی و کوردستانی ئێران و کەبەداخەوە ناوەکانیانم لە یاد نیە دەستیان دایە ئەرکێکی پیرۆز کە بریتی بوو لە تەفسیر کردنی قورئانی پیرۆز ، کەبەداخەوە هەندێکیان بەهۆی ماڵئاواییان لەدنیا تەواویان نەکرد . ئەمەش بوو بەهاندەرێکی ترم تا ئەو خولیایە زیاتر لە دڵ و دەروونمدا بگەشێتەوە .

شەوێك لەشەوانی زستانی ١٩٨٤ ، بڕیارمدا ئەو خولیا پیرۆزە جێبەجێبکەم و دەست بدەمە پرۆژەیەك بۆ تەفسیر کردن و لێکدانەوەی ئایەتە پیرۆزەکانی یەزدان . ئیتر لەو شەوەوە تا ئەمڕۆش هەر سەرقاڵی ئەو ئەرکە پیرۆزەم و ، کاتێکی زۆری خۆم تەرخان کردووە بۆ گەشت و گوزار لە گوڵزاری تەفسیرە گەورەکاندا تاکو ئاسۆی بیرکردنەوەی خۆم فراوان بکەم و ، ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان تەرجەمە و تەفسیر بکەم بەزمانی ڕەسەنی کوردی .

ئێستا لەخوای گەورە بەزیادبێت کەتەمەنی تائەمڕۆ درێژکردمەوە ، لەنێوان ئەمسالانەدا توانیومە ئەو پرۆژە پیرۆزە بەئەنجام بگەیەنم و هەر ﴿٣٠﴾ جزمە پیرۆزەکەی قورئان بەزمانی کوردی تەفسیربکەم .حەز دەکەم خوێنەری بەڕێز لەوە ئاگاداربکەمەوە کە من لەئەنجامدانی ئەم پرۆژەیەدا هەوڵم داوە شێوازێکی تایبەت بگرمە بەر و پەیڕەوی چەند خاڵێك بکەم لەوانە :

(١)تەنها لەسەر ماناکردنی ڕستە و ووشەکانی قورئانی پیرۆز نەوەستاوم بەڵکو هەوڵم داوە بەشێوەیەکی درێژ تەفسیریان بکەم و ئاماژە بدەم بەهەندێ مەسەلەی دەرەکی بۆ دەوڵەمەند کردنی مەبەستەکانم .

(٢)لەتەفسیر کردنـی ئـەو ئایەتانـەدا کەپـەیوەندییان بـە عـەقیدەوە هەیـە ، هـەوڵم داوە بەشێوەیەکی درێژ باسی بـیروڕای زانـا و فەیلەسـوفەکان بکـەم و ، بـاس لـە بەڵگـە عەقڵیەکان بکەم ، بەمەبەستی فراوانکردنی ئاسۆی بیرکردنەوەی خوێنەر .

(٣)لەکاتی لێکدانەوەی مانای ئەو ئایەتانەدا کە بوونەتە چاوگی حوکمـی یاسـایی فیقـهی هەوڵم داوە بەشێوەیەکی فراوان بـاس لـەحوکمـە شـەرعیەکان بکـەم و ، ئامـاژە بـە بۆچوونی جیاوازی زاناکانی ئیسلام بکەم .

(٤)لەتەفسیرکردنی ئەو ئایەتانەدا کە چیرۆکی ژیانی پێغەمبـەرانبان تێدایـە ، هـەوڵم داوە بەشێوەیەکی وورد باسی ئەو چیرۆکانە بکەم و ، باس لەو پەند و عیبرەتانە بکەین کـە پێویستە لەو چیرۆکانە وەریان بگرین .

(٥)باسی ئەو ڕەوشت و ئاکارانەم کـردووە کـە هەمیشـە لـەقورئانی پـیرۆزدا جـەختیان لەسەر دەکرێ و ، باسی سیفەتەکانی مرۆڤی موسڵمانی کامڵم کردوە .

(٦)لەکاتی باسکردنی ئاینەکاندا ، هەوڵم داوە بەراورد لەنێوان ئاینی پـیرۆزی ئیسـلام و ئاینەکانی وەك مەسیحیەت و جولەکە بکەم و ، ڕوی گەشی ئاینی ئیسلام دەربخەم .

(٧)باسی هۆی هاتنەخوارەوەی ئایەتەکانی قورئان و ، ئایەتە مەککـەیی و مەدینەییـەکانم کردووە ، پاشان باسم لەغایەتی یەزدانی ئەو ئایەتانە کردووە .

(٨)تەفسیری ئەو ئایەتانەم کردووەکە ماناکانیان ئاڵۆزە و زیاد لەتەفسیرێك هەڵدەگرێ و ، هەروەها تەفسیری ئەو ئایەتانەم کردووە کە تەنها تەفسیرێك هەڵدەگرن .

(٩)باسی ئەرکە نەتەوەیی و نیشتمانییەکانم کردووە و ، باسـی ئـەرکی بـەرگری کـردنم لەخاکی نیشتمان کردووە کە ئـەرکێکی ئـاینی پـیرۆزە و نـابێ هـەرگیز خۆمـانی لێ بدزینەوە .

(١٠) باسی ووردەکارییە زمانەوانیەکانی قورئانی پیرۆز و ئیعجازی ئەو ووردەکاریانـەم کردووە .

(١١) باسی موعجیزەکانم کردووە بەگشتی و باسی ڕوخسارەکانی ئیعجازم کردووە لـە قورئانی پیرۆزدا .

(١٢) باسی جیاوازی نێوان مەزهەبەکانی ئیسلامم کردووە ، هـەوڵم داوە بەشـێوەیەکی بابەتی ئەو جیاوازیانە شی بکەمەوە .

(١٣) لەکاتی دوو دڵیدا پەنام بردووە بۆ تەفسیرە پیرۆزەکانی تر تاکو لەڕێگای ئەوانەوە بەرچاوم زیاتر ڕوناك ببێتەوە و نەکەومە هەڵەوە .

لەکۆتاییدا داواکارم لە یەزدانی گەورە لەو کەم و کورتیانەم خۆش ببـێ کەبـەبێ مەبەست کەوتونەتە ناو ئەم تەفسیرەوە ، هەروەها داواکارم لە خوێنـدەواران کەبەتێبینی و ڕوونکردنەوەکانیان سوودی زیاترم پێببەخشن ، لە پێناو خزمـەت کردنـی ئـاینی پـیرۆزی ئیسلام و نەتەوە چەوساوەکەم .

مەلاسعید زمناکۆیی

سلێمانی

٢٠٠٠/١٠/١٥

الحمد لله رب العلمين الذي نزل القرآن على عبده ليكون للعالمين نذيرا . والصلاة والسلام على الخريج من أرومة البلاغة والبراعة وعلى آله وشيعته.

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ﴾

سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ پەروەردگاری هەموو بوونەوەران . درودی بێ ئەندازە لەسەر گیانی پاکی پێشەوا و ڕەهبەری بونەوەران پێغەرمبەری خودا موحەمەدی کوڕی عەبدولاّ (ﷺ) وەلەسەر خێزان و یارو یاوەرانی هەتاهەتایە.

ماوەیەکی زۆرە بیرم لەوە ئەکردەوە دەست بدەمە خامە بۆ نوسینی مانای قورئانی پیرۆز بەزمانی کوردی و لەسەر شێوەی زاراوەی کرمانجی خوارو . بەلاّم خۆم بەشایستەی ئەو کارە گرنگە و دەریا بێ بنە نەئەزانی و خۆم بەخنکاوی ئەو زەریایە دائەنا بۆیە خامەم هەلّئەگرت و دام ئەنایەوە .

دوا جار پێم نا بەجەرگی خۆمدا ، بۆ جاری یەکەم دەستم کرد بەمانا کردنی قورئانی پیرۆز لە ﴿٩﴾ مانگی جیمادی یەکەم لەسالّی ﴿١٤٠٥﴾ کۆچی بەرانبەر بە ١٩٨٤/٢/١٠ زاینی و بەیاریدەی خودا کۆتایی پێ هات لە ڕۆژی یەك شەممە ﴿١٣﴾ ی مانگی زیل حیجە لەسالّی ﴿١٤١٧﴾ کۆچی بەرانبەر بە ١٩٩٧/٤/٢٠ زایینی .

لەجاری دووهەمیشدا بۆ پوختە کردنی نوسینی یەکەم دەستم پێ‌کردەوە لە ڕێکەوتی ﴿١٤﴾ ی مانگی زیل حیجە ﴿١٤١٧﴾ کۆچی بەرانبەر ١٩٩٧/٤/٢١ زایینی لەخودا ئەپاڕێمەوە کە یاریدەم بدا ئەم جارەیش بۆ کۆتایی پێهاتنی ئەو کارە گرنگ و گرانە .

پێشەکی : پێویستە بەر لەدەست پێ‌کردنی مانای مەبەست هەندێ کاری پێویست ڕوون بکەینەوە . وەئەوانیش بە چوار بەشەوە باسیان ئەکرێ :

## ﴿ بەشی یەکەم : ناوەکانی قورئانی پیرۆز و مانای ناوەکانیان ﴾

ناوی قورئـان ئەگاتـە نزیکـەی پـەنجا نـاو . دوای ووردبونەوەیـەکی ڕاسـت هـــەمویان بـەگوێرەی ماناکانیـان ئەگەڕێنـەوە بـۆ لای یـەك نـاو ئـەویش بریتیـە لـە قورئـان ، نـاوە بەناوبانگەکانیش ئەم چوار ناوەن :

١-[ القرآن ] یانێ خوێندن . ناوە بۆ ئەو پەیامەی ، خوا ناردویێتی بۆ پێغەمبەر .

٢-[ الفرقان ] یانێ ئەو پەیامەی کارە ڕاست و پوچەکان لەیـەك جیـا ئەکاتـەوە بـەهۆی بەلگەی ڕون و بێگومانەوە.

٣-[ الکتاب ] یانێ کۆکردنەوە ، واتە ئەو فەرمودانەی خوا ناردویێتی بۆ پێغەمبەر لـــەودا کۆکراوەتەوە .

٤-[ الذکر ] ئەم ووشەیە بە دوو مانا هاتووە ، هەردوو ماناکە ڕاست و شایستەن بکرێـن بە ناوی قورئانی پیرۆز (١) یانێ باس و گێڕانەوەی ئامۆژگاری خوا بۆ بـەندەکانی خـوا . (٢) یانێ ڕێزگرتن ، واتە قورئان خۆی لـەخۆیا بـەڕێزە و یاسـایە بـۆ ئـادەمیزاد ، و هـەر کەسێ بڕوای بە قورئان بێ لای خودا بەڕێزە .

## ﴿ بەشی دووهەم باسی گەورەیی قورئان ﴾

ئێمەی ئادەمیزاد بەهەر شێوەیە خۆمان ماندوو بکەین ئەوەی شایانی گـەورەیی قورئـان بـێ ناتوانین بینوسین . بەلآم بەسە بۆ گـەورەیی قورئـان کەتەنـها یاسـای موسـولمانان نیـە بـۆ پێویستی ژیانی هەردوو جیهان .

بەلکو یاسا نوسان و زانایان جیهان جگەی موسلمانان ، دوای خۆ مـاندوکردنێکی زۆری بێوچان بۆ دۆزینەوە و دیاری‌کردنی یاسایە بـۆ هـەموو ئـادەمیزاد لـە هـەموو جێگەیـە و لەهەموو کاتێکـا لەسـالی ﴿ ١٩٣٣ ﴾ هـەتا سـالی ﴿ ١٩٥٣ ﴾ ی زایینـی و ، دوای چەندین کۆڕو کۆبونـەوە پـرس و ڕاوێـژ بڕیاریـان دا کەیاسـای ئیسـلام بکـەن بەیاسـا و

دەستوری گشتی بۆ هەموو ئادەمیزاد لەڕوی زەوی‌دا بۆ بەکارهێنانی بەمەبەستی نەهێشتنی ئاژاوە و ناکۆکی نێوان هەموو ڕژێمەکانی جیهان ، بە موسڵمان و جگەی موسڵمانەوە و ، بڕیاریشیاندا کە یاسای بەردەوام بێت لەدادگای دادی نێـو دەوڵـەتی (( مَحْكَمَـة العَـدْلِ الدُّوَلِي )) کە بارەگاکەی لە شاری لاهای هۆڵەندی‌یە ، چونکـە یاسـایەکی سـەربەخۆیە ، نەرم و نیانە لایەنی هیچ لایەنێك ناگرێ جگە لەڕاستی و بێ‌لایەنی ، بۆیـە چاریـان نـەما و باوەشیان کردەوە بە دەستوری ئیسلام کەسەرچاوەکەی قورئانی پیرۆزە .

هەروەها بۆ گەورەیی قورئان : ئەبو هورەیرە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمەرەوە ( ﷺ) فەرمویـەتی : هەر کۆمەڵێ لەهەر مزگەوتێکا کۆببنەوە و قورئان بخوێنن و فێری بن و دانیشـتوانی تـر فێری قورئان بکەن ئارامی و دڵخۆشی لەلایەن خواوە ئـەڕژێ بەسـەریانا و، بەمیـهرەبان و بەزەیی خۆی دایان ئەپۆشێ و، فریشتەکان ئـەم لا و لایـان لێ ئـەگرن بـۆ نرخاندنیـان و ، خوای گـەورە ڕێزیـان ئـەگرێ و باسـیان ئـەکا لـەلای ئەوانـەی بـەڕێزن لای خـوا وەك فریشتەکان و گیانی پێغەمەران و شەهیدان و پیاوچاکانی تر .

ئەنەسی کـوڕی مـالیك یـاوەری پێغەمـەر ( ﷺ) ئـەڵێ : پێغەمـەر ئەفـەرموێ ، قورئـان لەهەموو شتی گەورەترە ، هەر کەسێ ڕێز لە قورئان بگرێ وەك ڕێزی لەخوا گرتبێ وایـە . ئەو کەسەی بەسوکی تەماشای قورئان بکا و گاڵتە بەڕاستیەکانی بکا گاڵتە بەڕاستی خوا ئەکا ، خوا پەنامان بدا .

عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئەڵێ پێغەمەر ( ﷺ) ئەفەرموێ ئـەو کەسـەی قورئـان بخوێنـێ و ماناکانی ڕوون بکاتەوە ، ڕاستی و ڕەواکـانی بەڕاسـت و ڕەوا بزانـێ و ، ئەوانـەی خـوا قەدەغەی کردوون بەناڕەوایان دابنێ ، خوا ئەو کەسە ئەخاتە بەهەشت.

هەڵگرانی فەرمودەی خوا بەوێنەی زانایان بەمیهرەبانی خواوە پێچراونەتەوە ، هەرکەسـێ بەسوکی تەماشایان بکا وەك گاڵتەی بەمافی ڕەوای خوا کردبێ وایە ، وە ئەبێ چ کەسـێ

گەورەتر بێ لەوانەی کتێبی مافی ڕەوای ئاینی ئیسلامیان پاراستووە و هەڵیان گرتووە بەبێ دەست کاری ؟

## ﴿ بەشی سێهەم : باسی پەناگرتن لەشەیتان ﴾

خوای گەورە فەرمان مان پێ ئەدا پەنا بگرین لەشەیتان و ئەفەرموێ : ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴾ ئایەتی (٩٨) سورەتی (نەحل) یانێ هەرکاتێ تۆ ویستت قورئان بخوێنی تۆ بەهۆی یاریدەی خواوە پەنا بگرە لەشەیتانی دوورخراوە لەبەزەیی و میهرەبانی خوا .

لەئایەتی (٢٠٠) سورەتی (ئەلئەعراف)یش دا خوا ئەفەرموێ ﴿ وَإِمَّا يَنْزَغَنَّكَ مِنَ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ،إِنَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ ئەگەر لەلایەن شەیتانەوە دوو دڵیت تووش بوو کە خراپەیەك بکەی لەکاتی توڕەبونتا ، پەنابگرە بەهۆی خواوە لەشەیتان . بەڕاستی خوا هەر شتێ بڕوا بەدڵتا ئەیبیسێ و ئەزانێ بەمەبەستی نالەبارت و ، تۆ ئەپارێزێ لەخراپەکردن .

بەناوبانگترین ڕستە بەکار بهێنرێت بۆ پەناگرتن لەشەیتان بەهۆی خواوە ﴿ أعوذ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴾ بەهۆی یاریدەی خواوە پەنا ئەگرم لەشەیتانی دوورخراوە لەمیهرەبانی و بەزەیی خوای گەورە .

بۆئاگاداری : هەرچەندە ئێمە شەیتانمان نەدیوە ، بەڵام خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا لە (٨٧) جێگەدا باسی کردووە ، پێغەمەر ( ﷺ) لەزۆر فەرمودەیدا بەزۆر شێوە باسی شەیتانی کردوە و ، ئێمەی موسوڵمان گومانمان لە بونی شەیتان نیە ، وەهەر کەسێ لەبونی شەیتاندا گومانی هەبێ بەبێ باوەڕ دا ئەنرێ ، بەڵام لەلایەن یاسای ئیسلامەوە داوامان لێ ناکرێ چۆنێتی لەش و قەوارەی و بەرزی و پانی و ڕەنگی شەیتان وەسف بکەین .

پێویسته بزانرێ که خوای گەورە بۆ ئێمەی ڕوون کردوەتەوە کەشەیتان دوژمنی ئادادەمیزادە و ئامادەیە بەبێ وچان مرۆڤ لەڕێگەی خواپەرستی لابدا و لە فەرمانەکانی خوا دووریان بخاتەوە شەیتان بەنیازی خراپ بەدەرونی مرۆڤدا هاتوو چۆ ئەکا، کۆسپ و تەگەرە لەڕێگەی ئادەمیزادا دادەنێ و هاندانیان ئەدا بۆ خراپەکردن ، کردەوەی ناشایستەیان بۆ ئەڕازێنێتەوە بۆ دۆزینەوەی ڕێگەی ڕاست سەریان لێ تێك دەدا، خواپەرستی لەئادەمیزاد دا ئەمالێ ، دووریان ئەخاتەوە لەڕەوشتی شیرین ، ئەوانە هەمویان کار و کردەوەی شەیتانن .

ئەوەیشمان لەبیر نەچێ کاتی وائەبێ مرۆڤێ پەنائەگرێ لەشەیتان لەبەر کردەوەیەکی خراپی شەیتان ، بەڵام هەر لەوکاتەدا پێویستە ئەو مرۆڤە پەنا لەخۆیشی بگرێ چونکە ئەو مرۆڤە ئەو کردەوە خراپەی کردوە ، خۆی بزانێ یا خۆی گێل بکا ؟

تێبینی : ووتنی ڕستەی ﴿ اعوذ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطانِ الرَّجيمِ ﴾ پەسەند و چاکە لای خوای گەورە لەهەندێ کاتا ( واجب ) نیە ، وەك لەکاتی دەستنوێژ گرتن ، پێش نان خواردن ، بەر لەکردنی هەموو کارێ . ئەو ڕستەیە خودا پێویستی نەکردووە بەجۆرێ ئەگەر نەبێژرێ مرۆڤ گوناهباربێ ،بەڵام ووتنی زۆر چاکە لە پێش خوێندنی سورەتی فاتیحادا و لە هەموو ڕکاتەکانی نوێژدا ، وەئەوڕستەیە بەشێك نیە لە قورئانی پیرۆز ، وەئایەتێکیش نیە .

بۆ زانین : زۆر جاران هەندێ مرۆڤی خۆپەرست و بی باوەڕو لاواز لەلای هەندێ کەسی گێل و ساویلکە لەهەندێ کۆڕدا دەم درێژی بەکارئەهێنن بۆ خەڵەتاندنی ئەو مرۆڤە ساویلکانە لەبارەی ویست و ئارەزوی خوای گەورە ئەڵێن : کە هەموو شتێ بە و یست و ئاروزوی خوایە و خوا ئەیکا و ، مرۆڤ بێ دەسەڵاتە ، بۆ ئەبێ خوا سزای مرۆڤ بدا لەسەر کاری خراپ . بەر لەوەی تیشك بخەینە سەر وتوێژی شەیتان لەخزمەتی خوادا: پێویستە ئەو کەسانە بزانن خوا ئەقڵی بەخشیوە بەئادەمیزاد ، بەو هۆیەوە چاکە و خراپە

جویَ ئەکاتەوە . ئەمەی خوارەوەش دەقی ووتوێژێکە لەنێوان خوای گەورە و شەیتاندا کە هەندیَ زانایان باسیان کردوە و لەنامەکانی خۆیان تۆماریان کردوە:

شەیتان ئەڵێ : ئەی خوایە : ئەگەر تۆ بتویستایە من سوژدەم ئەبرد بۆ ئادەم و بەزۆر بەمنت ئەکرد ، ئیتر بۆچی سزای من ئەدەی ؟

خوای گەورە ئەفەرموێ : چ کاتێ زانیوتە من نەمویستوە تۆ مل کەچی بۆ ئادەم بکەی ، لە دووای ئەوەی من فرمانم پێدای سوژدە ببە بۆ ئادەم و نەت برد ؟ یا بەر لەفەرمان پێ دانت بەوەی سوژدە ببەی بۆ ئادەم ؟

شەیتان ئەڵێ : دوای ئەوەی فەرمانت پێ دام و سوژدەم نەبرد و بی فەرمانی تۆم کرد .

خوای گەورە ئەفەرموێ : کەواتە تۆ بیانوت نەما هەر بەگوێرەی ووتەی خۆت ، تۆ خۆتت بۆڕدا ، چونکە مل کەچ نەکردنی تۆ پێش ئەوە بووە کە تۆ بزانی کەمن بەزۆر بەتۆی ئەکەم ڕێزگرتن لەئادەم . ئەمە لەلاییکەوە ، لەلایەکی ترەوە ئەگەر من بم ویستایە بەزۆر سوژدەت ببردایە فەرمانم پێ نەئەدای بەکردنی و ، سودێ لەو فەرماندانەی مندا نەئەبو ، کاری وایش لەئێمەوە دورە . کەواتە سزادانی ئێمە بۆ تۆ لەجێگای خۆیایەتی ، چونکە پێش هەموو شتێ خۆتت بەگەورە داناوە و بێ فەرمانی ئێمەتان کردوە .

تێبینی : جارێك شەیتان بەخزمەت پێغەمەر گەیشت (ﷺ) ووتی : خوا ناوی تۆی بردوە بەرێگە پیشاندەری ئادەمیزاد بۆ پەرستنی خودا و ، ناویشت نراوە بەرێگە پیشاندەری ڕاستەقینە و ، منیشی نێو بردوە بەرێگە تێك دەری مرۆڤ و بەرێگە لێ تێك چو ، ئەوانە زۆر ڕاستن . بەلاّم هەمویان نە بەدەستی تۆیە و ، نەبەدەستی منە ، هەمویان بەدەستی خوان .

پێغەمەر (ﷺ) فەرموی : هەرچەندە هەمو شتێ بەدەستی خوایە ، بەلاّم ئەو شتەی بەدەستی منە ڕوون کردنەوەی کاری پڕوپوچە بۆ دانیشتوان ، وە هەوڵدانە بۆ گێڕانەوەیان لەخراپە ، و هەڕەشەلێ کردنیانە بەسزای گران بۆ ئەوەی خوا بپەرستن و ، بەدەستی تۆیە فێلّ و

پیلان و دوو ڕویی و هاندانی دانیشتوان بۆ کردنی کاری خراپ و ناشایسته ، بەدەستی ئادادەمیزادە سەربەستی و توانا و جویَ کردنەوەی ڕاستی و ناڕاستی ، وەخـودا ئـەقلی پـیَ بەخشیون . کەواتە ئەتوانن ئەوەی چاکیَ بـۆ خۆیـانی هـەڵبژیَرن و ، ئـەو شـتەی خراپـە خۆیانی لیَ دوور بخەنەوە هەتا توشی سزا نەبن .

بیَگومان چونکە مرۆڤ ئەزانیَ ئاگر سوتیَنەرە دەستی بۆ نابا و خـۆی لیَ دوور ئەخاتـەوە چونکە ئەزانیَ ئەیسوتیَنیَ . کەواتە هەموو لایەکمان ئازادین بۆ کردنی هەموو شتیَ لـەچاك و لەخراپ .

بۆ ئاگاداری : جاریَ شەیتان چوو بۆ لای عیسا پیَغەمەر (ﷺ) و بەعیسای ووت: خۆ تـۆ ئەزانی تۆ خاوەنی ڕیَز و پلەی بەرزی ، کەواتـە لەسـەر ئـەو جیَگـە بـەرزە خـۆت بخـەرە خوارەوە ، بزانین خوا ڕزگارت ئەکا لەئازار ؟ عیسا فەرموی : شایستـەی خوایـە بـەندەی خۆی تاقی بکاتەوە . بەڵام نابیَ بەندەی خوا پەروەردگاری خۆی تاقی بکەنـەوە ، وە خـوا ئەقلی بەمن داوە ، ئەزانم ئەو بلّندایەتیە جیَگەی مەترسیە ، کەواتە خۆم بەرنادەمەوە و خۆم ناخەمە مەترسیەوە .

بۆ زانین : شەیتان چوو بۆ خزمەت نوح ، لەپاش خنکاندنی هەمو بیَ بـاوەڕان بـەلافاو و پاش وشك بونەوەی زەوی ، شەیتان ووتی : ئەی پیَغەمەری خوا : بەڕاستی تۆ چاکەیەکت بەسەر منەوەیە ئەمەویَ پاداشتی ئەو چاکەیەت بدەمەوە . نوح فەرموی : ئەگەر تۆ چاکەت بەسەر منەوە هەبیَ پیَویستە من داوای لیَبوردن لەخوابکەم .

شەیتان ووتی : تۆ پاڕایتەوە لە خوا کە خزمەکانت بنە بڕبن ، خوا نزاکەی وەرگرتـی و هەمویانی لەنیَو بردن و بنەبڕی کردن ، من بەر لەناوچونیان بەشەو و بەڕۆژ نەئەوەستام .بۆ ئەوەی لایاندەم لەڕیَگەی خواپەرستی ، چاکە لەوە چاکتر نیە کەمن لە خۆشی و پشودام .

نوح فەرموی : بەچ شتیَ تۆ پاداشتی من ئەدەیتەوە ؟ . شەیتان ووتی : مـن ئامۆژگـاریت ئەکەم هەرگیز توڕە نەبیت ، چونکە ئەو کەسە توڕە بیَ و ئالّۆز بیَ من ئەو کەسە ئەکـەم

بەژێر دەستەی خۆم و ، هەر کاتێ بویت بەکار بەدەست و فەرمان ڕەوا ئاگـاداری خـۆت بکە لەکاتێکدا ویستت فەرمان دەربکەیت و دابینی بکەیت بەسەر کەسێکاو بتەوێ ئـاژاوە نەیەڵی ، بێگومان بزانە من سێهەمین کەستانم ، هەوڵ ئەدەم لاتان بدەم لەداد پـەروەری ، لـە چۆڵەوانیدا هاوڕێتی ژنی بێگانە مەکە ، بەڕاستی وابزانە من هانتـان ئـەدەم بـۆ کردنـی کاری خراپ و داوێن پیسی کە خراپ ترین کاری بێزلێ کراوەن .

لەو باسانەی کـەڕابوردن بۆمـان دەردەکوێـت کـە شـەیتان بـەبێوچان لەکاردایـە بـۆ پەرەپێدانی جەنگ و پـەیدا کردنـی ئـاژاوە و نـاکۆکی و داوێـن پیسـی و ، لەهـەر لایـێ چەکێکی ئاگرینی دەست کەوێ کە هۆی بلاوکردنەوەی ڕەوشتی پیسێ شەیتان پیرۆزبایی لێ ئەکا .

تێبینی : ئامۆژگاری وەرگرتن و پەنا گرتن بەخوا سودی زۆری تێدایە بـۆ ئـادەمیزاد . و فێرمان ئەکا بەچ جۆرێ ڕوی خۆمان بکەین بۆلای خوای خۆمان ، بۆ ئـەوەی فـێری ئـەو کارە بەڕێزە ببین ، ئەبینرێ ئەگەر کەسێ بیەوێ بڕوا بۆلای مرۆڤێکی گەورە یا دۆسـتێکی خۆی پێویستە بەبێ شەرمانە نەڕواو لەپێشـەوە تەقـەبدا لـەدەرگای خانوەکـەی و ، داوای چونە ژورەوە بکا و چاوەڕوانی وەلامبێ ، ئەگەر وەلامی چونـە ژورەوەی وەرگـرت ئـەو کاتە بڕواتە ژورەوە بۆلایان . کەواتە ئەگەر ئێمە ویستمان قورئان بخوێنین مانای وایـە ئێمـە فەرمودەی خوا ئەخوێنین و لە خوا ئەپاڕێینەوە ، پێویستە پێشەکی زمانی خۆمان لە ووتـەی نارەواکاری خراپ پاك بکەینەوە بەهۆی پەناگرتن لەشەیتان بەیاریدەی خودا .

زانایانی ئاینی ئەڵێن : پـەناگرتن بـەهۆی خـواوە لەشـەیتان ئەبێتـە هـۆی نزیـك بونـەوە لەمیهرەبانی خوا ، ئەبێتە هـۆی ترسـان لـەخوا ، ئەبێتـە هـۆی لادانـی مـرۆڤ لـەگوناه، بنچینەی دۆزینەوەی ڕێگەی ڕاستە ، ئەبێتە هـۆی گەڕانـەوەی تاوانبـاران بـۆ لای خـوای خۆیان ، پەناگرتن بەهۆی خواوە لەشەیتان ئەبێت بەهۆی بەختیاری و خۆشی ، ئەبێتە هۆی

بەدەست هێنانی توێش و سامان بۆ هەژارانی کەم چاکە لــەڕۆژی دواییــدا ، ئەبێتــە هــۆی دوور خستنەوەی مرۆڤ لە خراپە و کردەوەی ناهەموار .

بەو باسانەی ڕابوردن بۆمان ڕوون ئەبێتەوە کەکاتێ دەستمان کرد بەهەرشتێ واچاکە ئەو ڕستەیە لەبیر نەکەین و پەناگرین لەشەیتان : لــەکاتی هەڵسـان و دانیشـتن و ڕۆیشـتن و هەموو کردەوەمانا ئەو ڕستەیەش بریتیە لە ﴿ أعوذ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطانِ الرَّجيمِ ﴾ .

## ﴿ بەشی چوارەم : باسی ژمارەی سورەتەکان و ئایەتەکان و پیتەکانی قورئانی پیرۆز و ماناى سورەت و ئايەت ئەكا ﴾

ژمارەی سورەتەکانی قورئان (١١٤) سەدو چواردە سورەتن ، یە سورەتی فاتیحە دەست پێ ئەکات، بەسورەتی ﴿ النّاس ﴾ کۆتایی پێ دێ.

تێبینی : نامەی پیرۆزی خوا بەپیتی (ب) بێ دەست پێ‌ئەکا وەبەپیتی (س) سین کۆتایی پێ‌دێ ، لەو دوو پیتەدا نهێنیەکی زۆر گەورە و پڕ مانا هەیە کەبەزمانی عەرەبی ڕستەی ﴿ بسك ﴾ واتە ﴿ حسبك ﴾ یانی تۆ موحەمەد بەستە ئەو شتەی لەنێوان ئەو دوو پیتــەدان کە هەموو قورئانی پیرۆزە .

* ووشەی ﴿ سورة ﴾ بەزۆر مانا هاتوە ، هەموو ماناکانی شایستەی ئەوەن بکرێـن بـەناو بۆ بەشێکی دیاری کراوی قورئانی پیرۆز . ﴿ سورة ﴾ لەزمانی عەرەبیدا بــەمانای بــەرزی هاتوە ، بەناو بۆ جێگەیەکی جوان لــەخانوێکا بریتیبێ لەچــەند بەشـێ، هیـچ بەشـێکیان بەبەشەکەی تریانەوە نەنوسابێ و لەیەك پچڕابن ، بەمانای شورا و سنوریش هاتووە یانێ ئەو کۆمەڵە دیاری کراوە لەقورئانی پیرۆزدا کە ناویان نراوە بە سورەت بەرزن لە پلە و پایەدا جوانن و لەیەك پچڕاون ، وێنەی شورا و سنوری شـارێکن کەهــەموو لاکـانی قورئاننیـان گرتوەتەوە.

*کەمترین سورەت لە قورئانی پیرۆزدا بریتیە لە سێ ئایەت ، ژمارەی ئایەتەکانی قورئان لە﴿٦٣٣٦﴾ شەش هەزار و سێ سەد و سی و شەش ئایەتن ، بەدابین کردنی ڕستەی ﴿ بِسْمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحيم ﴾بەئایەتێ لە پێش هەموو سورەتێکەوە جگە لە سورەتی ﴿ التوبة ﴾ کەژمارەی ئەو سورەتانەی ئەو ڕستانەیان لەپێشەوەیە ﴿ ١١٣﴾ سەد و سیانزە سورەتن .

*﴿ آية ﴾ بە دوو مانا هاتوە : هاتوە بەمانای نیشانە ، بەو مانایەش یانێ نیشانەیە لەسەر ڕاستی بخوێنەکەی و نیشانەیە لەبۆ کۆتایی هاتنی ئایەتێك و سەرەتای ئایەتی تر ، وەهەر یەکەیان بەشێکن لە قورئانی پیرۆز . وەژمارەی ووشەکانی قورئانی پیرۆز ﴿ ٧٧٩٣٤﴾ حەفتاوحەوت هەزار و نۆ سەد و سی و چوار ووشەن .

ژمارەی پیتەکانی قورئان ﴿ ١٠٢٧٠٠٠﴾ یەك ملیۆن و بیست و حەوت هەزار پیتن .

لەخوا داواکارم یارمەتی هەموو لایەکمان بدا لەسەر پەرستنی خۆی .

نووسەر : مەلا سعید فتح الله زمناکۆیی

## ﴿ سورەتی ئەلفاتیحە ﴾

ئەوەی جێگەی متمانە بێ ئەم سورەتە لەمەکە هاتوەتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەر (ﷺ) و هەندێ لەزانایان ئەڵێن : دوو جار هاتوەتە خوارەوە : جارێ لەمەکە ، وە جارێکی تر لە مەدینە . ژمارەی ئایەتەکان (٧) حەوت ئایەتن . ئەم سورەتە زۆرتر لە (٢١) بیست و یەك ناوی هەیە ، بەڵام بەناوبانگترینیان ﴿١٢﴾ دوانزە ناون ، وەك ئەمانەی خوارەوە :

١) (الفاتحة) یانێ لەم سورەتەوە دەست ئەکرێ بەخوێندنی قورئانی پیرۆز و لەم سورەتەوە دەست ئەکرێ بەنوسینەوەی قورئانی پیرۆز . بۆزانین پێویستە ئەم سورەتە لە هەموو ڕکاتیکانی نوێژدا بخوێنرێ لەلای پێشەوا شافیعی ، و بەلای پێشەوا حەنەفیەوە واچاکە بخوێنرێ لەهەموو ڕکاتێکا بەنهێنی بەمەرجێ نوێژ بەکۆمەل واتە ﴿ جەماعەت ﴾ نەکرێ ، ئەو کاتە جگەی لەپێش نوێژ نابێ بخوێنرێ لەلایەن نوێژکەرانی ترەوە ، پێش نوێژکەر واچاکە فاتیحە بخوێنێ و ئەیشتوانێ جگەی ئەویش بخوێنێ . بەکورتی ئەم سورەتە پێشەوای خوێندن و نوسین و هەموو کارێکی چاکە ، وەهەر شتێ ئەگەر ئایەتی یەکەمی ئەو سورەتەی بۆ نەوترێ لەسەرەتاوە بێ فەڕو بێ پیت ئەبێ .

٢) (أم الكتاب) یانێ وەك بنچینە و دایك وایە بۆ نامەی خوا کە قورئانە ، سەرچاوەیە بۆ ئەو نامەیە .

٣) (الحمد) واتە ووشەی (الحمد) لەنێو ئەم سورەتەدایە سەرەتا و یەکەم ئایەتی ئەم سورەتەیە ئەگەر ﴿ بِسْمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحيم ﴾ یەکەم ئایەت نەبێ ، بۆیە نێو نراوە بەم ووشەیە .

٤) (السّبع الثاني ) واتە ژمارەی ئایەتەکانی (٧) حەوت ئایەتە ، و لەهەموو ڕکاتەکانی نوێژدا دووپات ئەکرێتەوە ، دوو جاریش هاتوەتە خوارەوە بۆسەر پێغەمبەر (ﷺ).

٥) ( الكافية ) یانێ ئەم سورەتە بەسە بۆ هەموو شتێ ، وە پێویستی بەشتی تر نیە ، وە هەموو شتێ پێویستی بەم سورەتە هەیە و بەم تەواو ئەبێ .

٦) ( الأساس ) یانێ ئەم سورەتە بنچینەیە و بنەمایە بۆ هەموو شتێ لـەکاروباری ئـایندا ، بنچینەشە بۆ یاد و پەرستنی خودا .

٧) ( الوافیة ) واتە پێویستە لە هەموو ڕکاتەکانی نوێژدا بخوێنرێ بەتەواوی ، ئەم سورەتە تەواوکەری نوێژەکانە .

٨) ( الّشفاء ) هۆی ڕزگار کردن و لابردنــی نەخۆشـی دەرونی ئـادەمیزاد و نەخۆشـی مرۆڤە .

٩) ( الصلاة ) ئەم ناوە لەفەرمودەیەکی پێغەمەرەوە هاتوە کە موسلیمی کـوڕی حـەجاج ئەیگێڕێتەوە کە پێغەمەر (ﷺ) فەرموی : خوا نوێژی بەش کـردوە لـە نێـوان خـۆی و بەندەکانیدا ، یانێ بەندەی خوا لە نوێژدا ئەڵێ ﴿ اَلْحَمْدُ للّهِ رَبّ الْعالَمِين ﴾ خـوا ئەفەرموێ بەندەی من سوپاسی منی بەجێ هێنـا ، وەبـەندەی خـوا ووتـی ﴿ الرَّحْمـنِ الرَّحيم ﴾ خوا ئەفەرموێ بەندەی من ستایشی منی بـەجێ هێنـا ، بـەندەی خـودا کـە ووتی ﴿ مالِكِ يَوْمِ الدّينِ ﴾ خوا ئەفەرموێ: لەوەلاّمدا بەندەی مـن منـی بـەخاوەنی ڕۆژی ئایین داناوە ، بەندەی خوا ووتــی : ﴿ إيَّـاكَ نَعْبُـدُ وَإيـاكَ نَسـتَعِينُ ﴾ خـودا ئەفەرموێ ئەو ڕستانە بەش کراوە لەنێوان من و بەندەی مندا ، داوای هــەر شـتێکم لێ بکا بەوی ئەبەخشم ، بەندەی خوا کە ووتی : ﴿ إهدِنا الصِراطَ الْمُسْـتَقيمَ صِـراطَ الَّذينَ أنْعَمتَ عَلَيهِمْ غيرْ المَغضـوُبِ عَلَيـهِمْ وَلا الضّـالّينَ ﴾ خـودا ئەفـەرموێ : ئەوپاڕانەوە و نزایانەم لێ وەرگرتی کەمافی بەندەی منە ، هەر شتێکم لێ داوا بکا پـێ ی ئەبەخشم .

١٠) ( السؤال ) یانێ هەر بەندەیەکی من پرسیاری هــەر شـتێکم لێ بکـا و زمـانی خـۆی بەیادی من پاراو بکاتەوە من وەلاّمی ئەدەمەوە و پێ ی ئەبەخشم .

١١) ( الدعاء ) یانێ لەم سورەتەدا دانراوە پاڕانەوەی لە خوا تێدایە بەهۆی ڕستە ﴿إِهدِنا السِراطَ المُستَقيمَ ﴾ تا کۆتایی سورەتەکە .

١٢) ( الشکر ) یانێ سوپاس و ستایش کردن و ڕێز گرتنی خوا لەم سورەتەدایە بێ کەم و کوڕی .

﴿ باسی گەورەیی سورەتی ئەلفاتیحە ﴾

فەرمودەی پێغەمەر (ﷺ) لەبارەی گەورەیی ئەم سورەتەوە زۆرن . بەناوبانگترین ئەوفەرمودەیە ئەمەیە : حوزەیفەی کوڕی یەمان ئەڵێ : پێغەمەر (ﷺ) ئەفەرموێ : خوای گەورە ویستوێتی سزای کۆمەڵێ لەئادەمیزاد بدا بەهۆی نالەباری و خراپەیانەوە لەجیهاندا ، خوای گەورە ئەو سزایەی بە هۆی منالێك کە سورەتی فاتیحەی دەخوێند لە قوتابخانەیەکدا ، ئەو سزایەی دوور خستەوە بۆ ماوەی چل ساڵ .

تێبینی : لە نمونەی گەورەیی سورەتی فاتیحەیە ، موسوڵمانان لانی کەم (١٧) جار لەماوەی شەو و ڕۆژێکدا لەنوێژدا ئەی خوێنن چونکە خوا پێویستی کردووە لەسەریان .

ئەگەر موسوڵمانان بیانەوێ نوێژی سوونەت بکەن لەپێش و پاشی نوێژە پێویستەکان (٤٤) چل و چوار جار سورەتی فاتیحە دەخوێنن ، ئەگەر نوێژی زۆر تریش بکەن سورەتی فاتیحە زۆرتر ئەخوێنرێ .

بۆزانین : هیچ نوێژێ بەبێ سورەتی فاتیحە لەهەموو ڕکاتێکی نوێژدا دروست نیە لای پێشەوا شافیعی ، بوخاری و موسلیم ئەڵێن : پێغەمەر (ﷺ) ئەفەرموێ : نوێژی ئەوکەسانە دروست نیە سورەتی فاتیحە ناخوێنن لەهەموو ڕکاتەکانی نوێژەکانیانا .

بۆ ئاگاداری : سورەتی فاتیحە هاتۆتە خوارەوە کە بخوێنرێ لە هەموو ڕوێکەوە ، ئێمە فێر ئەکا چۆن فەڕ و پیرۆزی وەرگرین لەناوی خوای گەورە لەکاتی کردنی هەموو کارێکا ، وە ئەم سورەتە فێرمان ئەکا بەچ جۆرێ سوپاس و ستایشی خوا بکەین، چۆن داوای یارمەتی لە خوا بکەین ، خوا بەئادەمیزاد دەفەرموێ : کاتێ دەستتان کرد بە هەموو

کارێ بلێن : ﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحيم ﴾ ئەم ڕستەیە پیرۆزە ئایەتێکە لەپێش هەموو سورەتەکانی قورئاندا دانراوە ، ئەو ڕستەیە کە (١١٣) سەدو سیانزە ئایەتە لەپێشەوەی (١١٣) سورەتی قورئانی پیرۆزدا هەیە جگە لە سورەتی ﴿ التوبە﴾ ، لەلای پێشەوا شافیعی و زۆربەی زانایانی قورئان ناس لەگەڵ ئەم بۆچونەدان ، بەلاّم هەندێ زانایان پێیان وایە ڕستەی ﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحيم ﴾ (١) یەك ئایەتە لەهەموو قورئاندا ، وەجێگەی تایبەتی بۆ دیاری نەکراوە هەندێ تر لەزانایان لایان وایە ئەو ڕستەیە ئەبێژرێ لەکاتی کردنی هەموو کارێکدا بۆ مفەرك و پیرۆزی و ئایەتێ نیە لەقورئان .

بۆ زانین : ئەو ڕستە پیرۆزە بەدروشمی تایبەتی موسولمانان دائەنرێ ئەوترێ لەپێش هەموو کار و وتارو نامەیەکیان دا. بەلاّم جگەی موسولمانان ئەو ڕستەیە بەکار ناهێنن ، لەکاتی کردنی کاریان و لەپێش نامەکانیانەوە ئەلێن :﴿باسمِكَ اللّهُمّ﴾ ﴿ بِاسمِهِ تَعالى ﴾ ﴿باسمِ المُبدِئ المُعيد ﴾ ﴿ بِاسمِ الأَب وَالأِبنْ وَروُحِ القُدُس ﴾ ﴿باسمِ اللاّتِ وَالْعُزّى﴾ هەتادێ . هەندێ ئادەمیزادی گێل و گەوجیش ناوی هەندێ ئادەمیزاد بەکار ئەهێنن . خوا پەنامان بدا .

پوختەی مانای ئەو ڕستەیە ئەمەیە : دەست ئەکەم بەم کارە بەهۆی ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ، پێویستە لەسەر موسولمانان لە هەموو کار و کردەوەیەکیان بەناوی خوای گەورەی پەروەردگاری هەموو بونەوەران دەست پێ بکەن. نەك بەناوی جگەی خواوە . ئەبێژرێ بەناوی خاوەن شکۆوە یان بەناوی گەلەوە ، یابەناوی میرەوە ، یابەناوی مامۆستاوە یا بەناوی فلاّن کەسەوە دەست بەم کارە ئەکەین ، هەتادێ . ئەوانە چاك نین .

بۆ ئاگاداری : پێویستە ئەو کارەی ﴿ بِسْمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحيم ﴾ی بۆ ئەبێژرێ ئەبێ کارێکی گونجاو بێ لەگەڵ ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا بگونجێ و قەدەغەنەبێ ، ئەگەر نەگونجاو و قەدەغەبێ ئەوا دوو جار گوناهە : جارێ بەکردنی ئەو کارە ناڕەوایە ،جارێکی تر بەووتنی ئەو ڕستەیە کەوەك ئەوەیە گاڵتەی پێ بکرێ ، گاڵتەکردنیش بەفەرمودەی خوا

بێ باوەڕیە . واتە وێنەی ئەوەیە لەکاتی مەی خواردن و هەموو کارێکی تری قەدەغە کـراو ئەو ڕستەیە ببێژرێ .

﴿ خوای پەروەردگار لە گوناهی خۆم و باوکم و دایکم و هاوسەرم و منالّەکانم خۆشبە﴾

## سورەتی ﴿ ئەلفاتیحە ﴾

وەك لەمەو بەر باسمان کرد لەمەکە هاتوەتە خـوارەوە ، هـەندێ لـەزانایان ئـەڵێن: دوو جار هاتوەتە خوارەوە : جارێ لەمەکە ، جارێ لەمەدینە . ژمارەی ئایەتەکانی (٧) حەوت ئایەتن .

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿١﴾
ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢﴾
ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣﴾ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٤﴾
إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴿٥﴾ ٱهْدِنَا
ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿٦﴾ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ
عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ
وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧﴾

﴿ بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحيم ﴾

به ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان دەست ئەکەم بە خوێندنی قورئان کە بەخشندەیە بۆ هەموو بونەوەران لە جیهاندا بـۆ سـوودی ئـەوان و ژیـان و گوزەرانیـان لـە بەخشراوە گەورەکان وەك دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی و خۆر و مانگ و ئاو و خواردەمەنی و بەخشینی تەندروستی و ئـەقڵ و هەسـت و هـۆش ، میهرەبانـە بـۆ بونـەوەران کـەپێ‌ی بەخشیون بەخشراوە ووردەکان وێنەی ڕەنگی شیاو بۆ چاوەکانیـان و ئـەندامانی تریـان ، دروست کردنی هەموو ئەندامەکانیان بەشێوەیەك بگونجێت لەگەڵ یەکتری بەبێ ناشیرینی ، بەتایبەتی نوساندنی برژانگ بەپێڵوی چاوەکانیـان بـۆ بـەرگری کردنـی تـۆز و خـەوش و گەیاندن بەنێو بۆشایی چاوەکانیانەوە ڕوناکی بۆ تۆڕی چاو هەتا شتی پێ ببینێ و لەوێشەوە

بۆ مێشك ، دووبارە بەخشینی بەهەشت بەموسوڵمانان و لێبوردنیان لە گوناهەکانیان ، فێر کردنی هەموو بونەوەران بەجۆر و شێوەی پەیداکردنی خواردەمەنی بۆ ژیان و گوزەرانیان و پاراستنی خۆیان لە گێژاوی جیهان بەهۆی ئەو هەستە تایبەتی‌یە جۆراو جۆرەی خوا پێی بەخشیون ، زۆر شتی تری پیێ بەخشیون کەلە تواناادا نیە بژمێرین .

﴿ چەند نمونەیەك لەمیهرەبانی خوا بۆ هەندێ لەبونەوەران ﴾

١- فێرکردنی مێش هەنگ بۆ پەیدا کردنی خواردەمەنی بۆ خۆیان : خوای گەورە هەستێکی وای داوەتێ ئەزانن گوڵەکان سەر لەبەیانی و بەر لەخۆر کەوتن دەم ئەکەنەوە ، بۆیە لەو کاتەدا ئەچنە دەرەوە بۆ مژینی شیرینی و شیلەی ئەو گوڵانە ، دوایی ئەگەڕێنەوە بۆ نێو جێگەکانی خۆیان و نێو شانەکانیان ، ئەو شیلەیە لەنێو شانەکانیان دائەنێن، بۆ دروست کردنی هەنگوین بۆ خواردەمەنی خۆیان و ئادەمیزاد ، فێری کردوون شانەیەکی شەش سوچی بەمێو سواغ دراو بۆ جێگەی هەنگوینەکەیان بنەخشێنن .

لەو باسانەی ئێمە نوسیمان میهرەبانی خوامان بۆ ڕوون ئەبێتەوە و بەرانبەر بەمێش هەنگ کەلەپاش خۆرکەوتن ناچنە دەرەوە و لەشوێنەکانی خۆیاندا کڕ هەڵدێن ، چونکە هەست ئەکەن کە گوڵەکان پاش خۆر کەوتن ئەپوکێنەوە .

لەگەشتی مێش هەنگدا میهرەبانی خوا بۆ ئادەمیزاد دەرئەکەوێ ، چونکە لەکاتی گەڕانی مێش هەنگەکان بەسەر گوڵەکاندا تۆوی مێینەو نێرینە لەسەر گوڵەکان هەڵئەگرێ و بەیەکەوە ئەیان نوسێنێ و ڕوەکەکانی پێ موتوربە ئەبێ و ، ئەبێتە هۆی بەرگرتن بۆ درەختەکان و پەیدابونی میوەی خۆش و بەرهەم بۆ سوودی ئادەمیزاد و ، پێویستە بزانین چ کەسێکە جگەی خوای گەورە ئەو هەستانەێ بەخشیبێ بە مێش هەنگ ؟

٢- میهرەبانی خوا لەگەڵ مێروولە : خوای گەورە گیاندارێکی دروست کردووە بەزمانی فەڕەنسی پیێ ئەوترێ ( ئەفس ) مێرولە لەگەڵیان ئەکەونە جەنگەوە بەسەریانا زاڵ ئەبن و ئەیان گرن و بەخێویان ئەکەن لە جێگەیەکی تایبەتیدا و ئەیان لەوەڕێنن لەنێو گوڵدا و ،

ئەو گیاندارە پاش تێر خواردن شیرێکیان لێ پەیدا ئەبێ و مێرولەکان ئەیان مژن ئەمە لەلایەکەوە ، لەلایە ترەوە مێرولە شارێکی وا دروست ئەکەن زاناترین ئەندازیار ناتوانن نەخشەی بکێشن ، مێرولە ڕێگەی تایبەتیان هەیە لەم شارەوە بۆ ئەو شار بۆ گۆڕینەوەی بازرگانی .

٣- میهرەبانی خوا لەگەڵ جاڵ جالۆکە ، خوای گەورە بەجۆرێکی سەرسوڕێنەر جۆلایی کەرەی فێری چنینی چاتۆلەکەی خۆی کردووە ، ئامادەی کردوە بەکاری ئەهێنێ بۆ حەسانەوەی خۆی و ، بەکاریشی ئەهێنی بۆ بەدەست هێنانی خواردەمەنی خۆی و ، بەجۆرێ ئەو چاتۆلەی دروست کردوە لەوکارەدا سەرکەوتوە بەسەر هەموو ئادەمیزاد و ئەندازیاراندا ، چونکە مامۆستای جۆلایی کەرە خوای گەورەیە مامۆستای ئادەمیزاد خۆیانن بەو ئەقڵەی خوا پێی بەخشیون . بۆنمونە ئەندازیارانی ئادەمیزاد زۆر جار تووشی هەڵە ئەبن لەدروستکردنی کۆشك و تەلارەکاند ، بەڵام جاڵ جالۆکە لەکردەوەی خۆیا توشی هەڵە نابێ ، لەبەر ئەوەی خانوی جۆلای کەرە لاوازترین خانوون خوا فێری کردوون و ئەگەڕێن بەدوای شیلەمەنییەکی تایبەتیدا لەسەر درەخت و جێگەی تردا کەبەهۆی ئەو شیلەیەوە دەزولەی چاتۆلەکەی خۆیان ئەنوسێنن بەیەکەوە و بەدار و درەختی ترەوە ، بەوبۆنەوە لە باو گەردەلول پارێزراو ئەبن ، هەرکاتێ مێش و مەگەز بڕۆن بەلای هێلانەکەیاندا ئەیگرن و ئەیکەنە نێچیری خۆیان و ئەی خۆن . بۆ ئەوەی باشتر میهرەبانی خوامان بۆ دەرکەوێ پێویستە ئێمەی ئادەمیزاد تەماشای ئەو شیلەیە بکەین چۆن خانوەکە ئەپارێزێ لەدڕین لەکاتی هەڵکردنی ڕەشەبادا کە زۆر جاران ئەبینرێ دار و درەخت لەرگەوە دەر ئەهێنێ و خانوی مەحکەم ئەڕوخێنێ کەچی چاتۆلی جۆلایی کەرە نادڕێ و بەدرەختەکانەوە ماونەتەوە .

هەربەو شێوەیە خوای گەورە ئەو گیاندارانەی فێری ئەوکارە سەرسوڕێنەرانە کردوە .

دووبارە خوا خستویّتیە دلّی پێغەمەران و سروشی ﴿ واتە وەحی ﴾ بۆ ناردوون کە بەندەکانی خوا بەچ جۆرێ فەرو پیرۆزی وەرگرن بەر لەوەی دەست بکەن بەکاری خۆیان لەخوێندن و خواردن و نوسیندا بەو بۆنەوە بیر لە میهرەبانی و پەیرەو کردنی خوابکەنەوە ، بەنیازی دلّی پاك ، دلّی بەندەکانی خوا پڕ ئەبن لەمیهرەبانی و بەزەیی خوا و ، بە موژدە دانی خوا بەچاکەی خوا لەگەلّیان دلّخۆش ئەبن . مێشکیان پڕ ئەبێ لە میهرەبانی خوا ، چاو و دەمیان ئەکرێتەوە بۆ سوپاسی خوا و خوانی خانەدانی بێ وێنەی خوا و چاریان نامێنێ و بەهەمو ئەندامیانەوە هاوار ئەکەن و ئەلّێن :

﴿ اَلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعالَمِينَ ﴾

هەموو سوپاسێ بۆ خوای پەروەردگاری هەموو بونەوەرانە ، هەرشتێك دروستبێ و شایستەبێ سوپاسی لەسەر بکرێ سەرچاوەکەی لەخوای پەروەردگارەوە پەیدا بووە ، هەر بۆلای ئەو ئەگەرێتەوە . هەموو سوپاس و ستایشێ لەهەر کەسێکەوە بکرێ ، بۆ هەرکەسێ بکرێ ، بەهەر شتێ بکرێ هەمویان هەر بۆ خوایە و شایستەی کەسی تر نیە .

بۆ زانین : هەرچەندە هەرکەسێ چاکەی لەگەلّ بکرێ سوپاسی چاکەکەرەکە ئەکا ، بۆ نمونە کوڕ سوپاسی باوکی خۆی ئەکا ، مرۆڤی لاواز و بێ هێز سوپاسی پالّەوان و خاوەن هێز ئەکا ، گەلان سوپاسی کاربەدەستان و کەسانێ ئەکەن کە ڕزگاری کردوون لەستەمی بێگانەکان باوەڕداران سوپاسی پێغەمەران و زانایانی خۆیان ئەکەن کەڕزگاریان کردوون لەبێ باوەڕی و فێری فەرمان و دەستوری خوایان کردوون ، بەلاّم سوپاس و ستایش پێویستە بۆ کەسێ بکرێ شایستەی ئەو سوپاسە بێ ، کەسێك بێ هیچ جۆرە ناتەواوی ڕوی تێ نەکاو برسێتیو نەخۆشی و مردن ڕوی تێ نەکا ، ئەو کەسەیش هەر خوایە ، خوای پەروەردگاری هەموو بونەوەران ، کەواتە ئەو سوپاسە بەهەر زمانێ بکرێ لەبەر هەرشتێ بکرێ ، بۆ هەر کەسێ بکرێ هەر شایستەی خوایە بەتەنها .

بۆ ئاگاداری : موسوڵمانان خوای گەورە فەرمانی پێ داون ڕوی خۆیان وەرگێڕن بۆلای خوا بەتەنها ، واز لەستایشی پاشاکان و مل کەچ کردنی کاربەدەستان و پیرانی تەریقەت و زانایان بهێنن گەر دژی یاسای ئیسلام بن . خۆیان ڕزگار بکەن لە گۆڕستان و درخت پەرستن ، کۆت و پێوەن و مل شۆڕی و بەندایەتی و کۆیلەیی جگەی خوا تەفر و تونا بکەن خۆیان ڕابهێنن بۆ پەیدا کردنی خۆشی و ئازادی و سەربەستی و ژیری بۆ ئەوەی جگەی خوا نەپەرستن و لەکەس نەترسن جگەی خوا . جێگەی سەر سوڕمانە و دوو ڕوییە هەندێ کەس ئەڵێن : ئێمە خوا ئەپەرستین کەچی زۆر شت ئەکەن بەهاوبەشی خوا و ئەڵێن : ئەو کەسانە لە خوا نزیکمان ئەخەنەوە ، چونکە ئەو کەسانە خۆشەویستی خوان ، خۆیان کەڕ و کوێر و گێل ئەکەن لەئاستی فەرمودەی خوای گەورە لەئایەتی ﴿٣﴾ ی سورەتی ﴿ الزمر ﴾ دا ئەفەرموێ ﴿ ألا لِلّهِ الدّينُ الْخالِصُ وَالَّذينَ اتَّخَذُوا مِنْ دونِهِ أولياءَ ما نَعبدُهُم إلاّ لِيُقَرِبُونا إلى اللهِ زُلْفى ﴾ یانێ ئەی ئادەمیزاد ئاگاداربن ئاینی پاك و پوختەو دوور لەهاوبەشدانان بۆ خوایە پێویستە شتێ دژی ئاین بێ نابێ تێکەڵاوی بکرێ ، کەسانێکی ئەوتۆهەن جگەی لەخوا چەند دۆستێ ئەگرن و ئەڵێن: ئەو دۆستانە ناپەرستین بەڵکو تەنها بۆ ئەوەیە نزیکمان بکەنەوە لە خوا بە نزیکبونەوەیەکی چاك .

ئەو دۆستانەیش وێنەی ﴿ عیسا ﴾ درودی خوای لێبێ .

تێبینی لەم کات و سەردەمەی ئێمەدا ئەو جۆرە بیانوانە بەکار ئەهێنن . کەواتە پێویستە ئەو جۆرە کارانە لەبیری خۆمان ببەینەوە و جگە لەخوا داوای هیچ چاکەیەك لەکەس نەکەین . بێگومان هەموو شتێ لای خواوە دێ ، هەر خوایش بەخێوکەرمانە بەگشتی ، ئیتر پاشا بین یان گەدا ساماندار بین یان هەژار ، زانا بین یان نەخوێندەوار .

موسوڵمانە بەراییەکان هەموو شتێکیان لە خواوە ئەناسی هەموو شتێکیان لەخوداوە ئەکرد ، بۆیە توانیان بەو بیرو باوەڕە گەورەیەوە لەماوەیەکی زۆر کەمدا ببنە پێشەوای هەموو ئادەمیزاد . گەورەترین بەڵگە بۆ ڕاستی ئەو مەبەستە ئەو گفتو گۆ و ڕاوێژەیە

لەنێوان ( زەهرە ) ی فروستادەی موسولمانان و باوەڕداران و لەنێوان پێشەوای فارسەکان ڕۆستەمدا ڕوی دا ، ( زەهرە ) بە ڕۆستەم ی ووت: ئێمە نەهاتوین بۆ لای ئێوە بۆ پەیدا کردنی سامانی جیهان بەڵکو ئاواتی ئێمە پاداشتی ڕۆژی دواییە ، ڕۆستەم ووتی : ئاینی ئیسلام چ شتێکە ؟ (زەهرە ) ووتی : ﴿ أشْهَدُ أنْ لا إلـهَ إلاّ اللهُ وَأنَّ مُحَمَّداً رَّسُولُ اللهِ ﴾ واتە من بەزمان ئەڵێم و بەدڵ بڕوام هەیە کەهیچ پەرستراوی ڕاست نیە جگەلە خوا ، بەڕاستی موحەمەد فردۆستادەی خوایە ، ڕۆستەم ووتی چی ترە ؟ ( زەهرە ) ووتی : ڕزگار کردنی بەندەکانی خوا لەپەرستنی ئادەمیزاد بۆ لای پەرستنی خوا بەتەنها . چونکە ئادەمیزاد هەمویان کوڕو نەوەی ئادەم و حەوان . ڕۆستەم ووتی : ئەوەی تۆ ووتت زۆر شیرین و سەرسوڕهێنەرە !! ، پاش ئەو ووتو وێژە ڕۆستەم تاقمەکەی خۆی بانگ کرد و ئەو شتانەی بۆ گێڕانەوە ، ئەوانیش زۆریان پێ ناخۆش بوو بەووتەی ڕۆستەم ڕازی نەبوون ، لەپاشا داوایان کرد لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس مرۆڤیکی تر گفتو گۆیان لەگەڵ بکا ، سەعدیش ڕەبعەی کوڕی عامیری نارد بۆ لایان ، کاتێ ڕەبعە گەیشتە لایان ئەسپەکەی خۆی بەسەر ئەو هەورێشمە دابرد کە ڕایان خستبو لەجێگەی دانیشتنی ڕۆستەمدا ، لە گفتو گۆیا بەڕۆستەم و تاقمەکەی ووت: بەڕاستی خوا ئێمەی ناردووە بۆ ئەوەی کەسێ لەناخۆشی جیهانەوە ببەین بۆ لای خۆشی هەردوو جیهان ، وەلەستەمی ئاینەکان بۆلای دادپەروەری ئاینی ئیسلام ، ڕۆستەم بە گفتوگۆی ڕەبعە خۆشحاڵ بوو وە بەنهێنی کۆبونەوەی لەگەڵ تاقمێ لە پیاوانی خۆی کرد، لەوەڵامدا ووتیان پەنا ئەگرین بەخوا لەوەی ئێمە ئارەزومان لەئاینی ئەم کەسە بێ ، ڕۆستەم بەتاقمەکەی خۆی ووت : ووتەی بەڕێز و بەنرخترتان لەو ووتەیە نەبیستوە .

لەپاشا سەعد بۆ جاری سێهەم موغەیرەی کوڕی شەعبەی نارد بۆ لایان ، موغەیرە لەگەڵ ڕۆستەم لەسەر کورسی ڕۆستەم بەیەکەوە دانیشتن ، فارسەکان موغەیرەیان هێنایە خوارەوە ، موغەیرە ووتی : من کەسێکم لە ئێوە بێ ئەقڵتر نەدیوە ، بەڕاستی ئێمەی

موسوڵمانان خۆمان ناکەین بەبەندەی هیچ کەسێ ، ئەو جۆرە کارەی لەنێو ئێوەدا ناچێتە سەر هەتاهەتایە چونکە من ئێوە وائەبینم هەندێکتان خۆتان بەپەروەردەکەر و خوای ئەوانی ترتان دائەنێن .

لەو باسانەی سەرەوەدا بۆمان دەرئەکەوێ کەسوپاسی خوا بنچینەی گرنگی یاسای ئیسلامە ، ئەوەشمان بۆ ڕوون ئەبێتەوە بەچ ووشەیە و ، بەچ جۆرێ سوپاسی خوا بکەین . واتە ئێمە ئەبێ بلێین : ﴿ اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعالَمِينَ ﴾ هەموو سوپاسێ بۆ خوای پەروەردگاری هەموو بونەوەران کە هەمومانی بەجوانترین شێوە خولقاندووە، لەمناڵێکی ساواوە ئەمانکاتە کەسێکی گەورە، لەدڵۆپێ ئاوەوە بۆ مرۆڤێکی خاوەن ئەقڵ ، دەنکێ دانەوێڵەوە ئەکابە درەختێکی بەرزی میوەدار ، نەخوێندەوارێ ئەکاتە زانایەکی بەنرخ و پسپۆڕ ، هەژارێك ئەکاتە خاوەن سەروەت و سامان و تادوایی ،ئەو بونەوەرانەش کە خوا پەروەردگاریانە . ئەکرێن بەدوو بەشەوە :

١- بونەورانی لای سەرەوە : وێنەی ئاسمانەکان و ئەو شتانەی ئاسمانەکانیان ئاوەدان کردۆتەوە .

٢- بونەوەرانی لای خوارەوە : وەك زەوی و دانیشتوانی سەر زەوی لەگەڵ گیاندارەکان و بێ گیانەکان ، هەردوو لایشیان خوا پەروەردەی کردون و بەخێوی کردون و بەخێویان ئەکا .

﴿ اَلرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ ﴾

مانای ئەم دوو وشەیە زانراوە ، بەڵام ئەوەی پێویستە زیاتر ڕوون بکرێتەوە ئەوەیە بۆچی ئەو ووشانە دووپات کراوەتەوە ؟ لەوەڵامدا ئەڵێین بەخێوکردنی بونەوەران مانای بەخشندەیی و میهرەبانی خوایە بەتەنها ، لەبەر ئەوەنیە خوای گەورە سوود لەبونەوەران وەرئەگرێ ، یابەنەبونیان تووشی زیان ئەبێ ، میهرەبانی خواش هەموو بونەوەران بەشێوەیەکی گشتی ئەگرێتەوە .

هۆکارێکی تر لەسەر دووپات کردنەوەی ئەو ووشانە ، ئەوەیە کاتێ بەسەرماندافەرز ئەبێ بە تەنها : سوپاس بۆ خوای پەروەردگاری بکەین ، لەوانەیە گومان دروست ببێ کە خوای گەورە زۆر توندە لەگەڵ بونەوەران ، بەڵام بەدووپاتکردنەوەی ئەو ووشانە ئەو گومانە ئەڕەوێتەوە و بۆمان دەرئەکەوێ کە جگە لەمیهرەبانی ، خوای گەورە هیچ شتێکی تر لەگەڵ بونەوەران بەکار ناهێنێ .

بۆ زانین : زۆربەی زۆری بونەوەران بیر ناکەنەوە لەو شتە گرنگانەی لەم جیهانەدان و شاراونەتەوە ، بەتایبەتی لەلەش و دەرونی خۆیاندا کە زۆریان نازانن و نایان ناسن ، خۆیشیان بەزانا و پسپۆڕ ئەزانن ، هەندێکیشیان وائەزانن ژیر و لەخوا ترسن .کەواتە لەمەو دوا هەندی نمونەی تر لە میهرەبانی ڕوون ئەکەینەوە ، نەك بەتەنها بۆ ئەو کەسانە ئێستا زیندوون ، بەڵکو بۆ ئەو کەسانەیش لەمەو دوا دروست ئەکرێن بۆ ئەوەی باشتر تێبگەن لەبارەی میهرەبانی خوای گەورە ، ئەمانەش هەندێکن لەو نمونانە :

١- زانای سروشت ناسی فەڕەنسی ( ملین ئەدواردز ) ئەڵێ : گیانداریێ هەیە لەوەرزی بەهاردا بەتەنها ئەژی ، ئەو گیاندارە کە هێلکەی کرد گورج ئەمرێ ، خوای گەورە بە میهرەبانی خۆی ئەو گیاندارەی لەنێو درەختێکا هێلانەیەکی درێژی شیاو بۆ خۆی دروست ئەکا ، بەچەندین گوڵ و گەڵایەکی شیلاوی هێلانەکەی خۆی بەچاکی پڕ ئەکا ، ئاردی هاڕاوەی ئەو درەختە کە خۆی ساختەی هێناوە ئەیکا بەهەویرو لەو هێلانەیەدا دای ئەنێ کە کاتی هێلکە کردنی هات هێلکەی ئەکا و ئەمرێ . دووای ماوەی پێویست و دیاری کراو ئەو هێلکەیە ئەتروکێ گیاندارێکی لێ دێتە دەرێ ، دەست ئەکا بەخواردنی ئەو هەویرە دانراوە بۆ ماوەی ساڵێ ، پاش گەشە کردن و پەیداکردنی هێزی تەواوی خۆی ، ئەمیش پیشەی دایکی هەمان پیشەی ڕابوردوو بەکار ئەهێنێ بۆ مانەوەی ڕەگەزەکەی خۆی . ئەبێ ئەو هەستە بێجگە لە خوا چ کەسێ پێی بەخشیبێ بەو ؟ زۆر ڕوون و بێگومانە خوا ئەو هەستەی داوەتێ هەر بەمیهرەبانی خۆی و بەس .

٢- ئەو منداڵەی خوا دروستی ئەکا لەمنداڵدانی دایکی‌دا پێش ئەوەی لەدایك ببێ ، ووردەووردە لەمەمکەکانی دایکی‌دا شیر دروست ئەبێ ، بەر لەدیاکبوونی ئەو منداڵە بەماوەیەکی کەم ئەو شیرە شیاوی ئەوە ئەبێت کە ساوا بیخواتەوە هێدی هێدی ڤیتامینی جۆراوجۆر لە نێو ئەو شیرەدا پەیدا ئەبێ کە ئەبێتە هۆی گەشە پێدانی ئەو منالە . لەبیرمان نەچێ زانایان ئەڵێن : شیری کۆن کەبترشێ منالی تازە لەدایك بوو نابێ بیخواتەوە ، چونکە لەوانەیە ئەو منالە بەخواردنەوەی ئەو شیرە تووشی نەخۆشی و زیان بێ ، ئەبێ چ کەسێ بێ ئەو شیرە بەو جۆرە باس کرا دروستی بکا بێجگە لە خوا ؟ بەڕاستی ئەگەر بمانەوێ باسی میهرەبانی خوا بکەین لەتوانای ئێمەی ئادەمیزاد دا نی‌یە و تەمەنی زۆر درێژی ئەوێ .

﴿ مالِكِ يَومِ الدِّينِ ﴾

خوا خاوەن و سەرداری ئاین و پاداشتە ، لەو ڕۆژەدا ئادەمیزاد پاداشت و تۆڵەی هەموو کردەوەکانیان وەرئەگرن ، هەموو کردەوەی بونەوەرانی ئەمڕۆ و بەیانی و پاشە ڕۆژ تەنها بەدەستی خوایە ، کەواتە خوای گەورە وەك پەروەردگاری هەموو بونەوەرانە لەجیهاندا خاوەن و پەروەردەکەریشیانە لە پاشە ڕۆژدا .

خوای گەورە بەو ئایەتە پیرۆزە ئاگادارمان دەکا و دەمانترسێنێ بۆ ئەوەی دوور بین لە گوناە کردن و بێ فەرمانی خوا ، هانیشمان ئەدا بۆ پەرستنی خوا و بەجێ هێنانی فەرمانەکانی .. دووبارە بەو ئایەتە خاوەنێتی و گەورەیی خۆیمان بۆ دابین ئەکا لە دوا ڕۆژدا ، بەئایەتی ﴿ اَلْحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ الْعالَمِينَ ﴾ خاوەنێتی خۆیمان بۆ ڕوون ئەکاتەوە لە جیهاندا .

﴿ إِيّاكَ نَعْبُدُ ﴾

هەر بۆ تۆیە خوایە ئێمە پەرستن ئەکەین ، کوڕنۆشو کزۆڵی و مل کەچی هەر بۆ تۆیە ئێمە بێجگە لە تۆ هیچی دیکە ناپەرستین . ئادەمیزاد کەبۆی ڕوون بۆوە هەر خوای گەورە شایستەی پەرستنە چاری نامێنێ و ئەڵێ :

﴿ وإيّاكَ نَستَعينُ ﴾

هەر لەتۆش داوای یارمەتی و کۆمەك و لێبوردن ئەکەین لە ئێستا و لەدوا ڕۆژدا بۆ خۆمان و خێزانمان، بەبێ یارمەتی تۆ هیچ شتێکمان پێ ناکرێ بۆیە بەتەنها داوای یارمەتی لەتۆ ئەکەین .

ئەم ڕستە کورتە ڕانموی ئادەمیزاد دەکا بۆ دوو شتی زۆر گەورە و گرنگ کە بەختیاری هەردوو جیهان لەو ڕستەیەدایە :

١- پێویستە ئێمەی موسوڵمان هەموو شتێکی سوود بەخش بەجێ بهێنین ، بەپێی توانا ئەو شتانە بەچاکی و پوختی بیان کەین ، چونکە خوا یارمەتیمان نادا هەتا خۆمانی بۆ ماندوو نەکەین و مافی تەواوی نەدەینێ و هەموو کارێکیش بەدەستی خوایە و ئەبێ لەوی بناسین ، لە هەموو شتێکا ئەبێ پشت بەخوا ببەستین ، و بەتەمای کەسی تر نەبین و داوای یارمەتی لەکەسی تر نەکەین وکەس ماندوو نەکەین ، بۆ نمونە : ئەگەر پێنوسێ یا هەرشتێکی تر لەدەستت کەوتە خوارەوە هەڵی گرەوە و داوای یارمەتی لەکەسی تر مەکە ، بەڵام ئەگەر بەرەنگاری کارێکی گران بوی ، بەتەنها نەتوانی بیکەی ، بێگومان ئەبێ داوای یارمەتی بکەی بۆ کردنی ئەو کارە هەموو تواناى خۆتت خستە کار و بۆت نەکرا ، بەڵام بەمەرجێ خوات لەبیر بێ ، بۆ پەرستنی خوایش پێویستە داوای یارمەتی لە خوابکەی .

هەر لەبەر ئەوەیە خوای گەورە دوای ڕستەی ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾ ئەفەرموێ ﴿إِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾ ، واتە داوای یارمەتی لە خوا ، پەیژەی بەختیاری و بنچینەی سەرکەوتنە بۆ دوا ڕۆژ .

٢- پێویستە داوای یارمەتی هەر لە خوا بکەین ، زانین و ناسینی تەواومان هەر بەکاکڵەی ئاین و یەکێتی خوابێ ، جگە لەخواش قەدەغەیە لەکەسی تر بترسین ، تەنها بەهۆی ئەوەوە ڕزگارمان ئەبێ لە گۆڕ پەرستی و درەخت و بەرد پەرستی ، مرۆڤ بەو هۆیەوە کۆت و بەندەی ئەپچڕێنین ، هەر بەو بیرو باوەڕە پاکە ئادەمیزاد ڕزگاریان ئەبێ لەچنگی و

ڕوندەی کلێسا و کەشیش و مالومــەکانی گـاور و جولەکـە و ئـاین فرۆشـان و سـامان پەرستانی موسوڵمانان بەناوی نوشتە و تەریقەتەوە خەڵکی لەخشتە دەبەن و ... تادوایی .

بۆ زانین : ئەو سودانەی لە سورەتی ئەلفاتیحە وەرئەگیرێن بەشێوەیەکی کورت ئەمانەن : ئێمەی ئادەمیزاد پێویستە لە خزمەت پەروەردگاری خۆمانا ڕاوەستین ، بڕوامان بەیەکێتی و ڕاستی خوا هەبێ و ، سوپاسی خوا بکەین بە نیازی پاك و دڵی خاوێنەوە لەخوا بپاڕێینەوە هەتا زانیاری ئیش کردنمان بۆ ئاین پێ ببەخشێ ، چونکە هەر شتێ ئێمە بیچێنین هــەر ئـەو شتە ئەدورینەوە ، گفتوگۆی ڕازاوە بەتەنها سودبەخش نیە ، خوا پەرستی و دووره پەرێزی لە گوناە نزیکمان ئەکاتەوە لە خوای گەورە .

بۆ ئاگاداری : هەر گەل و کۆمەڵێ لە خوا یاخی بن و لەڕێگەی ڕاست لابــدەن، دوای ڕابواردن و ئارەزوی خراپی خۆیـان بکـەون ، دەسـت بدەنـە ڕەوشـتی خـراپ و دزی و درۆزنی و داوێن پیسی و دوو ڕویی و مەی خواردنەوە و قومارکردن و بەرتیل خـواردن و دراوسێ وەزەنی و دەمارزلی و ڕەگەز پەرستی و ڕووتی ژنان و بەرەڵڵایی منـاڵان و جنێـو فرۆشتن و بێ شەرمی و بێ ڕەوشتی و بــێ دادی و سـتەم کـردن و شـتی خراپیـان کـرد بەخورەوشت بۆ خۆیان ، بێگومان خوای گەورە ئەو گەلە سوك و ڕسواو بێ ئابڕو ئـەکا . هەمیشە دڵ ناخۆش و بێ ئـارام و سـەرگەردان و چەوسـاوەی دەسـتی دوژمنیـان ئـەکا ، باخاوەنی ژمارەی دانیشتوان و چەکی زۆریش بن.

هەر بەبیروباوەڕی پاکی ئاینی پیرۆزی ئیسلام و بڕوا بوون بەیەکێتی خوا ڕزگارمان ئـەبێ لەدەست کەڕی و کوێری و لاڵی و زیندانی کردنی ئـایین فرۆشـان. ئەگـەر ئێمـە وابـین مرۆڤێکی بڕوادار و خوا پەرستمان لێ دەرئەچێ و سەربەست و نیازپاك و بەرێز ئـەبین لای خوا و لای ئادەمیزاد ، بەندەیەکی مل کەچ بۆ خوا و ڕاست و ێژمان لێ پەیدا ئەبێ ، نــەك مرۆڤێکی دوو ڕوو تەڵەکە باز بین بەرامبەر بەباوەڕداران و بونەوەرانی تر ، خوا پەرسـت و پێغەمەر ناس ئەبین ، سەرکەوتوو ئەبین لەهەردوو جیهاندا ، خوا ئەفەرموێ : ﴿ وَمَـنْ يُطِـعِ

اللهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فازَ فَوزاً عَظیماً ﴾ ، واتە هەر کەسێ پەیڕەوی خوا و نێردراوی خوا بکا بەڕاستی ئەو کەسە ڕزگاری بووە بەڕزگار بونێکی گەورە لە دوارۆژدا .

﴿ إهْدِنا الصِّراطَ الْمُسْتَقیمَ ﴾

خوایە ئەو ڕێگەی ڕاستمان نیشان ئەدا ، ئەو ڕێگە ڕاستەی ئێمە ئەگەیەنێ بەئایینی ڕاستی ئیسلام ، شارەزایی ئێمە ئەکا بۆ لای ناسینی هەموو شتێکی چاك بەجۆرێ ئێمە سوودی لێ وەربگرین .

بۆ زانین : نزا و پاڕانەوە زۆر پێویستە بۆ ئێمەی ئادەمیزاد ، هەرچەندە خوای گەورە ڕێگەی ڕاستی بەئێمە نیشانداوە ، بەڵام وائەبێ مرۆڤ تووشی هەڵە ئەبێ بەنیازی خراپ و گومانی ناڕەوا ، دوودڵی ئەکەوێتە مێشکی ، بۆیە پێویستە داوا لەخوا بکەین لەسەر ئایین بمانهێڵێتەوە، چونکە زۆر جار تەنها مرۆڤی نەزان و نەخوێنەوار تووشی هەڵە نابن بگرە هەندێ زانا و مامۆستای ئایینی تووشی هەڵە و خراپە ئەبن و چاك و خراپ جوێ ناکەنەوە لەیەکتری ، کەواتە پێویستە داوای شارەزایی لە خوا بکەین هەتا تووشی هەڵە نەبین .

﴿ صِراطَ الَّذِینَ أنْعَمْتَ عَلَیْهِمْ ﴾

ڕێگەی کەسانێکی ئەوتۆ کە چاکەی خۆت بەسەریاندا ڕژاندووە ، ناز و نیعمەتی ڕۆژی دواییت پێ پیشانداون ، ئەو کەسانەش بریتین لە پێغەمەران و ڕاست وێژان و کوژراوانی ڕێگەی ئایین و پیاوچاکان ، ئەو کەسانەیش بەڕاستی پێشەوای گەل و نەتەوەن خاوەن ڕێز و ڕێگە نیشاندەری ئادەمیزادن ، پەیڕەوی کەرانی ڕێگەی ڕاستن ، ڕاستیان کردوە بەپەیڕەو و پرۆگرام بۆ خۆیان.

﴿غَیْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَیْهِمْ ﴾

بێجگە لەو کەسانەن خەشمیان دراوە بەسەردا لەلایەن تۆوە ، کە لایان داوە لەڕێگەی ڕاست ، شارەزای ڕێگەی ڕاستن و ئەزانن ئایینی ڕاست کامەیە کەچی خۆیان پەیڕەوی

ناکەن و ناپەرستن ، دوای ئاینی پڕو پوچی باوباپیرانیان کەوتوون ، نامەی خوایان دەستکاری کردووە ، دانیشتوان لەڕیگەی ڕاست لائەدەن . ئەو کەسانە وەك ئەو جولەکانە وان کەلەسەر ئایینی دەستکاری کراو ماونەتەوە و ، کەسانی تریش کە ئەو جولەکانە ئەکەن بەمامۆستای خۆیان و خوی ئەوانیان گرتوە .

﴿ وَلاَ الضَّالِّينَ ﴾

هەروەها جگەی ئەو کەسانەیش سەریان لێ شێواوە و ڕێگەیان ونکردووە و ڕێگەی ڕاست نادۆزنەوە ، سەرگەردانن و چاك و خراپیان لێتێك چووە ، ئەو کەسانە بریتین لە گاورەکان و خاچ پەرستان ئەوانەیان لەسەر ئایینی پوچ کراوەی عیسا ماونەتەوە ئەڵێن: عیسا کوڕی خوایە و سێهەمی سێ خوایە ، واتە عیسا خوایە .

تێبینی : ئێمە هەرچەندە ووتمان خەشم لێ گیراوەکان بریتین لە جولەکەکان ، ڕێگە وون کەرەکان لە خاچ پەرستان ، بەلام هەرکەسێ لەڕێگەی خواپەرستی لابدا ، ڕووی وەرگێڕێ لە ئایینی ڕاست و لانەدا لەئایینی پوچ ئەو کەسانەیش خەشم لێ گیراوان ، ئیتر هەر بیرو باوەڕێکی هەبێ ، لەبنەماڵەی پیاوچاکان بێ یان ، ساماندار بێ یان هەژار ، زانابێ یان نەزان .

بۆ دابین کردن و بڕوا بوون بەوانەی باسکران لەم سورەتەدا : مێژوی لەناوچون و بنەبڕبوونی گەلانی پێشوی ڕابوردوو گەورەترین بەڵگەن لەسەر ئەو ڕاستیانە .مێژوو تۆماری کردووە لەبەر چ شتێ و بەچ شێوەیەك خوا تۆڵەی لێ سەندوون و سزای داون ، زۆربەیان کراون بەپەندی ڕۆژگار لەسەر فەرمودەی خوا و زمانی پێغەمەران ، هەموو کەسێ نەفرەتیان بۆ ئەنێرن ، گەر هەندێ نەتەوە و کۆمەڵێ ڕەوشت خراپیش لەجیهاندا تووشی سزای خۆیان نەبن ، خوای گەورە لە ڕۆژی دوایی‌دا سزایان ئەدا سزایەکی سەخت تر . وەك خوا ئەفەرموێ :

﴿ يَومَ لاتَمْلِكَ نَفْسٌ لِنَفْسٍ شَيْئاً وَالاَمْرُ يَوْمَئِذٍ لِلّهِ ﴾

ڕۆژێکە هیچ کەسێ خاوەنی هیچ سودێ نیە بۆ هیچ کەسێ و ، هەموو فەرمانێ لەو ڕۆژەدا بۆ خوایە . تۆڵەی ئەو ڕۆژە زۆر سەخت ترە لەتۆڵەی جیهان .

﴿ آمِينَ ﴾

خوایە ئەو سوپاس و نزا و پاڕانەوەیەمان لێ وەربگرە کە لە سورەتی فاتیحەدا لەتۆمان داواکرد ، ئەم ووشەیە بەشێ نیە لەسورەتی فاتیحە و ئایەتێ نیە لەقورئانی پیرۆزدا ، بەڵام پێغەمەر (ﷺ) هەموو کاتێ کە سورەتی فاتیحەی خوێندبێ لە نوێژدا و لەهەموو پاڕانەوەیە کا فەرموێتی ﴿ آمین ﴾ ئێمەی موسوڵمان کە پێغەمەر (ﷺ) پێشەوامانە لەکاروباری ئاییندا وەهەرشتێ ئەو کردبێتی یا فەرمانی پێ دابێ ، یا کاری پێ کردبێ ئەو کارانە بۆ ئێمەی موسوڵمان دەستورە ، پێویستە یا چاکە ئێمەش بیکەین .بەڵام ئەبێ بزانین ووتنی ﴿ آمین ﴾ پێویست (فەرز) نیە و چاکە ووتنی .

## کورتەی مانای سورەتی فاتیحە

من بەهۆی خواوە پەنا ئەگرم لەشەیتانی دوورخراوە لە میهرەبانی خوا ، بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ، سوپاس بۆ پەروەردگاری بونەوەران ، بەخشندەی میهرەبانە ، خاوەنی پاداشتی ڕۆژی ئایینە ، خوایە هەر تۆ ئەپەرستین ، هەر لەتۆ داوای یارمەتی دەکەین ، تۆ شارەزایی ئێمە بکە بۆلای ڕێگەی ڕاست ، ڕێگەی ئەو کەسانەی چاکەت ڕژاندوە بەسەریانا ، جگەی ئەو کەسانەی خەشمیان لەسەرە ، جگەی ئەو کەسانەیش لایانداوە لەڕێگەی ڕاست ، خوایە پاڕانەوەمان لێ وەربگرە .

بەیاریدەی خوا کۆتایی پێهات ( ڕۆژ شەممە ٢٣ –مانگی زیل حیجەن بەرانبەر بە ١٩٩٧/٤/٢٧ زاینی ، بەرانبەر بە ١٤١٧ کۆچی )

خوای پەروەردگار

دەخیل

لێم ببورە

## ﴿سورەتی ئەلبەقەرە ﴾

لە مەدینەهاتوەتە خوارەوە . ژمارەی ئایەتەکانی (٢٨٦) دووسەدو هەشتاو شەش ئایەتن.. بەگوێرەی پێویستی ئیش و کاری رۆژانەی موسلمانان بەش بەش هاتوەتە خوارەوە.

لە بارەی گەورەیی ئەم سورەتەوە فەرمودەی پیغەمبەر ﴿ﷺ﴾ زۆرن : ئەحمەدی کوری حەنبەل و موسلیم و بوخاری و تاموزی و نەسائی ئەگێرنەوە لە ئەبی هورەیرەوە پیغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی : ﴿ لاَتَجْعَلوُا بُيوتكُم قُبوراً فإنَّ الْبيتَ الَّذي تُقرَءُ فِيهِ سُورَةُ البَقَرَة لاَيَدخُلُهُ الشيطانُ ﴾ ئێوە خانووەکانتان مەکەن بە گۆرستانی هیچ کاریکی تیدا نەکرێ بەراستی هەر جێگەیەك کە سورەتی ئەلبەقەرەی تیدا بخوینری شەیتان ناچیتە ناوی .

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓ ﴿١﴾ ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ لَا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ وَٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ وَبِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ﴿٤﴾ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٥﴾

﴿ الم ﴾ زانایان بیری جیاوازیان هەیەلە بارەی مانای ئەم پیتانەوە کە لە پێشەوەی هەندێ سورەتەکانی قورئانەوەن : وەك (ألمص . کهیعص.حم.عسق.ن)وە هەندێ سورەتی تر .ئەو مانایە جێگەی متمانەی زوربەی زانایان بێ ئەمەیە :کاتێ خواویستی بەرەنگاری ووتەی بێ باوەران بکا کە ئەیان ووت : ئەم قورئانە دانراوی موحەممەدە ، خوای گەورە بە

لە هەواڵ و باسی ڕووداوی جیهان هیچ شتی تری تێدا نوسراوە مەگەر بە ڕێکەوت باسی ئاینی بکرێ و بیشنوسرێ بە دەست دوژمنەوە :

بۆ زانین : ئادەمیزاد بیر لەوە ناکەنەوە ئەگەر یاسای قورئانی پیرۆز یان بچەسپاندایە و بیانکردایە بە دەستووری ڕۆژانەی خۆیان ئەبوون بە نمونەی پێشەوا یانی پێش کەوتووی جیهان پرۆپاگەندەی دژمنانی ئیسلام تەفروتونا ئەبوو ئەیشیان زانی هۆی لاوازی موسلمانان لاوازی و نەچەسپاندنی یاسای ئیسلامە ... ئەتوانین بلێین : لادان لە ڕێگەی ڕاست و داوێن پیسی و پەلاماردان بۆ سەر ناموسی و دارایی مرۆڤ و روخاندنی هێزیان و دووبەرەکی دروست کردن و هەڵگیرساندنی جەنگ لە نێوان ئادەمیزاد و موسلماناندا لە هەموو گۆشە و کەناری جیهاندا کاروکردەوەی ئەوکەسانەیە جگە لەموسلمانان و ئاینی تر ئەپەرستن . بگرە هەر ئاینیان نیە و هیچ ئاینێ ناپەرستن . بۆنمونە ئاژاوەی ئەم سەردەمەی ئێستا بە پیلان و بێ ویژدانی ڕژێمەکانی ڕۆژئاوا وڕۆژهەڵاتن بە تایبەتی ئەو چوار ڕژێمە خاوەنی ( فیتۆن لە ئەنجومەنی ئاسایشدا) دژی یاسای ئیسلام ، ڕەوشتی خراپ بڵاو ئەکەنەوە وەك لایەنگری کردنی تاڵان و خوێن مژین و پەرە سەندنی خواردنەوەی مەی و قومارکردن و پەلاماریدانی مناڵان و ڕووت کردنەوەی ژنان ئەوانە هەموویان یاسای دەست کردیان بۆ دروست کردوون بە شێوەیە کەس نەتوانێ بەرەنگاریان بوەستێ خۆ ئەگەر بەرگریان لێی بکرێ بە تاوانی دا ئەنێن و ئەڵێن : سەرپێچی لە یاسا کراوە ،وە ئەو کارە خراپانە هەمویان قەدەغەن و بە ناڕەوا دائەنرێن لای یاسای ئیسلام .

بۆ ئاگاداری : هەندێ لەو شتانە پەیوەندیان بەو (٧) حەوت ئایەتانەی پێشوە هەیە ئەیان نووسین و باسیان ئەکەین :

١- ئەگێرنەوە (پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ) بە عیمرانی کوڕی حەسەینی ووت : تۆ چەند خوات هەیە : ئەویش ووتی (١٠) دە خوام هەیە ،پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرموی : کامیان ئەگاتە فریات

و ڕزگـارت ئـەکا لـە خەفـەت و کـارە سـاتی سـامناك ووتـی هەرخوایـە ئەگاتـە فریـام پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرموی : کەواتە هەریەك خوات هەیە ئەوانی تر پڕوپوچن .

٢- کۆمەڵێ لە جیهان پەرستان ئەو کەسانەی ئاینیان بە گوێرەی کـات و ڕێکـە وتـە چون بۆلای (ئەبی حەنیفە ) بەوانی فەرمووە ئایا ئیوە لاتان چۆنە چەند تەختە و درەختێـك لە خۆیانەوە دروست ببن بە پاپۆڕی بە بێ ئەوەی کە سێ لێی بخوڕی بڕوا بە ناو زەریـا و دەریادا هەر لە خۆیەوە پڕببێ لە کەل و پەلی و پێداویستی تـر ، وە خـۆی بـە بـێ کەسـێ خۆی بپارێزێ لە شەپۆلی ئاوو گردە لوولی زەریاو دەریا ئە و پاپۆرە خـۆی رزگـار بکـا و بگاتە ووشکانی ، خۆی چۆڵ بکا لە و کەل پەلەی ناوی خۆی ، بە گوێـرەی ئـەقڵی ئیـوە ئەو شتە چۆنە ؟ ووتیان شتی وا نابێ و ناچێتە ئەقڵـەوە . ئـەبو حەنیفـە فـەرمووی : ئـە ی هەموو بونەوەرانە بەم جیاوازانە هەیانە لە یـەکتری و هەریەکـەیان کـاری خۆیـان بـە جـێ ئەهێنن چۆن بە بێ کەسێ دروستیان بکا و بیان پارێزێ چۆن ئەچیتـە ئەقڵـەوە ووتیـان تـۆ ڕاست ئەکەیت و هەموویان باوەڕیان هینا .

٣- کۆمەڵێ تر هەر لە و کەسانە بیریان وابو بونەوەران بە ڕێکـەوت دروسـت بـوون پرسیاریان لە پێشەوا شافیعی کرد وو ووتیان : بەڵگەی تـۆ چ ششـتیکە لـە سـەر بوونـی خوا. فەرمووی : گەڵای داری تو ، ئایا تام و بۆن و ڕەنگ سروشتیان وەك یەك نین بـەلای ئیوەوە وە ووتیان : بەڵێ وەك یەك وان فەرموی: کرمـی ئاورشـم گـەڵای درەختـی تـو ئەخوا ئەوریشم دروست ئەبێ مێش هەنگ ئەی خوا هەنگوین دروست ئـەبێ ئـاژەڵ ئـەی خوا شیاکە پەیدا ئەبێ و شیرو خوێنیش دروست ئەبێ ، ئاسك ئەی خوا مسك پەیدا ئـەبێ چ کەسێ وشتانە دروست ئەکا ! لە گەڵ ئەوەشدا خواردنی هەموویان هەرگـەڵای تـووە هەموو ئەو شتە جیاوازانە دروست ئەبێ ووتیان زۆر ڕاسـت ئەفـەرمووی چارەیـان نـەما و بەدڵ خۆشی خۆیان بە نیازی پاکەوە موسلمان بوون .

٤- فەیلە سوفی ئینگلیزی (هربرت سبنسر) کە مردووە لە سالّی (١٩٠٣) هەزارو نۆسەدو سیّ دا لە شاری (بریگین) ئەلّیّ : لەنامەکەی خۆیا (فی التربعە) زانینی سروشتی راست دژی ئایین نی‌یە ئەو نوسەرە ئینگلیزیە ئەلّیّ . زانینی راست و ئاینیّ کە راست بیّ سەرچاوەیان هەریەك یەك سەرچاوەیە لە یەك جویّ نابنەوەە وە جویّ بکرینەوە ئەمرن .

٥- مرۆڤێکی دوژمنی سەرسەختی ئەبی حەنیفە بەئەبی حەنیفەی ووت : خوا لە چ جێگەیەکە ، ئەبو حەنیفە قاپیّ ماستی هێنا و فەرموی : ئەو ڕۆنەی لەم ماستەدا هەیە پێم نیشان بدە ، ئەو مرۆڤە ووتی : ناتوانم . ئەبو حەنیفە فەرمووی لەم قاپە بچوکەدا تۆ ئەتوانی ئەو ڕۆنە م نیشان بدەی . من لەم گەردونە گەورەدا ناتوانم خوات نیشان بدەم ، مرۆڤەکە بڕوای هینا .

٦- ئەگەر مرۆڤ بەنیازی پاکەوە کار بکا لە بەر فەرمانی خوا خوای گەورە یارمەتی ئەدا بە جۆریّ خۆی چاوەروانی نەکات . بۆنمونە سولّتان مەحمودی پادشای ئەفغان پەلاماری (پاکستان) ی ئێستای دا کە ئەوکا تە بت پەرستبوون سەرکەوت و داگیری کرد لە ئەنجامدا هەموو بتەکانیان شکاند جگە لە بتەگەورەکەیان دانیشتوانی ئەو هەرێمە هاتنە لای سولّتان ووتیان : ئەو بتە گەورە یە مەشکینە دراوێکی زۆرت ئەدەینیّ سولّتان ڕاوێژکارەکان خۆی کۆکردەوە بۆ ئەوا مەبەستە ووتیان : ئێمە پێویستمان بە پارەو پول هەیە .سولّتان ووتی : کەواتە وەك بێژراوە ئازەری بت تاش بە منیش ئەلّێن : مەحمودی بت فرۆش دووایی فەرمانی دا بتە گەورەکەیان شکاند تەماشایان کرد ئەوەندە زیرو زیوی لەناودا بەبەهەزاران زۆرترە لەوەی ئەیاندا بە بە رانبەر بە نەشکاندنی ئەو بتە . داواکارم لە لە خوا لە گوناهەکانی خۆم و هاوسەر و خیزانم ببورە و یارمەتیمان بدە لە سەر پەرشتی خۆت . ١٩٩٧/٥/٢ زایینی .

تێبینی : بڕگەی (٦) هەرچەندە سەرچاوەکەیم دەست نەکەوت . بەلاّم ڕادیۆی (یەك گرتوی ئیسلامی ) بلاّوی کردەوە ، نوکتەیەکی زۆر گرنگە لام بۆیە تۆمارم کرد .

كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَٰتًا فَأَحْيَٰكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٨﴾ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَسَوَّىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٩﴾

دووای ئەوەی خوای گەورە باسی بی باوەڕانی کرد لەوانەیە هەبیّ لە نێویانا خۆی چاك بکا ڕویان تیّ ئەکاتەوە و ئەفەرمویّ :

﴿ کیف تکفرون بالله ﴾ چۆن ئیّوە بڕوا بە یەکێتی خوانا هێنن ، وە بە لگەی ڕونتان لایە کە ببێتە هۆی ڕاکێشانتان بۆ لای باوەڕ بە یەکێتی خوا ئەگەر ئیّوە ئەقلتان بخەنە کار وە ئەو بە لگانەی زۆرن لە گۆشەو کەناری جیهاندا و هەموو بونەوەران بە لگەن لە سەر یەکێتی خوا بوونی خوا . وە خوای گەورە بەو پرسیارە بی باوەڕان ئەترسینیّ هەڕەشەیان لیّ ئەکاتەو ئەفەرمویّ :

﴿ و کنتم امواتاً فاحیاکم ﴾ وە ئیّوە مردووی بیّ گیان بوون یا لە نێو چەندین ڕوەکێکی خواردەمەنی بیّ گیاندابوون یا لە نێو خوێنێکی مردوو یا دلۆپیّ ئاوی بیّ گیان یا پارچەیە خوێن و پارچە گۆشتێکی مردوبون لە نێو منداڵدانی دایکتانا ئەبیّ خۆتان بزانن لە ناوکتانەوە خواردەمەنی داونەتیّ وردە وردە گەشەی پیّ کردن لە پاش ماوەی دیاری کراو بە زیندوویی ئیّوەی هاورد بۆ سەرزەوی و

﴿ ثم یمیتکم ﴾ لە پاش تەواوکردنی تەمەنی دیاری کراو بۆتان خوا ئەتان مرێنیّ و هەموو لە شتان ئەڕزیّ و گیانتان ئەمێنێتەوە لە جێگەیە خوا ئەیزانیّ و بە س .

﴿ ثم يُحيكم﴾ لە پاشا خوا دووای مردنتان بۆ جاریّ تـر دووهـەم زیندوئەکاتـەوە لـە ڕۆژی هەڵسانەوە تان لـە گۆڕدا ئەو گیانە ماوەوەی پێشەوەتان ئەکاتەوە بە بەرتانا پرسـیارو و وەڵامی کردەوەی زیندەکانی جیهانتان لێی ئەکا بۆ پاداسشت و تۆڵە .

﴿ ثم اليه ترجعون﴾ لە پاش زیندوبونەوەتان لە جـاری دووهـەمدا ئێـوە بـۆ لای خـوا ئەگەڕێنەوە هەمووتان کۆ ئەکرێنەوە لە پاشەڕۆژدا بۆ وەرۆرگرتنی پاداشت .

بۆزانین : بێگومان ئەوکەسەی لـە نەبونەوە ئێوەی دروست کردووە زۆر ئاسانە لای ئەو کەسە پارچەکانتان کۆبکاتەوە لە دووای ڕزینتـان بیـان کاتـەوە بـە لـە شـەکەی جارانی پێشووی جیهان و گیان بکاتە تەوە بـە بـە رتانـا ، وە کەسـیّ بتوانـیّ کۆشـکیکی نایـاب دروست بکا ئەتوانیّ بە ئاسانی تر زنجیّ دروسـت بکـا یـادووای ڕووخـان بـۆ جـاریّ تـر ئەوکۆشکە دروست بکا تەوە .

﴿ هو الذي خلق لكم ما في الأرض جميعاً﴾ خوا کەسێکی ئەوتۆیـە دروسـتی کـرد بـۆ سودی ئێوەی ئادەمیزاد شتیّ لە زەویدا بە گشتی بە سەریەوەبیّ هەمرو شتیّ ئیوە سـودی لیّ وەربگرن وەکو هەواو ئاوو ئاژەڵ و کێوو بەرد ، یا لـە نێو زەویدا بیّ وەك نەوت و زیـڕ و زیو ئەڵماس و قیرو شتی تر هەموویان بۆ سودی ئێوەیە ئیتر چۆن باوەڕ بـە خـوا نـاهێنن سوپاسی ناکەن ؟

﴿ ثم استوى الى السماء﴾ لە پاشا ڕۆی خۆی بۆ لای دروست کردنی ئاسمان کـرد بـە ئەوپەڕی ڕێك و پێكی دروستی کرد و ڕێکی خست و بە کۆتایی گەیاند .

﴿ فسواهن سبع سماوات ﴾ دووایی خوا ئاسمـان ڕێـك خسـت و دروسـتی کـردن بـە حەوت ئاسمان بە بیّ خواری و لاری و کەم و کورتی .

بۆ ئاگاداری : باسکردنی ووشەی (سبع) ئەوە ناگەیەنیّ جگە لە حەوت ئاسمان ئاسمـانی زۆرتر نەبن بەڵام ئەوە ئەگەیەنیّ ئاسمان لـە حەوت کەمتر نـین بـە گوێـرەی زانـین و زمـان ناسین ژمارەکان ، مەبەست لە مانای کانیان ناکەن هەرتەنها ئەو ژمارەیە ناوی براوە . واتە

هەرکاتێ بێژرا حەوت دینارم بدەرێ یا حەوت دینارم هەیە مانای وانیە لەوەزۆرترم نەداتێ یازۆرترم نیەیە بێگومان زانیاری ڕوونی کردووەتەوە ئاسمانەکان زۆرترن لە حەوت ئاسمان .

﴿وهو بكل شي عليم﴾ وە خوا بە هەموو شتێ ئەزانێ زۆربن یان کەم کە لە ئاسمانو زەویدان بە گشتی .

وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُوٓاْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ۖ قَالَ إِنِّيٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِي بِأَسْمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ قَالُواْ سُبْحَٰنَكَ لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣٢﴾ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ ۖ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسْمَآئِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّيٓ أَعْلَمُ غَيْبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٣٣﴾

﴿واذ قال ربك للملائكة﴾وە تۆ محمد بیری ئەو کاتە بکەرەوە پەوەدەکەری تۆ ووتی بە فریشتەکان ئەو فریشتانە لەسەر زەوی بوون .یا هەموو فریشتەکان بەگشتی:

﴿انی جاعل فی الارض خلیفة﴾بەراستی من دروست ئەکەم و ئەگیرم لەزەویدا جێگە نشینێ بۆ ئێوە،وە جێکەی ئێوە بگرنەوە لە زەویدا وە ئێوە لە زەویدا نایەڵم ئەو جێگە نشینە بریتیە لە ئادەم وپێغەمەرەکان بۆ بەڕیوە بردنی بەندەکانی خۆم ڕێگەی راستیان نیشان

ئەدەم و ئەوانیش ریگەی راست فێری ئەوان بکەن . وە پیغەمبەران نوینەرن بۆ وەرگرتنی راستی و گەیاندنی بەدروست کراوانی خوا هانیان بدەن بۆ چاکە و بیبیان تر سێنن لە خراپە کردن.

﴿قالوا أتجعل فيها من يفسد فيها و يسفك الدماء﴾ فریشتەکان ووتیان : ئایا خوای ئیمە تۆ دادەنیٚ لە زەویدا کەسیٚ خراپە بکا لە نێو زەویدا و برژێنن خوینی خۆیان بە نارەوایی و بیٚ تاوان ؟

﴿ونحن نسبح بحمدك﴾ وە ئیمە پاك و خاوینی تۆو دەرنەبڕین و دوورتەخەینەوە لە هەموو شتیٚ شایستە تۆ نەبیٚپەیوەست بیٚ بە سوپاس کردن بۆ تۆ ئیمە بۆ نوێژئەکەین ئیمە ئەڵێین :﴿سبحان الله و الحمد لله﴾ پاك و خاوێنی بۆ خوایە وە سوپاس بۆ خوایە .

﴿ ونقدس لك﴾ وە ئیمە باسی تۆ ئەکەین بە پاکی لە هەموو شتیٚ شایستەی گەورەی و توانای تۆ نەبیٚ و ڕێزی تۆ ئەگرین بە جۆریٚ شایستەی ڕێزی تۆ بیٚ .

﴿ قال انی اعلم ما لا تعلمون﴾ خوا فەرمووی بە فریشتەکان : بە راستی من ئەزانم شتیٚ ئێوە نایزلانن ئەو کەسانە من لە سەر زەوی دا یان ئەنیم هەیانە من ئەپەرستن وەك پیغەمبەران و پیاو چاکان ، هەیانە بیٚ فەرمانی من ئەکەن دادپەروەری خۆمیان پیشان ئەدەم سودی زۆریان هەیە بۆ ئاوەدان کردنەوەی زەوی زیرەکی زۆرم پیٚ بە خشیون.

پ/ فریشتەکان چۆنیان زانی نەوەی ئادەمیزاد خراپە ئەکەن و ئاژاوەچین و خوێن ڕێژن؟

و/ بەم بەڵگانەی خوارەوە بۆیان ڕوون و ئاشکرا بووە نەوەی ئادەم خراپە ئەکەن خوێن ڕێژن :

١- پێش ئادەمیزاد خوا جنۆکەکانی لە سەر زەوی دا نابوو وە دەستیان کرد بە خراپە کردن و خوێن ڕێژی و بەو بۆنەوە وایان ئەزانی هەرکەسیٚ لە سەر زەوی بیٚ خراپە کەرو خوێن ڕێژ ئەبن .

٢- فریشتەکان لە شێوەی پرسیار ئەو گفتو گۆیانەیان لــە خزمــەت خواداکــرد هــەتا خوای گەورە بۆیان ڕوون بکاتەوە ئایا ئەوەی ئادەم خوایە کــەرو خوێــن ڕیــژن یانــە؟ مەبەستیان ئەوە نەبوو کاری خوایان لاگرانتربێ .

٣- خوای گەورە پێش دروست کردنی ئادەم فریشتەکان ئاگادار کردبونەوەی ئــادەم خوایە کەرو خوین ڕێژ ئەبن بۆیە ئەو شتانە یان لە خزمەت خوادا ووت خوای گــەورە لە وە لاّمی فریشتەکان دا فەرمووی : من ئەزانم شتێ ئێــوە نــایزانن هەرســێ پرســیارە کاندا بەو جۆرە وەڵامی دانەوە .

تێبینی: هیچ بە لْگەیەکی دیاری نی‌یە بۆ ناسینی فریشـــتەکان و چۆنێتیـان بــە جۆرێکــی بینراو نە بە عەقلْ و نەبە هەست پێ کردن و تاقی کردنەوە و بــەراورد کردنیــان لــە گــەلْ شتێکی تردا وەجگە سروش لە سەر زمانی پێغەمبەران کە پێویســتی کــردووە لــە ســەرمان باوەرمان هەبێ بە بوونی فریشتەکان بەلْگەی ترمان نیەو کەسێ باوەری بە ســرووش نــەبێ دروست نی‌یە گفتو گۆی لە گەلْ بکرێ لە بارەی بوونی فریشتەکانەوە ، چونکە باوەڕ بــە بوونی فریشتە لقیکە لە درەختی سرووش ، دووایی ئەگــەر چارمــان نــەما وە پێوســت بــو بکەوینە ووتوویژ لەگەلْ کەسێ بڕوای بە بوونی فریشتە نەبێ پێویستە لە بارەی سرووشەوە و ڕاستی سرووشەوە وە گفتوگۆی لە گەلْ بکرێ هەرکاتێ بڕوای بــە ســۆروش و ڕاســتی سروش کرد بڕوایش بە بوونی فریشتە نەهێنێ ئێمە بە و کەسانە ئەلْێن : بڕوای بە ســرو ش نی‌یە تۆ مافی ئەوەت نی‌یە بەزۆری و توندی و تیژی بیری خۆت بسەپێنی بە سەر کەســێکا بڕوای بە سروش هەیە ئەگەر بۆ تۆ دروست بێ بۆ ئەویش هەیە بە تۆپزی بــیری خــۆی بــە سەر تۆدا بسەپێنێ کە سرووش ڕاستە .دووایی ئەو کەسە باوەڕی بە ســروش نیــە ووتــی : بەو کەسە باوەڕی بە سرووش هەیە ئەو بڕوایەی تۆ بە سروش پوچە ، چونکە نەبــە چــاو و هەستەکانی تر و نەبە تاقی کردنەوە سرووش نەزانراوە . دووبارە ئەو کەسە ی تریش بــۆی هەیە بە و کەسە بلْێ : بێ باوەڕی تۆیــش بــە وشــتە نــەزانراوە کەواتــە بــوون و نــەبوونی

سروش وە ك یەك وان لە بارەی بەلگەوە شتی نهێنی بە شتێ تری نهێنی دابین ناکرێ .
بەڵام ئێمە بڕوادار بڕوای بێگومانمان هەیە بە قورئان کە کەس ناتوانێ وێنەی دابنێ سرووش ی قورئان ڕاستی سرووشی دابین کردووە ئە فەرموێ فریشتەکان هەن کەواتە ئێمە بڕوایشمان بە بونیان هەیە ، وە ئیوەی بێ باوەر بەلگەی دیارتان نی‌یە جگەی ووتەی خۆتان. زانایان ئەڵێن : فریشتەکان لە شتێکی ڕوونـاك و بێ خەوشـەن ، لـە ڕوونـاکی دروست کراون ، نێرو مێ یان نیـە ، خـواردن و خـەوتنیان نی‌یـە . بەردەوامن لـە سەر پەرستنی خوا .بێ فەرمانی خوا ناکەن .ئەچنە وێنەی هەموو شتێ جگەی سـەگ و بـەرازو شتی تری بێزلێ‌کراووە وە هەندێکیان لە لایەن خواوە فەرمانی تایبەتیان پێ سپێراوە .

بۆ ئاگاداری : ﴿ خلیفه ﴾ جێگەنشین بریتین لە ئادەم و کوڕو نەوەکانی ، جێگەنشینی فەرمانی خوان یا جێگەنشینی فریشتەکانن ، وە خوای گەورە کـارو بـاری زەوی داوەتـە دەستیان کـە هـەموو کـات و جێگەیـەکدا بـەو بۆنـەوە پیـت و فـەڕی شـاراوەی زەوی دەرئەهێنن و بەکاری دێنن بۆ سوودی خۆیان وە دادپەروەری بلاو بکەنـەوە بـە گوێـرەی یاسای خوای گەورە وە ستەم لە یـەکتری ناکـەن بـە هـەموو شـێوە بـە زەی‌وی ئـازەدان بکەنەوە .

وە گفتو گۆی فریشتەکان لە خزمەت خوادا وامان پیشان ئەدا کە لـە پێـش ئادەمـەوە دروست کراوی تر هەبوون ، پێش ئەوەی خوا ئادەم دروسـت بکـات خـوا فریشـتەکانی ئاگادارکردەوە ئەوەی ئادی‌ەم دووای دروست بونیان و دانانیـان لـە سـەر زەوی کـاری خراپ ئەکەن و خوێن ڕێژی ئەکەن لە سـەر زەوی هـەروەها بۆسیشـمان ڕوون ئەبێتـەوە خوای گەورە هێزو توانای تایبەتی بە خشیوە

بە ئادەم و نەوەکانی ، وە فریشتە نایان زانن ئەو کەسانە لە ئادەمیزاد خراپە بکەن بـەر پرسیارن و بێ هودە نارۆن سزای کردەوەی خۆیان و پاداشتی چاکەی خۆیان وە رئـەگرن ئەگـەر فریشـتەکان بیانزانیبایـە ئـادەمیزاد بۆنبـای زەرەو هیدرۆجـین و ناپـالم و چـەکی

کاولکەری تر دروست ئەکەن و بەکاری دێنن لە بنەبرکردنی یەکتردا گفتوگۆکانیان لە خزمەت خوادا درێژەی ئەکێشا .بێژراوە لە لایەن زانایانەوە بەر لە ئادەم کۆمەڵێ تر لە دروست کراوانی خوا لەم سەر زەوی یەوە دا ژیاون شیوەیان لە ئێمەی ئادەمیزاد ەوە نزیك بووە ، لە ئەنجامدا زۆرتر لە ئادەمیزاد خراپەو دوژمنایەتی یەکتریان کردووە ، یەکتریان بنەبڕ کردووە و قەڵاچۆی یەکتریان کردووە . ئەتوانین بلێین :لە ڕاستی ئەچێ خوایش هەموو شتێ ئەزانێ ئەم بۆچونە ڕێك ئەکەوێ لە گەڵ زانستی زانایان و پسپۆرانی زەوی هەلکەن کە ووتویان ە : کلەسەرو پەیکەر و پاشماوەی وایان دەرهێناوە لە نێو زەوی دا لە شێوەی ئادەمیزاد ئەچن ، نەك هەموو جۆرە شێوە وە ئەوەیش بوو بە هۆی ئەوە هەندێ لە بیروباوەرە پوچەڵەکان بلێن : ڕەگەزێ لە بونەوەران ئەگۆڕێ بۆلای ڕەگەزێ تر بەو بیروباوەڕە پوچەڵە یان هەزاران لاوی دڵپاکیان لە خوا لادا ، بە داخەوە پەیڕەویان کردن کە گۆیا ئادەمیزاد لە کۆنا ڕەسەنی مەیمون بووە .

بۆ زانین : گفتوگۆی فریشتەکان لە خزمەت خوای گەزورە دا وانەیەکی بە نرخ و ئامۆژگاریەکی بە سودمان فێرئەکەن ئادەمیزاد سودی لێ وەر بگرن ئەوەیش ئەمەیە ، ئادەمیزاد با ئەو پەڕی زانیاری هێزو ئازایی و پاکی و دەسەڵاتی ئاینی و جیهانی هەبێ ناگاتە ئەو ڕادەیە ڕەخنەی لێ نەگیرێ و گفتو گۆی لە گەڵ نەکرێ .لە جێگەیە خوای گەورە بەو هەموو بەرزی و گەورەییەوە هەیەتی ڕیگەی دا بە فریشتەکان ووتوویژی لە خزمەتدا بکەن وە لە سەردەمی خۆیاننا گفتو گۆیان لە گەڵ دروست کەری خۆیانا کرد لە گەڵ ئەوەیشدا بەندەیی و مل کەچی بە رانبەر بە توانای خوای پەروەردگار ی خۆیان هەبوو.ە لایان ڕوون بوو جگەی خوا شایستەی ڕێز نی‌یە و سوپاس و پەرستنی بۆ ناکرێ خوای گەورەیش میهرەبانی لە گەڵدا کردن وە بەلگەی شایستەی بۆ فریشتەکان ئەهێنایەوە وە زۆرو هەڕەشە بەکارنەهێنا لە گەڵیان. کەواتە ئێمە و ئەو کەسانە کە خۆمان بە بەرزتر دابنێین لە جگەی خۆمان و بە لامان وایە ڕەخنەمان لێ نەگیرێ ، بەو ووتوویژەی

فریشتەکان لە خزمەت خوادا چرکەبە بە دڵمانابێت کە بەو کردەوەیە بیزانین یا نەیزانین خۆمانمان بە گەورەتر داناوە لە خوا و هەستی پێ ناکەین و چ کرداری لەو کردارەی ئەوان خراپترە ؟

﴿وعلم ادم الاسماء کلها﴾ وە خوا ئادەمی فێری ناوی هەموو بونەوەرانی بە گشتی کرد، بە و رِستە یە خوا فریشتەکانی ئاگادار کرد کە ئادەم بە رِێزترە لە ئێوەو هەموو بونەوەران چونکە رِێزی هەموو بونەوەری بە زانین و زانستە خوا ئادەمی دروست کردووە لە چەند بەشی جیاجیا و لە چەند رِەگەزی جیاواز لە یەکتری وەك گڵ و ئاو و ئاگر و هەوا ، بەوبۆنەوە ئامادەیە بۆ زانینی هەموو شتی نهێنی و ئاشکرا ، بۆ دۆزینەوەی شتی نادیار و جیاواز لە یەکتری بە تایبەتی پیت و فەرِی نێو زەوی و سەر زەوی دەربهێنن و کانگاکانی بدۆزنەوە بیان خەنە گەرِ بۆ سودی خۆیان وە زیرەکی وامان پێداون بۆشایی گەردوون تاقی بکەنەوە .

﴿ ثم عرضهم علی الملائکة ﴾ لە پاشا خوا رِای گەیاند نێو نراوەکانی ئەو ناوانە بەسەر فریشتە کاندا وە ئەوانی پیشان دان بۆ ئەوەی بێ دەنگیان بکا و بۆیان دەرکەوێ گەورەیی ئادەم خوا فەرموی بە فریشتەکان :

﴿ فقال انبئونی بأسماء هؤلاء ان کنتم صادقین﴾ دووایی خوا فەرموی : ئێوە هەواڵم بدەنێ بە و شتانە ئەم ناوانەیان بۆ دانراوە ئەگەر ئێوە رِاست ئەکەن لە گفتو گۆی خۆتانا کە ئێوە شایستەی جێگەنشینین و لە ئێوە زاناترم دروست نەکردووە ، ئەو ئایەتە روونی کردەوە بە بەڵگە لە سەر ئەوەی زانیاری و فێرکردن پلەیەکی زۆر گەورەی هەیە لای خوا و لای فریشتەکان وە ئادەم و نەوەی ئادەم شایستەو ئامادە کراون بۆ زانین و زانستی.

﴿ قالوا سبحانك لاعلم لنا الا ما علمتنا انك انت العلیم الحکیم﴾ فریشتەکان ووتیان: خوا بێ پاکی بۆ تۆیە و تۆ دوورتری لەوە رِەخنە بینە سەرت ، هەرشتێ تۆ دروستی بکەی بێهو دەنبەوە وە تۆ ئەو شتەی دروستی بکەی پاشەرِۆژێکی بە نرخی هەیە .هیچ زانینێ بۆ

ئیمە نیە مەگەر شتیٚ تۆ فیٚری ئیٚمەت کردبیٚ . بە ڕاستی تۆ ئەزانی بە هەموو شـتیٚ و هیـچ شتیٚ لە تۆ پەنهان نی‌یە هەموو شتیٚ لە جیگـەی شـیاوی خۆیـا دائـەنیٚ و دادپـەروەری و خراپە ڕووناکاتە فەرمانی تۆ کاتیٚ فریشتەکان نەزانینی خۆیان دەربڕی خوا فەرمووی :

﴿قال یا ادم أنبئهم بأسمائهم فلما أنبئهم بأسمائهم﴾ خوا فەرمووی بـە فریشـتەکان ئـەی ئادەمتۆ هەواڵ بدە بە فریشتەکان بە ناوەکانیانم .

﴿قال الم اقل لکم انی اعلم غیب السماوات والأرض﴾ خوا فەرمووی بە فریشتەکان : ئایا من بە ئیٚوەم نەووت : بە ڕاستی من نهینیەکان ئاسمانەکان و زەوی ئەزانم و لـەمن پەنهان نین ؟

﴿و اعلم ما تبدون و ما کنتم تکتمون﴾ وە من ئەزانم شتیٚ ئیوە ئاشـکرای ئەکـەن وەك ئەوەی ئادەمیزاد خراپە ئەکەن و شتیٚ ئیٚوە ئەی شارنەوە کە ئیٚـوە شایسـتەی جیٚگەنشـینی منن لـە ئاوەدانکردنەوە ی زەویدا .

وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ



﴿واذ قلنا للملائکة﴾ موحەممەد تۆ بیری ئەوکاتە بکەرەوە ئیٚمە بە هەموو فریشـتەکانمان ووت بە جبرەئیل و بە میکائیلیشەوە :

﴿ اسجدوا لادم ﴾ ئیٚوە ستایش بەجی‌بیٚنن بۆ ئادەم وە ملی‌بۆ شۆڕ بکەن بـە ئەوپـەڕی ڕیٚزگرتن بۆ ئادەم .

﴿ فسجدوا الا ابلیس ﴾ دووایی فەرماندانی خوا فریشتەکان سوژدەیان برد بۆ ئادەم و ملیان بۆ دانەواند جگە لە ئیبلیس ئەو ڕێزی ئادەمی نەگرت و ملی بۆ دانەواند و لە فەرمانی خوا دەرچوو .

﴿ ابی واستکبر﴾ ئیبلیس سەرپێچی کرد لە سوژدەو مل دانەواندن و خۆی بە گەورە دانا و بەرزتر لەوە ڕێزی ئادەم بگرێ .

﴿وکان من الکافرین﴾ وە ئیبلیس لە بێ باوەڕان بوو فەرمانی خوای بە جێ نەهێنا و ڕێزی ئادەم نەگرت و خۆی بە گەورەتر دانا لە ئادەم .

بۆزانین :فەرماندانی خوای گەورە بەفریشتەکان کەمل بۆ ئادەم دانەوێنن بەڕێزگرتنی ئادەم ،لەبەرزی پلەی ئادەمە بەسەرفریشتەکان وهەموبونەوەراند،وەئەو پلەبەرزەش هەرلەبەر گەورەیێ زانینە کەخوا بەخشیوێتی بەئادەم ،زۆرتر لەهەموو بونەوەران ،بۆیە خوای گەورەپێویستی کردوە لەسەر پیاوان وژنانی موسلمانان خوێندن وفێری زانست بن.

زانایان بەزۆری ئەڵێن :سوژدە بردن بریتی لەچەمانەوەی مل وبەرزکردنەوەی دەست ،چونکە سوژدەبردن بۆجگە خوا قەدەغەیە . بەڵام خواهەرشتێ فەرمانی پێ بدا دروستە ،ئاشکرایە سوژدەبردن بەفەرمانی خوایە وبۆخوایە،نەك بۆ ئادەم.زانایان بیریان جیاوازە لەبارەی ئیبلیسەوە ئایا یەکێکە لەفریشتەکان یایەکێکە لەجنۆکەکان ؟ئەوەی راستی بێ یەکێکە لەجنۆکە کان .وەبۆناسینی شەیتان جگە لە سروش بەڵگەی ترنییە .

پ .هەندێ لە مێژوو بەسەرهاتی گەلاتی رابوردو چەند جارێ دوپات ئەکرێنەوە چ سودێ لەدوپات کردنەوەیاندا هەیە هەروەها باسی ئادەم و شەیتان باسی موسا وفیرعەون چەند جار لەقورئاندا باس دەکرێن ؟

وەلام:خوای گەورە ئەوباسانە بەجۆرێ دائەرێژێ پێویستە دوپات بکرێنەوە وەئەوباسانە کەدوپات دەکرێنەوە بەڕواڵەت لەیەك شێوەدان لەناوەرۆکدا هەریەکەیان شتێکی تازەی

وای تێدایە لەوی تریانی جیا ئەکاتەوە ، وەبەدوپات کردنەوەی ئەوباسە ئەنجامی ئەومەبەستە کۆتایی پێ دێت کەواتە ئەوکەسانەی ڕەخنە لەدوپات کردنەوەی هەنێ لە باسەکانی قورئان ئە گرن ئەگەر بەجۆرێکی دادپەروەری بێلایەنی تەماشای ئەوباسانە بکەن بۆیان ڕون ئەبێتەوە ئەوباسانە لەیەك جیان لەناوەرۆکدا لەمەبەستدا .دوبارە هەنێ لەدوژمنانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام لایان واە قورئان باسی هەندێشت ئەکات جگە لە کارێکی هونەریو کات کوشتن و رابواردن هیچ شتی لێوەدەرناکەوێ ئەوەی ڕاستی بێ ئەگەرهەموو کەس تەماشای مانای ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزبکەن بەدلێکی کراوەوسروشتێکی پاکەوە بۆی روون ئەبێتەوە کەقورئانی پیرۆز نوسراوێکی بلندی وایە ئادەمیزاد بانگ دەکات بۆلای ژیانێکی تازە شایستەوگونجاو بۆهەموو کات هەموو جێگەیە بەجۆرێ دارێژراوە کەیاساو پرۆگرامێکە بکرێت بەدەستور بۆ ژیانی ڕۆژانە نەك چیرۆك ورابواردن و کات کوشتن وکاری هونەری بێت .

تێبینی :سوژدەبردن بۆجگە خوا قەدەغەیە ڕێزی ئادەمیزاد پێویستە بەشێوەیەك بگیرێ لەیاسای ئیسلام دەرنەچێ فەرمودەی پێغەمبەر﴿ ﷺ﴾ بکەین بەدەستوری خۆمان پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ئەفەرموێ بەمەعازی کوڕی جەبەل سوژدەبردن بۆجگەلەخواقەدەغەیە ئەفەرموێ لەکاتی ڕێزگرتن لەیەك تری دەستی یەك بگوشن نەك سەرخەفانی یەکتری ماچ کردن ئەوسوژدەبردنە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ قەدەغەی کردوە خاوەنی تەفسیری قورتوبی ئەڵێ: هەندێ نەزان ونەخوێنەوار کەسەربەتەسەووفن کردوویانەبەڕەوشت بۆخۆیان ،خۆیان بێهۆش ئەکەن ،کاتێ ئەچنەلای پیرەکانیان داوایلێخۆش بوونی گوناهەکانیان ئەکەن ،وەئەبینرێن لەوکاتانەدا سوژدەبۆپیرەکانیان ئەبەن ،ئیتر ئەوکەسانە هەربیروباوەرێکیان هەبێبەرەوگومرایی ئەڕۆن وکردەوەکانیان بەپوچی وبێسودی ئەڕۆن .

دووبارەخاوەنی تەفسیری قورتوبی ئەفەرموێ:زانا ئاینیەکان فەرمویانە :جگەلەپێغەمبەران ئەگەر کەسێکاری پەك خەرو بەهەمووکەس نەکراوی لێدەرکەوت نیشانەی ئەوەنی یە

ئەوکەسە دۆست وپیاوی خوایە .بەپێچەوانەی بیری هەنێ لەسۆفیەکان وڕافزیەکان لایان وایەئەوکەسانە کاری نائاسایی ئەکەن نیشانەی ئەوەیە پیاوی چاکی خوایە،ئەگەر دۆستی خوانەبێ ئەوکارانەی بۆناکرێ.بەڵگەی زانایان ئەوەیە کاتێ ئێمە بڕوامان وابێ ئەوکەسەپیاو خوایە بەباوەڕەوەئەمرێ ئەوەش جگەی خوا کەسی تر نازانێ کەواتە ناتوانین بڵێین بۆئەوکەسەپیاوخوایە: هیچ کەسێ نەخۆی ونەکەسی تر بەباوەڕەوەئەمرن کاری نائاسایی نابێتەنیشانەی پیاو چاکی بۆنموونە بێباوەڕان و ئاگروگا پەرست بوزیەکان وجگەی ئەوانیش کاری نائاسایی وائەکەن زۆر جێگەی سەرسوڕمانە خۆئەگەر کەسێ بەناو مووسڵمان بێ هەنێ فەرمانەکانی خوا بەجێ نەبەرێو کاری نائاسایی بکات ئەوەسەرلێشێوانە بۆ خۆی وجگەی خۆی بەڵام سۆفیەکان وڕافزیەکان ئەڵێن دروستە خوا هەنێ لەپیاوچاکان ئاگاداربکات کەخۆیان وهەنێ کەسی تر بە باوەڕەوەئەمرن پێشەوا ئەبی حەسەنی ئەشعەری هەنێ لەزانایانی تر لەوباوەڕەدان بەوێنەی سۆفیەکان ، نازانرێ خوابەچ جۆرێ وەبەهۆی چ کەسێکەوە دۆستانی خۆی جگەلەپێغەمبەرانی ئاگادار کردوە خۆی یاجگەخۆی بەباوەڕەوەئەمرن ؟

وَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣٥﴾ فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ ۖ وَقُلْنَا ٱهْبِطُوا۟ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ وَلَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٣٦﴾ فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٣٧﴾ قُلْنَا ٱهْبِطُوا۟ مِنْهَا جَمِيعًا ۖ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَن تَبِعَ هُدَاىَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٣٩﴾

بێ گومان دوای ئەوەی شەیتان بێفەرمانی خوای کـردوو ملـی بـۆ ئـادەم دانەنـەوان خوای گـەورە شـەیتانی بێـبەش کردلەمیـهرەبانی خـۆی ،لەبەهەشـتی دەرکـرد،وەئـادەم وحەوای ژنـی ئـادەمی لەبەهەشـت هێشتەوە ،وەلـەپاش وئـەویش خوارونـی کردەوەبـۆ ئادەمیزاد ڕێزی ئادەم وسەرپێچی کردنی شەیتان لـەفەرمانی خوا .خوائەفەرموێ:

﴿و قلنا يا آدم أسكن أنت و زوجك الجنة ﴾ وەئێمە ووتمان :ئـەی ئـادەم تۆوژنەکـەی خۆت دانیشن لـەبەهەشت ،لـەهەرجێگەیەئارەزوتان هەیە..دارژانـی ئەوراسـتیەوامان نیشـان

ئەدا لەدانیشتنی خانوودا ژن دوای پیاوئەکەوێ ،وەمێردلەهەرجێگەیەبێت پێویستە ژن لەلای بێت ،وەژنیش پێشەواوگەورەی خانوە.

زانایان ئەڵێن : ئەوژنەی ئادەم ناوی حەوایە.هەرچەندلەمەوپێش باسی ژنیئادەم نەکراوە. بەڵام بەڵگەی ڕاست هەیە کەئەوژنەی ئادەم لەبەشێکی لەشی ئادەم دروست کراوە ، وەك ئەوەخوا ئەفەرموێ:لەئایەتی(١٨٩)دالەسورەتی ئەلئەعرافدا .

﴿ وَجَعَلَ مِنها زَوجها لِيَسْكُنَ إليها ﴾ وەخوادروستی کردوەلەنەفسی ئادەم یالەڕەگەزی ئادەم ژنەکەی خۆی ،بۆ ئەوە ئادەم دانیشێ لای ژنەکەی خۆی،لەئایەتی(٢١)یسورەتی ڕۆمدائەفەرموێ :

﴿وَمِنْ آياتِهِ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أنفُسِكُمْ أَزواجاً لِتَسكُنوا إلَيها ﴾ وەهەندێکەلەنیشانەکانی خواکەدروستی کردوەبۆئێوە لەلەشی خۆتان ولەڕەگەزی خۆتان ژنەکانتان بۆئەوەئێوەدانیشن وئارام بگرن لایان ،لەرەگەزی جگەخۆتان دروستی نەکردوون هەتادورەپەرێزینەکەن لەگەڵیان .

بۆ زانین :هەنێ‌لەزانایان ئەڵێن : ژن لەپەراسوی پیاودروست کراوە.بەڵام ئەوەیشایانی باس بێت مەبەست ئەوەیە :هیچ جیاوازینی‌یە لەنێوان ژن وپیاودا.ژن لەپیاوە،وەپیاویش بەشێکەلەژن .وەبەهەرجۆرێ‌بێ‌مەبەستەکەناگۆرێ.لەبیرمان نەچێ‌دروست کردنی حەواپێش چونی ئادەم بێ‌بۆ بەهەشت یا دوایچونی بێ‌بۆبەهەشت گرنگ نی‌یە ئەوەیئاشکرابێ‌ئادەم وحەوا هەردوکیان لەبەهەشتا پێکەوەدانیشتوون .

بەڵام ئەوەیڕاستی بێ‌حەوا دوای دروست کردنی ئادەم بوە،بۆیە پیاوپێشەواوچاولێ کراویژنانە .

بۆئاگاداری : زانایان وپسپۆرانی شارەزا لەبارەیبەهەشتەوەبریاریان داوەکەبەهەشت ئەوجێگەیە پاداشتی چاکەی باوەڕدارانە لە پاشەرۆژدا . ئیتر گرِ و گاڵی ئەو کەسانە

وتویانە : بەهەشت لەجیگەیەتردایە جێگـەی بـڕوای زۆربـەی زانایـان نیـە بـەبێباوەڕ و خوانەناس دائەنرێن ئەوکەسانەبڵێن لەجێگەیەترە .

﴿ وکلا منها رغدا حیث شئتما﴾ وە ئێوە هـەردوکتان بخۆن لـەخواردەمەنی ومیـوەی بەهەشـت لەهەرجێگەیـەئارەزوتان هەیەبـەژیانێکی فـراوان وخـۆش بـەبێ ئازاروناخۆشـی هەموونەوشتانەی کەلەبەهەشتان هی ئێوەیە ناوەرۆکی ئەورستەیە بۆمان دابـین ئـەکا کـەژن وپیاو وێنەی یەکن لەخواردن وڕابواردن وهەمووشتێکا لەجیهان ولەبەهەشـتا هـەردولایان خاوەنی دارایی تایبەتی خۆیانن بەبێ جیاوازی بەلاّم پێشەوایەتی گشتی وپێش نوێژی کردنی ژنان بۆپیاوان دروست نی یە یاسایئیسلام داوالەژنان دەکات هەموو کاتێ لەگەڵ مـێردی خۆیانا بژین دوای پیاو بکەون هەتا بەبەختیاری ودڵپاکی بەیەکەوەبژین وڕابوێـرن گومـانی خراپە بۆیەکتری‌نەبەن .

﴿ولا تقربا هذه الشجرة ﴾ وەئێوەنزیکـی ئەودرەختەنەکـەون بـێ گومـان لەودرەختـە قەدەغەیە بەفەرمانی خوا ئیتر ئەودرەختە گەنم بـێ یـا درەختـێ تربـێ مەبەستەکە نـاگۆرێ بەڵگەیـەکی ڕاسـت نـی یـە بۆدیـاریکردنی ئەودرەختـە بەڕاسـتی خـواردن لەودرەختەقەدەغەکرابولەسەرئادەم وحەوا وەئەودرەختەبوو بەنەگبەتی بۆئادەم ونەوەکانی

﴿ فتکونا من الظالمین﴾ دوای خواردن لەودرەختە ئێوە ئەبن بەسـتەم کـار، وەیـائێوەمی خۆن هەتانەبن بەستەم کار بەهەرچۆنێ بێخواردنـی ئەبێتـەهۆی دەرکردنـی ئـادەم وحـەوا لەبەهەشت .

﴿ فازلهما الشیطان عَنْها﴾ دوایی شەیتان ئادەم حەوای داماو کـرد بـەنزیك بونـەوەیان لەودرەختە وەدەری کردن لەبەهەشـت وەگومـان دودڵـی خستەدەروونیانەوەبۆخواردنی ئەودرەختە وەئەوانیش لەودرەختەیان خوارد .

﴿ فاخرجهما مما کانا فیه﴾ دوای خواردنی ئەودرەختە ، شەیتان دەری کردئادەم وحەوا لەشتێ ئەوان لەناوی دابوون لەرێزوخۆشی بەهەشت ئاواتی شەیتان ئەوە نـەبوو لەرشێزو

خۆشی بەهەشت بێبەشیان بکات بەتەنها بەڵکو مەبەستی ئەوە بووئەوانیش بێبەش بن لەمیهرەبانی خوا هەتاهەتایە وەکو خۆی ئەوپلەوریزەشیان لێ وەربگیرێتەوە بەڵام بەوئاواتەی خۆی نەگەیشت بۆیەرق وکینەی کلپەی سەند وەئادەم بەدەرکردنی بەهەشت گەورەتر بوو چونکەلەبەهەشتادراوسێی خوا بوولەزەویدا بوو بەجێگەنشینی خوا زۆرئاشکرایەجێگەنشینی گەورەترەلەدراوسێیەتی زانایان بیریان جیاوازە لەبارەیدەرکردنیشەیتان ئەوەیجێگەیبڕوابێ کاتێ شەیتان پلەوپایەی بەرزی ئادەمی بۆدەرکەوت بەهۆی ئادەمەوەدوور خرایەوەلەمیهرەبانی خوا شەیتان ئادەمی وەك دوژمنێکی گەورەیخۆی تەماشاکرد بۆیە بەشوێن هەلێکائەگەرا تۆڵەی لێ بسێنێ دەستی کرد بەپیلان دروست کردن بەهەرشێوەیەبوو خۆی گەیاندە بەهەشت دوو دڵی خستە دەروونی ئادەم وحەوا خۆی دانا بەدڵسۆزێکی دڵپاکیان ووتی ئەودرەختەبۆیەقەدەغەیەلێتان هەتا ئێوەنەبن بەفریشتە بەبەردەوامی بمێننەوە لەبەهەشتا وەسوێندی درۆی زۆری بۆخواردن ئەوانیش بڕوایان وابووکەس درۆ ناکا سوێندی درۆ ناخوا وازی لێ نەهێنان هەتا لەودرەختەیان خوارد دوای بەوبۆنەوەلەبەهەشت دەرکران وەك خوا دەفەرمووێ :

﴿وقلنا اهبطوا بعضکم لبعض عدو ﴾ وەئێمەووتمان بەئادەم وحەوا نەوەکانیان ئێوە بچنە خوارەوەبۆ لای زەوی هەنێکتان دووژمنیهەندێکتان بن ، نەوەکانیان هەرچەندە لەوکاتەدالەگەڵیان نەبوون بەڵام چونکەلەوان ئەبن لەوان پەیدائەبن بەوێنەیە بوون تەماشا بکرێن ئەوەتەدوژمنایەتی باوەڕداران وبێ باوەڕان دوژمنایەتی نەتەوەکان لەسەسەرنیشتیمان وپلەوپایەی جیهان وشتی تریش پەیدابوون وبەردەوامە هەندێ لەزانایان ئەڵێن خوای گەورە ڕووی لەئادەم و حەواو شەیتانە لەودەرکرنەدا زۆرئاشکرایە دوژمنی یەکن .

تێبینی :دەرکردنی ئادەم حوا بەسزا دانانرێ وەك دەرکردنی شەیتان چونکە بەرلەوەی لەبەهەشت دەلربکرێن پەشیمان بوونەوە وەخوا لێیان خۆش بوو بەڵام بۆ ئەوەبوو هەتا پەند وەربگرن توشی نەخۆشی ماندوو بوون وئارەق ڕشتن وبرسێتی وتینوێتی وخەفەت

وجەنگ بین لەسەرزەوی زاوزێو نەوەی زۆر بخەنەوە بەڕوی زەویدا بڵاو بنەوە زەوی ئاوەدان بکەنەوە فەرمانی خوا بپارێزن دوای کۆتایی پێ هاتنی تەمەنی دیاری کراو بمرن لەپاشەرۆژدا پاداشتی کردەوەی چاك وخراپە وەربگرن .

﴿ولکم فی الارض مستقر ومتاع الی حین ﴾ بۆئێوە هەیە لەزەویدا جێگەی دانیشتن وئارام گرتن هەتاماون لەسەرزەوی بژین ودوای مردنیشتان زەوی ئەبێ بەگۆڕتان بۆ ئێوەیش هەیە لەزویدا ڕابواردن سودلێوەرگرتن بۆ ماوەیە بخۆن و بخۆنەوە بدوێن وکاربکەن و هاوڕێ بگرن ،ئەوانەیش تا کاتی مردنتان ،دووایی بۆ گۆر ،دواتر زیندوو ئەکرێنەوە لەپاشەرۆژدا بۆپرسیاروولامی کردەوەکانتان بەڕاستی ئەم ئایەتانە هەڕەشەی زۆر ئاشکران بۆئادەمیزاد لەبارەی دەرکردنی ئادەمیزاد لەبەهەشتدا گوناە کردنی ئادەم وحوا بەهەرشێوەیە بووبێ ئاگادارکر دنی ئادەمیزادە بۆئەوەی بیربکەنەوە لەوشتانەی بەسەرئادەم وحوادا تی پەرئەبێ کەبەگوناهێکی بچووك لەبەهەشت دەرکران بۆئەوش ئێمەلەخوابترسین لەهەموو گوناهێك گەورەبن یا بچووك دووبارە خۆمان بپارێزین لەفیزو خۆبەگەورەدانان ئاواتە خواز مەبە بەوەی دارایی وسامانی جگەی تۆ نەمێنێ لەبەرئەوەیتۆ نیتەودڵ پیس مەبە بیربکەرەوەلەبەرئەورەوشتە خراپانە بۆشەیتان بێ بەش کراولەبەزیی خوا قابیلی کوڕی ئادەم هابیلی برای خۆیکوشت بەناڕەوایی لەبیریشمان بێ خوا ئاگاداری کردووین لەدوژمنایەتیگەورە لەنێوان ئادەمی باپیرمان وەئێمەولەنێوان شەیتانا هەتائێمە خۆمانی لێبپارێزین هەڵەی نالەبارمان پێ‌ئەکا .

﴿ فتلقی ادم من ربە کلمات ﴾ دوای ئەو کارەساتەی ڕابورد ئادەم چەند وشەیەکی لەپەروەردەکەرەکەی خۆیەوە وەرگرت خوا فێری کرد ئەویش فێری بوو،یەکێ لەو وشانە :ئەی پەروەردەکەرەکەی من :ئەگەر من پەشیمان ببمەوەوخۆم پاك بکەم ئایا منئەگەرێمەوەبۆلای بەهەشت ،خوای گەورە فەرمووی :بەڵێ.هەرچەندە زانایان هەریەکەیان ووشەێکیان دیاری کردوە.بەڕاستی هەموویان شایستەی ئەوەیان هەیە پێیان

بپارێتەوەلەخوا بەیەکێکیان بێ یا بەهەموویان بێ گرنك نییە،ئەوەی شایانی باس بێ ئادەم پارایەوەلەخوا ،خوالێی بورد .

﴿ فتاب علیه﴾ دووایی خوای گەورە پەشیمان بوونەوەی لێ وەرگرت ولێی خۆش بوو،وەمیهرەبانی وبەزەیی خۆی بۆگەڕانەوە.

﴿ انه هو التواب الرحیم ﴾ بەراستی پەروەردەکەری ئادەم هەر ئەوەبەزۆری پەشیمان بوونەوە وەرئەگرێ ،بەزەیی‌و میهرەبانی زۆرە بۆ بەندەکانی خۆی.

﴿قلنا اهبطوا منها جمیعا﴾ ئێمە ووتمان :ئێوە بچنە خوارەوە لە بە هەشت هەمووتان بۆ لای زەوی . خوای گەورە فەرمانی دا بە چونە خوارەوە و بە دووپات کردووەتەوەی ، بۆ ئەوەیە ئادەمیزاد چاکتر لە خوا بترسن یەکەمیان پەیوەندی بە ڕوونکردنەوەی ئەو یاسایانەوەهەیە دراوە بە فروستادەی خوا کەواتە بەڕووالەت دووپات کراوەتەوە لە ناوەرۆکدا بۆ دوو مەبەستی جیاوازن وە بۆ ئەوە بە ڕستەی دووەم ببەسترێ بە ڕستەی دووایی خۆیەوە کە ئەفەرموێ :

﴿ فإمّا یَأتِینکُمْ مِنِي هُدَی﴾ دووایی ئەگەر هات بە ڕاستی بۆلای ئێوە لە لایەن منەوە شارەزایی کردن بەهۆی نامەو نێراو من .

﴿ فمن تبع هدای فلا خوف علیهم ولاهم یحزنون ﴾ دووای ئەو شارەزایی کردنە هەرکەسێ دووای شارەزایی کردنی من کەوتبێ و کاری پێ کردبێ دووایی ترس لەسەر ئەوکەسانە نییە وە ئەو کەسانە خەفەتبار نابن و ناخۆشی نابینن و پاداشتی چاکەی خۆیان وەرئەگرن .

﴿والذین کفروا و کذبوا بآیاتنا﴾ وە کەسانیکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهیناوە بەو شارەزایی کردنانەی ئێمە لە نامەو لە نێراوی خواو بە درۆیان خستوەتەوە ئایەتە ڕوونەکانی قورئانی ئێمە ، یەکێتی ئێمە بە درۆ ئەخەنەوە .

﴿ اولئك اصحاب النار هم فيها خالدون﴾ ئەو کەسانە دانیشتوان و هاوبەشانی ئـاگری دۆزەخن بەردەوامن لە نێویدا ئیتر ئەو کەسانە ئادەمیزاد بن یا جنۆکەکان ئەو کەسـانە لـە ئاگردان بە بەردەوامی هەتا هەتایە .

بۆ ئاگاداری : خوا هەموو شتێ لە شوێنی شیاوی خۆیا دائەنێت کە ئادەم و ژنەکەی بۆ ماوەیەك لە بەهەشتا بن ، لە دووایدا خۆیان لە بە هەشت بچنە دەرەوە بە هـۆی خواردنـی ئەو درەختەوە بە سەربەستی خۆیان بـە بـێ ئـەوەی کـەس زۆریـان لێ بکـات ئەگـەر ئـەو کارەیان نەکردایە بـە رخـوردار ئـەبوون بـە ڕابواردنـی بـە هەشـت هـەتا هەتایـە بـە بـێ ماندووبوون و ئازار ، وە هەر خوا ویستی بۆ ماوەیەك ئادەم و حـەوا لـە زەویـدا بمێننـەوە زاوزێ بکەن و ماندوێتی بچێژن لە هەمان کاتیشدا پرسیار لە هەموویان بکرێ لە و کـارو گفتوگۆیانە ئەیکەن لە جیهاندا وە دووایی بگەڕینەوە بۆ لای بەهەشت بە بەردەوامی .

پ/ چ سوود و چاکەیە هەبووو لە چونی ئادەم بۆ بە هەشت لە پاشان دەرچونیـان بـۆ لای زەوی لە دووایدا دەرچونی ئادەم لە زەوی و گەڕانەوەی بۆ لای بە هەشت لـە پـاش مردنیان ؟

و/ بە زۆری ئەو سودە ئەوەیە کە ئادەم چەند قۆناغێ ببڕێ و سودی پێ بگەیەنێ خـۆی و نەوەکانی سودی لێ وەربگرن دووایی ئەو تاقی کردنەوەیـە دووایـی بگەڕینـەوە بـۆ لای زەوی بە وتاقی کردنەوە و بە سودانە بۆیان دەردەکەوێ مرۆڤ هەتا هەتایە کـە بـژی بـێ تاقی کردنەوە بە هەر جۆرێ بیەوێ بەبێ بەراورد و کێشانە نابێ بە راستی کەسێ خـاوەنی ویست ی خۆی بێ و بە سەر تێك چون نەڕوا بە گوێرەی هەوەسی خۆی و پاپەند نەبێ بـە یاساوە هەتا هەتایە لە بە ختیاری و خۆشیدا ئەژی ، وەئەو کەسەی گاڵتە بە ڕەوشی چاك و یاسای دیاری کراو بکا بە بێ نرخیان دانێ توشی ئـەو شـتە ئـەبێ ئـادەم توشـی بـوو لـە ناخۆشی و پەشیمانی ، وە گیرۆدەی ئازارو تەنگ و چەڵەمە ئـەبێ کەواتـە ئەگـەر کەسـێ گوناە و خراپەی زۆربوو پێویستە وێنەی ئادەم پەشیمان ببیتەوە لە جیهاندا بە رلە مردنی .

بۆ ئاگاداری : زانایان ئەڵێن پێغەمبەران بەر لە پێغەمبەرایەتی گوناهی گەورەو بچوکیان نەکردووە نە لە لایەن باوەڕ هێنان بە خوا و نەلە بارەی گەیاندنی فەرمانی خوا و نە لە لایەن پرسیارو وەڵامی ئایینی و کاروباری ئایینیەوە و کاروباری ئادەمیزادەوە بە گشتی .لە هەموو ڕوویەکەوە ڕاست وێژو ڕاست کردار بوون بە تایبەتی لە بارەی بنچینەی بڕوای ئاینی یەوە خراپەیان لێ نە بینراوە بۆیە جیگەی متمانەو بڕوای هەموو کەسێ بوون بە دۆست و دوژمنانیانەوە مێژووی بێ لەکەیان بووە بە تایبەتی مێژووی پێغەمبەری ئیسلام کە دۆست و دوژمنی ئەیزانن و ئەیلێن.

بۆ زانین : پێویستە ئەو کەسانە پەشیمتان ئەبنەوە لە گوناە بڕوای بێگومانیان هەبێ ئەگەر ئەو تاوانانە لەمەو بەر کردوێتی ئێستا بوایە نەی ئەکرد بڕوایشی وابێ لەمەودووایش نایکا . جا بۆ ئەوەی بزانرێ ڕاست ئەکا نوێژ و ڕۆژ و زەکات و حەجی نەکردووی لە مەوبەری بەسەر بگێریتەوە وە تۆڵەو کەفارەتی نەزرسوێنی درۆ و ڕۆژی نەگیراو و کوشتنی ئادەمیزاد ببە خشێ بە هەژاران دارایی هەرکەسی خواردووە بۆی بژێرێتەوە وە یا گەردنی خۆی پێ ئازاد بکا هەموویان بە گوێرەی توانای خۆی .

يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ وَأَوۡفُواْ بِعَهۡدِيٓ أُوفِ بِعَهۡدِكُمۡ وَإِيَّٰيَ فَٱرۡهَبُونِ ﴿٤٠﴾ وَءَامِنُواْ بِمَآ أَنزَلۡتُ مُصَدِّقٗا لِّمَا مَعَكُمۡ وَلَا تَكُونُوٓاْ أَوَّلَ كَافِرِۭ بِهِۦۖ وَلَا تَشۡتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنٗا قَلِيلٗا وَإِيَّٰيَ فَٱتَّقُونِ ﴿٤١﴾ وَلَا تَلۡبِسُواْ ٱلۡحَقَّ بِٱلۡبَٰطِلِ وَتَكۡتُمُواْ ٱلۡحَقَّ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٤٢﴾ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱرۡكَعُواْ مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴿٤٣﴾ ۞أَتَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبِرِّ وَتَنسَوۡنَ أَنفُسَكُمۡ وَأَنتُمۡ تَتۡلُونَ ٱلۡكِتَٰبَۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴿٤٤﴾ وَٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى ٱلۡخَٰشِعِينَ ﴿٤٥﴾ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمۡ وَأَنَّهُمۡ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ﴿٤٦﴾

پێش ئەوەی دەست بکەین بە ماناکردنی ئەو ئایەتانەی پێشوو باسی هەندێ لە بەسەرهاتی جولەکەکان ئەکەین وە ڕەوشت و مێژوویان بە کورتی ڕوون ئەکەینەوە : خوای گەورە لە چەندین ئایەتی قورئان دا باسی جولەکەکان ئەکا لە و ئایەتانەدا ڕوونی کردۆتەوە خوا چاکەو بە خششی زۆری پێ داون وە سوپاس و ستایشی ئەو چاکانەی خوایان نەکرد وە پێغەمبەرەکانی خۆیانیان ئەکوشت بە ناڕەوا و دوژمنایەتی و بێ فەرمانی

موسا و هارونیان ئەکرد ، وە دەستیان دایە گوێرەکە پەرشتن ، فیرعەونەکان کردبونیان بە بەندەی ڕابواردنی خۆیان ، دووایی خوا ئەوانی ڕزگار کرد لە چەوسانەوە و بەندایەتی ، ڕزگاری کردن لە خنکاندنی ئاوی دەریای سوور گەزۆو شێلاقەی لە دەشتی (تەبــها) بـۆ باراندن ، لە ئەنجامدا دەستیان دایە پیلان و خراپە کردن لە گەڵ پێغەمبەرەکانیان لە دووایشدا دوژمنایەتیان بۆ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ وموسلمانان زۆر بە تیژتر بوو ، وە ئەو کەسەی ڕێگەی ڕاستی بگرتایە دژیان ئەوەستان لەم سورەتەدا بە تایبەتی لە باسی فەرماندانی خوا بەوان بە سەر بڕینی مانگا بە چەند ڕووداوی نالەبار ی جولە کەکانمان بۆ ڕوون ئەبێتەوە .

تێبینی : بە ڕاستی لە زیندگانی و وژیان ئادەمیزاد لە جیهاندا : پاش ماوە ی ژیانیان مێژوویەکی فراوانیان هەیە : لەبارەی چۆنیەتی بەرگ و پۆشاك دروست کردنی خواردەمەنی هەمە جۆرە بۆ خۆیان ڕەنگ و نەخشەی کۆشك بۆ حەسانەوەی خۆیان دانیشتوانی ئەو کاتانە کە ئەمرن ئەو شتانە ئەبەن بە شی کۆمەڵێ تر کەدێن لە دووای ئەوان ، وە ئەمانەیش بە جۆرێ ترو چاکتر پەرە ئەدەن بە و شتانەو کەرەسەی زۆریش ساختە ئەهێنن بۆ خۆیان .. ئەوانیش ئەمرن و تاقمێ تر دێنە سەر زەوی هەروەها هەتا دێ سامان و پلەی جیهان بۆ هیچ کەسێ پایە دار نابێ پێویستە ئێمە تەمێ خواربین و بێ فەرمانی خوا نەکەین .

بۆ ئاگاداری : ئیسرائیل ناوی دووهەمی یەعقوبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمە . برازای ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمە باپیرە گەورەی پێغەمبەری ئیسلام ﴿ﷺ﴾ عەرەب و جولەکەکان هەردوولایان لە نەوەی ئیبراهیمن ، مانای ئیسرائیل لە زمانی عیبریدا بە مانا عەبدوڵایە لە زمانی عەرەبیدا ... خوای گەورە بە نەرمی و ڕێزەوە ڕوونەکاتە جولەکەکان و ئەفەرموێ ئەی کوڕانی ئیسرائیل بۆ ئەوەی هۆشێ بکەنەوە بیێتەوە بیرتان کە لەو نەوە پیرۆزەن ، وە بۆ ئەوەیش هەستیان بجۆشێ کە خوا ئەو ڕێزەی پێداون و لە نەوەی ئەو

پیاوانە کە خراپە نەکەن .. جولەکەکان ناویان ئەبرێ بە (یەهود)، چونکە هەندێکیان نەوەی یەهوزای کوڕی یەعقوبن ..

بۆ زانین : کورتە مێژوویەکی جولەکەکان ڕوون ئەکەینەوە بەم جۆرەی دووایی : وەك لە سورەتی (یوسف) دا باسی ئەکرێ یەعقوب خۆی و کوڕەکانی لە سەر داخوازی یوسفی کوڕی یەعقوب کە شالیاری دارایی فیرعەونی ئەو سەردەمەی میسر بوو لە فەلەستینەوە کۆچیان کرد بۆ میسر ، وە فیرعەون لە بەر ڕێزی یوسف بە پیتترین جێگەی میسری پێ بەخشین ماوەیەکی زۆر لەو جێگەیە مانەوە بەڵام ئەو فیرعەونانەی لە دووایدا هاتنە سەر تەخت و دەستیان کرد بە چەوسانەوەی جولەکەکان ، ئەشکەنجەو ئازاری زۆریان ئەدان بە تایبەتی لە کاتی فیرعەونی سەردەمی موسادا کوڕەکانیان سەر ئەبڕی و ژنەکانیانی ئەهێششتەوە هەتا بەرە بەرە کۆتاییان پێ بێ و ئەی کردن بە بەندەوە کارەکەری خۆیان پاش ماوەیە خوا موسای کوڕی عیمرانی کرد بە پێغەمبەر بۆیان بە هەر جۆرێ هەبوو ڕزگاری کردن لەو ماوەی ڕزگارکردنەیاندا دووڕووی و ترسنۆکی زۆریان بەرانبەر موسا بەکار ئەهێنا ، وە موسا داوای لێ کردن بگەڕێنەوە بۆ فەلەستین ، وە جەنگ بکەن لە گەڵ دانیشتوانیاندا ، وە بەڵێنی پێ دان سەر ئەکەون بەسەریانا ، وە جولەکەکان پاشە کشێیان نەکردو و بڕوایان بە خۆیان نەبوو ، وە بەموسایان ئەوت:خۆت و خوای خۆت جەنگیان لە گەڵ بکەو داگیریان بکەن ، دووای ئێمە لەو جێگەیەدا دائەنیشین، لە بەر نالەباریان و بێ فەرمانی کردنی موسا خوا پێویستی کرد لە سەریان چل ساڵ سەر دەرنەکەن بۆ هیچ جێگەیە لە دەشتی (سینادا) بێن و بڕۆن ، تانەو بیانوی زۆریان ئاڕاستەی موسا ئەکرد لە ماوەی ئەو چل ساڵە دا، موساو هارونی برای کۆچی دووواییان کرد ، هارون لەپێشەوەی موسامرد، دووای کۆچی موسا ـ یوشەعی کوڕی نون و خوشەزای موسا بویە پێغەمبەر و جێگەنشینی موسا، بەخۆیو بە ـ جولەکەکانەوە بەرەو فەلەستین ڕۆیشتن و داگیریان کرد و زۆریان لێ کوشتن و ئەوانەیان مابونەوە دەریان کردنو خۆیان

لە جێگەکانیان دانیشتن، دووای یوشەع چەند پێغەمبەرێکی تر نێرران بۆلای بەنوئیسرائیل ،داگیرکردنی فەلەستین پێش هەزارو سێ سەد ساڵ بەر لەدایك بونی عیسا لە ساڵی پێنج سەدو نەوەت و شەشی بەر لە زاینی پاشای (بابل) بەختە نەسر پەلاماری - فەلەستینی دا ، پاشایێتی جولەکەکانی کۆتای پێهێنا و زۆر کەسیانی سەربڕی،ئەو کەسانەیان مابونەوە بەدیلی بردنی و دەستی بەسەردا گرتن ، لە ماوەی فەرمان ڕەوایی بەختەنەسردا مانەوە بەچەوساوەیی هەتا ساڵی پێنج سەدو هەشتی پێش زاینی،ئەوبو پاشای فارسەکان سەرکەوت بەسەر بەختەنەسردا،جولەکەکان کەمێ پشویاندا و قاچی خۆشیان ڕاکێشاوچونەوەبۆ فەلەستین بۆ ماوەی دووسەد ساڵ لەژێر فەرمان ڕەوایی فارسەکانا بون. لەپاشا کەوتنە ژێر دەستی ڕۆمانەکان. بەلام ڕۆمانەکان لە دووای ئەوەی ئەسکەندەری گەورە دەستی گرتبو بەسەریاناو جولەکەکان بون بەژێردەستەی ئەسکەندەر، لە ماوەی فەرمان ڕەوایی ڕۆمانیەکان جولەکەکان شۆڕشێکیان بەرپاکرد لە دژیان و ڕۆمانیەکان ئەو شۆڕشەیان - کوژاندەوەو لە فەلەستین دەریان کردن ، ئەوانیش سەری خۆیان هەڵگرت، هەریەکەیان بۆ لایەك بلاو بونەوە بەسەر زەویدا، بەرۆژهەلات و بەرۆژئاوادا. بەباکورو باشورداکەمێکیان لە میسرو لوبنان و سوریەو عێراقداو لەحیجازا داگیرسانەوە، هەندێکیشیان هەر لەسەردەمی سولەیمانەوە بەهۆی بازرگانیەوە لە یەمەندا مابونەوە.

خوای گەورە ڕێزی بەنو ئیسرائیلی گرت و پێغەمبەرانی زۆریان لێی پەیدابو، وەك موساو هارون و یوشەع و داودو سولەیمان و ئەیوب و عوزەیرو زەکەریاء ویەحیاو عیساو - پێغەمبەرانی تریش ، لەبیرمانبێ مەریەمی دایکی عیسا لە نەوەی داودە، جولەکەکان باوەڕیان بە پێغەمبەرایەتی عیسانیە، بە گومانی خۆیان ئەوعیسا یە تەورات باسی ئەکا هێشتا نەهاتوە..

بۆزانین: کاتێ پێغەمبەری ئیسلام ﴿ ﷺ ﴾ کۆچی کرد لەمەکەوە بۆ مەدینە سێ تاقم - لە جولەکەکان لە مەدینەدابون: بەنی قەینا ع. بەنی قوریزە.بەنی نەضیر. جێگەی زۆریان

پێك هێنابو بۆ دروست کردنی مەی. چەندین مەڵبەندیان هەبو بۆداوێن پیسی و کاری خراپ، دەرگایان واز بو بۆ پارە وەرگرتن، پارەیان بەهەرچۆنێ دەست کەوتایە لایان گرنگ نەبو، لەوەرگای زۆریان هەبو بۆ بەخێوکردن بەراز. هەرئەوان کاری زەڕەنگەریان ئەکرد، بازرگانیان ئەکرد، بەوبۆنەوە پارەی زۆرو زێڕو زیویان پێکەوەنابو . بەسود نەبوایە کڕین و فرۆشتنیان نەئەکرد. بەکورتی دەستیان گرتبو بەسەر ئابوری شاری مەدینەدا، وەك دەستیان گرتوە بەسەر ئابوری زوربەی زۆری ڕژێمەکاندا. بەتایبەتی ئەمریکاو بەریتانیاو فەڕنساو زۆر تری کیشوەرەکانی ئەفریقا.

دووای دانیشتنی پێغەمبەر﴿ ﷺ ﴾ لە مەدینە جولەکەکان هەستیان کرد بونی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لە مەدینەدا مەترسی زۆر گەورەی هەیە بۆیان ڕاستەو خۆ، کاری گرنگ ئەکاتە سەربازرگانی و قازانج و بازاڕیان. ئەیان زانی لاوەکانی مەدینەبۆ لەمەوپاش ئاموشۆی جێگە داوێن پیسیەکان ناکەن،بۆیە دەستیان کرد بەپیلان دروست کردن بۆ پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ گیرو گرفتیان بۆ پێغەمبەر ئەخستەڕێگەیدوو ڕویان بەکار ئەهێنا. لە ژێرەوە لە گەڵ بت پەرست و دوو ڕوەکانی مەدینەبون،هاوکاریان ئەکردن لە دژی پێغەمبەرو موسڵمانان بۆ سودی تایبەتی خۆیا.

لەم سەردەمی ئێمەیشدا تاقمی کۆنە پەرستان و دوژمنانی ئیسلام بۆ سودی تایبەتی خۆیان یاریدەی یەکتری ئەدەن لە دژی موسڵمانان و لە دژی مرۆڤایەتی. بەناوی کۆمەکیەوەچەك ئەدەن بەرژێمە کرێ گرتەکانی خۆیان، لەنهێنیدا پەیمانیان پێ مۆر ئەکەن ئەو چەکانە بەکار نەیەنن لەدژی دۆستانی خۆیان، ئیتر بادوژمنی خۆشیانبن.دوژمنانی ئیسلام پارەو چەکیان ئەدەنێ ئەوانیش مرۆڤایەتیو نیشتمان و برای خۆیانیان ئەدەنێ ، بۆئەوەیش بەکاربێنن لە دژی هاوزمان و هاوئاین و هاونیشتمانی خۆیان.

کاتێ پێغەمبەر﴿ ﷺ ﴾ چوە مەدینە لەڕداوو چۆنێتی ئەو شارە ئاگاداری پەیدا کرد لەهەمو ئەو شتانە باس کران. ڕێگەو شوێنی بۆ نەهێشتنی دژایەتی پێغەمبەرو باوەڕداران

ڕەچاو کرد. لەپێشەوە ووتو وێژی بەکارهێنا لە گەڵ جولەکەکان و بەڵگەی بۆهێنانەوە، گفتوگۆی نەرمی لەگەڵ ئەکردن. یەکەم جار پەیمانی ئاشتی لە گەڵ مۆر کردن، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ سەربەستی تەواوی دانێ لە بارەی ئاین و سامان و جێگەی پەرستن و بازاڕو بازرگانی و شتی ترەوە ـ بەدڵنیایی بژین و دەست درێژی نەکرێتە سەریان. بەو مەرجەی ئەوانیش دژی ئیسلام کار نەکەن و یارمەتی پێغەمبەر ﴿ ﷺ﴾ بدەن. ئەگەر موسڵمانان تالآنیا لەبت پەرستان و بێ باوەڕان گرت جولەکەکانیش بەشداربن. بەهاو بەشی موسڵمانان بەرگری لە شاری مەدینە بکەن، ئەو شارە شاری هەموانبێ . نەك بەتەنها بۆیەکێکیانبێ . بەڵام زۆری نەبرد پەیمانەکەیان شکاند. بێگومان پەیمان ڕێگە ناگرێ لە نیازی پیسی خۆپەرستان و ستەمکاران کە دانیشتوان توشی زیان نەبن. گورگ و مەڕ ئاشتەواییان ناکرێ. کەواتە بێ سودە باسی چاکەو خۆشی خوابکەی کەبەخشیوەتی بە جولەکەکان لە قازانج و تایبەتیان کەم بکاتەوە. ترسان و ـ ئامۆژگاری کردنی ئەوان و دوژمنانی ئاین و بێباوەڕان کاریان تێ‌ناکا. ئەگەر ئەو شتانە لە قازانج و سودی تایبەتیان کەم بکاتەوە، کاتێ پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بۆی ڕون بویەوە بێ ـ هودەیە ئامۆژگاری و پەیمان، بڕیاری داو فەرمانی دەرکرد بۆ موسڵمانان بازاڕێکی تایبەتی بۆ موسڵمانان پێك بێنن، ئەوانیش بەگورجی بەدەم فەرمانی پێغەمبەرەوە ﴿ ﷺ ﴾ چون بازاڕی تایبەتیان بۆ خۆیان ساختە هێنا. کڕین و فرۆشتن لە بازاڕدا ڕواجی پەیدا سەند و پەرەی پێدرا چونکە ئەو بازاڕە تازەیە لە سەر داد پەروەری دامەزرا بو ، قازانجی بکڕو بفرۆشی مسۆگەر کردبو.

سودی گشتی ئەو بازاڕە بۆ هەموان بو بەگشتی، بۆیە دڵی جولەکەکان پڕبو لەرق و کینە بۆ پێغەمبەر دەستیان کرد بەشکاندنی پەیمان هەتا بەهەر نرخێبێ تۆڵە لەموسڵمانان بکەنەوە. خوای گەورە لەمەر دوا باسی ئەو هەمو ڕوداوانە ئەکاو ئەفەرموێ ،

﴿ یابني اسرائیل اذکروا نعمتي التي انعمت علیکم ﴾ ئەی کوڕانی ئیسرائیل: ئێوە بیری ئەو چاکانەی ئەو تۆی من بکەنەوە بەخشیومەو ڕژاندومە بەسەر ئێوەدا لە پێغەمبەرانی

زۆرو سامان و دارایی زۆر تەندروستیشتان، باپیرەكانتانم لە ستەمی فیرعەون ڕزگار كـردو فیرعون و تاقمەكەیمان خنكاندن بەئاوی زەریای سـور، لیتـان خـۆش بـوم دووای ئـەوەی گوێرەكەتان پەرست.ئێستایش موحەمـەدم ڕەوانـەی لاتـانم كـرد هـەتائێوە لەبـەر سـودی خۆتان باوەڕی پیبكەن و بیر لەچاكەكان بكەنەوەو سوپاسـم بكـەن ، بـەكردەوەو كـاری چاك هەڵسن، ئەوشتەی من داواتان لێ ئەكەم بەجێی بهێنن، بـاوەڕ بەموحومـەد بكـەن و ـ نێرراوی منه بۆلای هەمو ئادەمیزاد. گیروگرفتی مەخەنه بەردەم و یاریدەی بدەن.

﴿ وأوفوا بعهدی ﴾ وە ئێوە بەجێبێنن پەیمانی من بەباوەڕ هێنان و كردەوەی چاك ، لـە بونەوەراندا بەڵگەمی زۆرم بۆ داناون و تـەوراتم بـۆ نـادوون ئەگـەر بـەداد پەروەرانـەوەو بیلایەنی تەماشایان بكەن و تەماشای قورئان بكەن باوەڕ بەئایینی ئیسلام بهێنن، لـە تـەوراتا باسی موحەمەدتان خوێندوە تەوە، لـە دانیشـتوانی پەنـهان مـەدەن و ڕایگەیـەنن بـەوان و خۆیشتان كار بەتەورات بكەن و باوەڕیش بەقورئان بهێنن.

ئەم ئایەتە هەرچەندە ڕوی پیكراوە بۆلای جولەكـەكانی مەدینـە و ئـەو ڕێزانـە بـەوان نەدراوە بەڵكو بەباپیرە پێشـوەكانیان دراوە، زۆر ڕاستە. بـەڵام لەبـەر ئەوەیـە ئەمانـەیش لەنەوەی ئەوانن و لە سەر بیرو بۆچونـی ئـەوانن، وەك ئەوەوایـە نـاوەڕۆكی ئـەم ئایەتانـە بۆدانیشتوانی مەینەش بـێ ئـەو ڕێـزەی خـوا بەخشـیوێتی بـە باپـیرەی ئـەوان بەخشـرابێ بەمانیش.. وەئەتوانین بڵێین. هەمو ئادەمیزاد یەك نەتەوەن و ئەو پیمانە هەمومان ئەگرێتـەوە ، هەمومان پێویستە بەنیازی پاكەوەباوەڕبهێنین، وەپەیمان بۆ جولەكەكان و جگەی ئەوانیشە كەهەر كەسێ باوەڕ بەخوا بهێنێ لە پاشە ڕۆژدا پاداشتی خۆیان وەرئەگرن.

خوای گـەورە بەڕستەی ﴿ اذكـروا نعمـتي ﴾ بۆمـان ڕون ئەكاتـەوە زوربـەی زۆری ئـادەمیزاد دوای خـواردن و چاكـەو ڕابـواردن ئەكـەون لـە هـەر كەسـێكەوەبێ ، بۆیـە ئەفەرموێ بیری چاكەكردنی من بكەنەوە و باوەڕم پێبهێنن هەتا پاداشـتان بدەمـەوە ، بـەو ڕستەیە جولەكەكان ئاگادار ئەكا. بێگومان پاداشتی ئـەو كەسـانە لـە بەرئـەوەی چاكـەی

لەگەڵ کراوەباوەڕ بهێنیٚ کەم ترە لە پاداشتی ئەو کەسانە هەر لەبەر خوا باوەڕ بهێنن و بە ئومێدی چاکەی جیهان نین، بۆ ڕاستی ئەو باسە خوا ڕوئەکاتە موسڵمانان و پەیڕەوانی موحەمەد ﴿ ﷺ ﴾ ئەفەرمویٚ ﴿ فاذکرونی اذکرکم ﴾ ئێوە یادی من بکەن منیش یادی ئێوە ئەکەم ئەو ڕستەیە وامان پیشان ئەدا موسڵمانان هەر خوایان لە یادە و دارایی و سامان و خواردەمەنیان مەبەست نیە. بێگومان موسڵمانان هەر لەبەر خواو فەرمانی خوا وازیان لە نیشتمان و مناڵ و دارایی خۆیان هێناو کۆچیان کرد لە مەکەوە بۆ مەدینە و پەیمانی خوایان دابین کرد.

ئەگەر دارایی‌و سامانیشیان ببوایە لە ڕێگەی خودادا بلاّویان ئەکردەوە، خۆیشیان ئەکرد بەفیدا کاری فەرمانی خواو چەسپاندنی یاسای قورئان. کەواتە پاداشتی موسڵمانان مەگەر هەر خوا بیزانیٚ. خوا ئاگای لەدڵی هەردوولایان هەیە، هەریەکەیان بەگوێرەی نیازی خۆیان ڕویان تی‌ئەکا.

﴿ اوف بعهدکم ﴾ من بەجی‌ئەهێنم پاداشتی پەیمانەکانی ئێوە. باری گرانـاتن لە سەر هەڵئەگرم و شیرینترین پاداشتان ئەدەمیٚ، ئەتان خەمە بەهەشت. لێتان ئەبورم. سامان و دارایتان ئەپارێزم. بە ئاشکرا کردنی و چەسپاندنی باسی موحەمەد لە تەوراتاو لە ئینجیلا گەرەترین پاداشتان ئەدەمەوە.

﴿ وایای فارهبون ﴾ وەهەر لەمن بترسن لە هەمو شتیٚ ئەیکەن و لە هەموشتێکا نایکەن. وەسزای من زۆر پترە بۆ ئەو کەسانە پەیمانی خۆیان ئەشکێنن. ناوەڕۆکی تەورات مەفرۆشن بە ڕابواردنی جیهان، بترسن برێژم بە سەرتانا ئەو ئازارانەی ڕژاندم بەسەر باپیرەکانتانا، لە جگەی خوا کەسیٚ شایستەی ئەوەنیە ئێوە لێی‌بترسن ئەم ڕستەیە ڕوئەکاتە جولەکەکان، بەتایبەتی زاناکانیان.

﴿ وامنوا بما انزلت مصدقا لما معکم ﴾ وە ئێوە باوەڕ بهێنن بە شتیٚ من ناردومەە خوارەوە وە باوەڕ کەرو مۆر کەرە بۆشتیٚ لە گەڵ ئێوەدایە کەتەوراتە، قورئان و تەورات

وەك یەکوان لەتەنهایی خوداو فەرمان دان بە پەرستنی خواو بلاوکردنەوەی داد پەروەری بە نێو دانیشتوانا. باسی شێوازی موحەمەد لە نێو تەوراتا هەیە. کەواتە وەك باوەڕتان بەتەورات هەیە باوەڕتان بەقورئان و موحەمەد هەبێ. عیساو ناوەڕۆکی ئینجیل بە درۆ مەخەنەوە. سەرچاوەی هەمو نامەکان یەکەو ئاین هەریەك ئاینە کە خوا ناردویتی بۆسەر موحەمەدو موساو عیسا.

﴿ ولاتکونوا اول کافربه ﴾ وە ئێوەی بەنەوئیسرائیل مەبن بەیەکەمین بێباوەڕ بەقورئان، ئەبوایە ئێوە یەکەمین تاقم بونایە باوەڕتان بەقورئان بهێنایە، ئێوە خۆتان مژدەتان ئەدا بەهاتنی موحەمەد، ئێوە موحەمەد وەك کوڕی خۆتان ئەناسن و تەورات بۆتانی ڕون کردوەتەوە بۆ لەبیری خۆتانی ئەبەنەوە لە مەو پێش بەبت پەرستانتان ئەووت: پێغەمبەری دووا کاتی جیهان خوا ئەی‌نێرێ‌و ئێمە پەیرەوی ئەکەین و زاڵ ئەبین بەسەرتانا، لە کیسی خۆتانی مەدەن ئەو کەسەی ئێوە چاوەڕوانتان ئەکرد موحەمەدە.

﴿ ولاتشتروا بآیاتي ثمنا قلیلا وایاي فاتقون ﴾ وە ئێوە مەکڕن ئایەتەکانی من بەنرخێکی کەم، مەگۆڕن باوەڕهێنان بەبێ باوەڕی، باوەڕتان بەهەندێکیان هەبێ و باوەڕتان بەهەندێ تریان نەهێنن بە ئاشکرا بەهۆی دیاری بۆ هێنانتان، هیچ شتێ بەرانبەری باوەڕهێنان نیە، بە ئومێدی سەرۆکایەتی‌و پلەی جیهان فەرمانەکانی من پەنهان مەدەن لە دانیشتوان. جگەی ئەویش بە وەرگرتنی دیاری دژی فەرمودەکانی خوا هەڵئەسان هەمو ساڵێ وەك سەرانە مالومەکانتان ئەندازەیێکی دیاری کراویان ئەسەند لە جولەکەکان لە بەرهەمی کشتو کاڵ و ئاژەڵ بەشیان ئەدرا . هەر لەمن بترسن و خراپە مەکەن و دەست کاری نامەی من مەکەن ، ئەم هەلە لەکیس خۆتان مەدەن ، باوەڕ بەموحەمەد بهێنن، لە کاتی فەرمان دان بۆ نەهێشتنی ستەم لایەنی دەستەلات داران مەگرن و داد پەروەربن.

تێبینی: ئەو ئایەتە پیرۆزانە هەرچەندە لە بارەی بەنوئیسرائیلیەکانەوە هاتوەتە خوارەوە و بەلام هەمو ئادەمیزاد ئەگرێتەوە بەبێ جیاوازی، خوای گەرە بەرتیل و سەرانەو گۆڕانی ـ

یاسای ئاین و کارنەکردن بە یاساو فێر نەکردنی ئادەمیزاد پێویستیەکانی ئاین بە وەرگرتنی دیاری و پارەو پول خودا قەدەغەی کردون.. لەم سردەمەی ئێمەدا شاگردی جولە کەکان زۆرن لە هەمو کات و جێگەیەکدا، بە هەزاران ڕنگ خۆیان ئەگۆڕن بۆ دوست برینی دانیشتوان بەبێ ماندو بون و ئارەق ڕژاندن پارەو سامان و کۆشك و شتی تری نایاب بۆخۆیان ئەسازێنن هەندێکیان بەچاك کردنەوەی تەلاق ، هەندێکی تریان بەنوشتە نوسین و دانە گرتنەوەو ناو ـ دەست خوێندنەوە ، تاقمێ تریان ئەڵێن: ئێمە پیاو خواین ، ئەو کەسانەو زۆر کەسانی تر خاوەنی پیشەی دەس برین و تەڵەکە بازین، پەیوەندیان بەئیسلامەوەنیە، هەندێ تریان بەهاوردنی گیانی (جلب الارواح) و خەواندنی منالان و سادەئەقلان.

بۆزانین: زانایانی ئاینیو پێشەوا گەورەکان وێنەی شافیعیو ئەحمەدو ئەبو سەور و گەلێکی تریان لایان دروستە کرێ وەرگرتن لەسەر فێرکردنی قورئان و پێش نوێژی چونکە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەفەرموێ:﴿ إن أحق ماأخذتم عليه أجرا كتاب الله ﴾ بوخاری ئەو ـ فەرمودەیە نوسیوە ، بەڕاستی شایستەتر شتێ ئێوەکرێی لەسەروەرگرن نامەی خوایە.. کار بەدەستان پێویستە لە سەریان چەند کەسێ دیاری بکەن بۆ جێ بەجێ کردنی کێشەی دانیشتوان و پیش نوێژی کردنی موسڵمنان، کاربەدەستان نەیکەن گوناهبارن.. موسڵمانان خۆیشیان دیاریان بکەن بۆ ئەو کارانە بە موچەیێکی دیاری کراو بۆیان.بۆنمونە کاتێ پێغەمبە﴿ ﷺ﴾ کۆچی دوایی کرد موسڵمانان ئەبوبەکریان کرد بەجێگەنشینی پێغەمبەرو موچەیان بۆدیاری نەکردبو. کەلو پەلی بازرگانی خۆی هەڵگرت و بەرەو بازاڕ کەوتەڕێ، پێیان ووت، بۆچ جێگەیە ئەڕۆی، ئەبوبەکر ووتی: ئەی بەچ شتێ خۆم و خێزانەکانم بژێنم؟ هاورێکانی پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ ئەبوبەکریان گێڕایەوەو موچەیان بۆدیاری کرد، ئەگەر کەسێ دارایی داربو، کەسی تر جگەی ئەو پەیدا نەئەبو دانیشتوان فێری قورئان بکا

پێویستە لەسەری بە خۆڕایی قورئانیان فێربکا. ئەگەر دارایی وایەنەبو پێی بــژی - پێویستە موچەی بۆ دیاری بکرێ بۆ مەبەستی فێرکردن قورئان و پێویستی تری ئاینی.

خــاوەنی تەفسیری قورتوبــی لــە مانــا کردنــی ئەوئایەتانــەدا ئــەڵێ: پێغەمبــەر﴿ ﷺ ﴾ ئەفەرموێ:چاکترین ئادەمیزادو چاکترین کەسێ بڕوا بەسەر زەویدا ئەو کەسانەن مامۆستای فێر کردنی قورئانن، هــەمو کــاتێ ئــەو کەســانە قورئــان تــازە ئەکەنــەوە بــەو فێرکردنــە ، لەخۆتانەوە دیاریان بۆببەن نەك بەناوی کرێوە، ئازاریان مەدەن و دڵیان مەڕنجێنن، مامۆستا کەمناڵێ فێری قورئان بکا وبڵێ ﴿ بسم اللـه الرحمن الرحیم ﴾ مناڵەکە بڵێ ﴿ بسم اللـه الرحمن الرحیم ﴾ خوا بەمیهرەبانی خۆی ئەفەرموێ:ئەو مناڵەو مامۆستاو باوك و دایکم لە ئاگر ئازاد کردن.

بۆئاگاداری: خوای گەورە بەڕستەی ﴿ وایای فارهبون ﴾ ڕووەکاتە هەموبەنوئیسرائیلی بەگشتی. وەبەڕستەی ﴿ وایای فاتقون ﴾ لەگەڵ مالومەکانێتی بەتایبەتی.

﴿ ولاتلبسوا الحق بالبــاطل ﴾ وەئێــوەی بەنوئیســرائیلی ئــەو ڕاستیەی ئــەو تــۆ مــن ناردومەتەخوارەوە لە تەوراتا تێکەڵاوی مەکەن بەو شتەپوچانەی خۆتان هەڵی ئەبەستن، لــە بەرچ شتێکە باوەڕ بەهەندێ لەئایەتەکانی قورئان ئەکەن و بــاوەڕ بەهــەندێ تریــان ناکــەن کەباسی موحەمەد ئــەکا؟ بەڕاستی جولەکــەکان هــەر لــەکاتی پێغەمبــەرەوە ســەرچاوەی دووبەرەکی بوون لە نێوان موسڵمانانـدا بەتایبەتیو لەنێوان ئادەمیزادا بەگشتی.

﴿ ولاتکتموا الحق وانتم تعلمون ﴾ وەئێوەمەشارنەوە ڕاستی لە نەخوێنەواران لــە باســی موحەمەد.ئێوە ئەزانن ڕاستی تێکەڵاوی ناڕاستی و پوچ ئەکەنو ڕاستی ئەشارنەوە.

تێبینی: بۆ دابین کردنی ڕاستی ناوەڕۆکی ئەو سێ ئایەتانەی پێشو کەگومانیان تێــدا نیــە هەندێ لەو باسانە نوسراون لە نامەو ئامۆژگاری پێغەمبــەرە پێشــوەکان کــەموژدەیان داوە بەهاتنی پێغەمبەری ئیسلام ﴿ ﷺ ﴾ ڕوون ئەکەینەوە بەوەرگێڕانی دەقەکانیان:

١ـ لـە فەسلّی یەکـەم لەسفری یەکـەمی بەشێکی تـەوراتاهاتوە: خـاتون هاجـەری کارەکەری ـ (سارای) ژنی ئیبراهیم لە خـاتو سـارا ڕنجـاو ویستی بتۆریٚ ، لـە ڕێگـەدا فریشتەیٚکی بینی بەهاجەری ووت: بۆچ شوێنیٚئەڕۆیٚ؟ ووتی: لە خـاتون سـارای گـەرەی خۆم هەلّدێم،فریشتەکە بەهاجەری ووت: بگەڕێرەوە سەری بچوکی بۆ دانەوێنە،خوا منالّی زۆرت پیٚ ئەبەخشیٚ لە پاداشتی ترسانت لـە خـواو پاڕانـەوەت لـە خـوا، ئێستا ئاوسـی بەمنالّێکەوە ناوی بنیٚ (ئسماعیل) ئەو کوڕە چاوی ئادەمیزادە،تواناو دەستی بەسـەر هـەمو سێکەوەیە دەستی هەموان بەرپێزدا ڕێـووە و بـۆلای ئـەو کـوڕە بـەرز ئەبێتـەوە، هـەمویان چاوەڕوانی ئەون. ئەو کوڕە سوپاس کەری خوایە. بێگومان پێغەمبەر لە نەوەی ئیسماعیلـە، وە نەکانی تری ئیسماعیل جگەی پێغەمبەر﴿ ﷺ ﴾ نەبوون بەچاو لیٚکراوی هەموان بۆیـان جوت نەبوە ـ ببنەپێشەوای دانیشتوان جیهان و نـەیان توانـی لـە بیبـان دەرچـن و بگەنـە سنوری عێراق و شام بەبیٚ ترس. بەلاّم کاتیٚ پێغەمبـەر ﴿ ﷺ ﴾ خـوا کـردی بـەنێرراوی خۆی نەوەکانی ئیسماعیل و هاوڕێکانی پێغەمبەر﴿ ﷺ ﴾ خۆر هــەلاّ ت و خـۆر ئاوایـان بەزۆری داگیرکرد ، تێکــەلاّوی زۆربـەی زۆری دانیشـتوان بـون. ئـەوانیش بەهاوبەشـی نەوەکانی ئیسماعیل خانەی خوایان بەپەرستن ئاوەدان کردەوە.

٢ـ لە فەسلّی (١١) یازدە لە سفری پێنجەم لە تـەوراتا هـاتوە: پەروەردەکـەری ئێـوە کەخوایە ئەنێریٚ بۆلاتان کەسیٚ لە خۆتـان و لـە نێـو براکانتانـا وێنـەی مـن. لـە هـەمان فەسلّداخوابە موسای فەرموە: من ئەنێرم بۆتان وێنەی تۆ لــە نێـو براکانتانـا، هـەر کەسـیٚ فەرمانەکانی ئەو پیاوەی پیٚ بگاو نەی بیسیٚو باوەڕی پیٚ نەهێنیٚ تۆڵەی لیٚ ئەسێنم... وەئـەم فەرمودەیەئەوە ئەگەیەنیٚ ئەو پیاوە لەنەوەی ئسرائیل نیە کـەباپیری جولـەکەکانـە ئیسـرائیل جگەلە (عیص) برای کەی نـەبوە، وە(عیـص) لـە نـەوەی ئـەو هیـچ پێغەمبـەری جگـەی (ئەیوب) ئەیوب پێش موسا کراوە بەپێغەمبەر، تەوراتیش بۆ موسا هاتوە. کەواتە ئەو پیـاوە

مژدەی پێدراوە لە نەوەی برای (ئیسحاق) کوڕی ئیبراهیمە کە ئیسماعیلە، موحەممەدیش لە نوەی ئیسماعیلە .

٣ـ لە فەسلّی بیست هەم لەسفری پێنج هەم لە تەوراتا هاتوە: ڕوناکی خوا هات لە توری سیناوە وەدەرکەوت لە کێوەکانی (فارانەوە) پیاو چاکان لەلای ڕاستی ئەو کێوانەوە ڕزیان بەست.خوای گەورە بەوانی بەخشی گەورەی و خۆشەویستی کردن لە لای گەلان، هەمو گەلان پیت و فەڕ لەو پیاو چاکانە وەرئەگرن ... ڕون ترین بەلّگە لەسەر ئەو مژدەیە ئەمەیە: (فاران) بریتیە لە حیجاز، لەتەوراتا نوسراوە کەئیماعیل لە چۆلّەکانی (فاراندا) فێری تیرە نازی ئەبێ، ئەو گەرەیەش بۆ ئیسماعیل پێك نەهات و پیاو چاکانیش لە کاتی ئەو دا نەبوون. کەواتە بێگومان ئەو شناسنامەو پێشەییە هەر بۆ موحەمەدە﴿ ﷺ ﴾

٤ـ لەنامەی (ئەشعیا)دا لە فەسلّی بیست و دووهەمدا هاتوە: ئەی مەکە ڕاپەڕەو هەلّکە چرای ڕاستی، بەڕاستی نزیکە کاتەکانت، ڕێزی خوای گەورە هەلّهات بەسەرتا. بەڕاستی ـ تاریکی ڕوی زەمینی داپۆشیوە، تەم و مژ داوێتی بەسەر هەمو گەل و نەتەوەکاندا پەروەردەکەری بونەوەران ڕوناکی ئەدا بەسەر زەویدا، هەمو گەلان ئەچن بۆلای ئەو ڕوناکیە، پاشاکان بەرەو گزنگی ئەو ڕوناکیە ئەچن. ئەی مەکە چاوت بکەرەوە تەماشابکە و بیر لەخۆت بکەرەوە، هەمو گەلان لەلای تۆدا کۆئەبنەوە و نەوافت ئەکەن و بەدەورتا ئەسوڕێنەوە.

٥ـ لە سفری یەکەم لە تەوراتا خوا ئیبراهیمی ئاگادارکردو فەرموی: داواکاریەکەتم لەبارەی ئیسماعیلەوە وەرگرت و پیرۆزیو گەورەیی و نرخم پێبەخشی، وەئەوم بۆ نەتەوەیکی گەورە دروست کردوە. زۆر ئاشکرایە ئیبراهیم نەخۆی و نەکوڕکانی نەتەوەی گەورەیان نەبوەلە جگەی پێغەمبەر﴿ ﷺ ﴾.. خوا لەقورئاندا ئەفەرموێ: دووای دروست کردنی کەعبە. ئیبراهیم و ئیسماعیل لە خودا پاڕانەوە کەلە نەوەی ئەوان پێغەمبەرێ بنێرێ، جگە لەپێغەمەرو فردستادەیە نەنێرراوە،بۆیەش پێغەمبەر ئەفەرموێ:من داواکراوی

ئیبراهیم و ئیسماعیلی باوکەکانی خۆم و موژدەپێ دراوی عیسام.موسا فەرمویتی: جێگەی لەدایك بونی ئەو پێغەمبەر لە مەکەیە، وەلە(طیبە)دا ئەنیشێ،وە دەستەلاتی لە شامە.

٦ـ عیسا ئەفەرموێ بە قوتابیەکانی خۆی: من ئەڕۆم و (مارة لیط) دێت وئاسایشی خوایە، لە خۆیەوە هیچ شتێ نالێ. هەر شتێکی پێ بلێن ئەو شتە ئەلێ.. قورئانیش لەو بارەوە ئەفەموێ:﴿ إن أتبع إلا مایوحی إلی ﴾ من دوای هیچ شتێ ناکەوم مەگەر شتێ بەسروش بێ بۆلای من .. مانای (مارة لیط) یانێ ئەو کەسە ئەپاڕێتەوە بۆ ئادەمیزادوپاڕانەوەکەیشی لێ وەرئەگیرێ، ڕاست و چەوت جوێی ئەکاتەوە.

٧ـ بەختەنەسر خەوێکی دیبو، بۆ کەسی نەگێڕابوەوە ، داوای لە دانیال کرد مانای بۆبکا بەبێ‌ئەوەی بۆی بگێڕێتەوە، دانیال فەرموی: خەوەکەت زۆر سامناکە: لە خەوتا بتێکت دیوە سەری لەزێڕی پوختە، قۆلی لە زیو لاقەکانی و سکی لە پۆلا، لە ئەژنۆکانی بەرەو خوار لەئاسن و هەندێ گڵی سورۆکراوە، بەردێکت بینی بچڕابو لە جێگەیە، ئەو کەسەی بچراندبوی نەت ئەبینی، پیاوێ ئەو بەردەی ئەکێشا بەو بتەدا زۆر بەتوندی ، بتەکە بەئاسن و پۆلا و زێڕو زیو پارچە چاچەبو. بایێ لێی هەلکرد پاشماوەی نەهێشت و پرش و بلاوی کردەوە بوبە تۆزو چو بەئاسماندا. ئەو بەردە کەدیبوت ئەو پیاوە ئەیدا بەو بتەدا بو بەکێوێکی بەرز هەمو زەوی پڕ کرد ئەمە ئەو خەوەیە ئەی پاشا کەتۆ دیبوت.

مانای خەوەکەت ئەمەیە: سەر زێڕینەکەی ئەوبتە تۆی، دووای تۆ پاشایێ تر پەیدا ئەبێ. دووای ئەویش پاشایی تری سێیەم دێت وێنەی پۆلایە زوربەی زەوی داگیر ئەکا. پاشایی تری چوارەم دێت هێزی وەکو ئاسنە. دووای ئەوانە پاشایی تری پێنجەم دێت توانای وەکو گڵی ڕەقە هەرێمەکەی ئەبێ بەدووپارچە پارچەیەکیان بەهێزو ئەو نیوەی کەی ژێردەستەو لاوازە. دووا بەدوای ئەوانە خوای ئاسمان وولاتێکی هەتاهەتای و نەگۆڕاو بەردەوام پێك دێنێ.هەمو وولاتان و هێزیان بنەبڕ ئەکا، تواناو دەستەلاتی ئەو هەموە پاشایانە نایەلێ هەتا دوارۆژیش پایەدار ئەبێ. ئەو بەردەیە کەئاسن و پۆلاو گڵی ڕقی ئەکوتایەوەو خوائەیزانێ

بریتیە لە پێغەمبەری دووا ڕۆژ.ز ئەوانە هەندێکە لەوانە موژدەیــان داوە بــەهاتنی پێغەمبــەر زۆریان لـە تەوراتا نوسراوە.

دووای ئەوانە ڕابوردن دەربارەی موژدەدان بەهاتنی پێغەمبەری دوارۆژلەو کۆکراوانەی تەوراتا ئەمەیان نیشان ئەدا کە لەتەوراتی ئەم ڕۆدا ئەو باسانەی موژدەی هاتنی پێغەمــەریان تێدا بوە کوژاندویانەتەوە، هیچ کۆکراوەیەکــی ئاسمانیــان دەســت ناکــەوێ دەســتی تێـك. دەرانی بۆ درێژ نەکرابێ جگە لە ئینجیلی (برنابا) کەئــەویش نهێنیەکـە پەنـهان دراوە لای مەسیحیەکان دکتۆر خەلیل بێـگ سـوعادە ئـەو وینجیلـی (برنابـا)یـەی لــە ئینگلیزیـەوە وەرگێڕاوە، زانای بەناو بانگ (ڕەشید ڕەزا) لە گۆڤاری(المنار)بلاوی کردوەتــەوە ئــەمیش دەقی ئەو بلاو کراوەیە،

١ـ لە فەسلی (٧٢)حەفتاودودا: یەسوع ئەفەروێ: دڵتــان لێنــداو مەترســن مــن ئــەو کەسەنیم ئێوەم دروست کردبێ ، ئەو کەسە ئێوەی دروست کردووە ئەتان پارێزێ . بەلام لەبارەی منەوە من هاتووم بۆ ئەوە ڕێگە خۆش بکەم بۆئەو فروســتادەی خوایــە لەمــەو دوا دێت، هەمو بونەوەران ڕزگار ئەکا. بەلام بترسن نەوەك درۆو ـ دەلەسەی لەگــەڵ بکــەن. چونکە لەمەو دووا چەند کەســێکەی زۆری درۆزن و بــەناو پێغەمبــەر دێــن ، وانــەی مــن وەرئەگێڕن و ئینجیلەکەم پیس ئەکەن بەدەست هەڵبەستی خۆیان، لەوکاتەدا (ئــەندراوس) یەکێ لە قوتابیەکانی عیسا وتی: نیشانەی ئەو فروستادەیەم بۆ بڵێ هەتا بیان ناسین، یەسوع وولامی دایەوە: لەم کاتەی ئێوەدانایە. بەڵکو دوای ئێوە بەچەند ســاڵێ دێــت، ئــەو کاتــە ئینجیلەکەی من نەماوە، وەنزیکەی (٣٠)سی کەس لە بــاوەڕداران بــە خــوا لــەو کاتــە دەست ناکەوێ، بۆیە خوا بەمیهرەبانی خۆی فروســتادەیەکی وانــەنێرێ پارچــە هــەورێکی سپی بەسەرێوەیەوە وەستاوە، یەکێ لەپیاو چاکانی خوا ئەی ناسێ وەدەری ئــەخا بــۆ هــەمو بونەوەران، بەهێزێکی گــەورەوە پــەلاماری خراپــەکێلان ئــەدا، پەرســتی بتــان لــە ڕیشــە دەرئەهێنێ، من بــەو کــارە زۆر دڵ خــۆش ئــەبم، چونکــە بــەهۆی ئــەوەوە خــوا پەرســتی

دەرئەکەوێ ڕاستی مین دەرئەکەوێ ، تولـە لەوانـە ئەستێنێ گۆیا مـن ـ گـەورەترینی ئادەمیزادم من ڕاستیەکەی بەئێوە ئەڵێم: مانگ واتە(خوا بەهۆی فێنکی هەوای مانگەوە) پێی ئەبەخشێ خەوێکی خۆش لە منالیدا کاتێ گەورەبویا هەمو بونـەوەران بترسین نـەوەك وازی لێ بهێنن و دووای نەکەون، چونکە دەماری بت پەرستان دەردێنێ. بـەندەی خـوا موسا پێغەمبەر زۆری لەو بتە پەرستانە کوشت، یەسوعیش بـە ئامۆژگاری زۆری لـەناو بردن

کەواتە ئەو برینە ڕیشەی داکوتاوە بەسـەر ئـەو شـارانەدا بـت پەرستان سوتاندویانەو مناڵەکانیان کوشتوون نامێنن و بن بڕ ئەبن ، وەئەبێ داخی کـەین و لـەناوی بـەرین ئـەو فروستادەیە باسکرا لەمەو پاش دێت بەڕون ترین و گەشاوەتر لە هەمو پێغەمبەران بـەهۆی ئەوانە ئەکوتێتەوە ڕەوشتی چاکەیان نیە، زیندو ئەکاتـەوە بەخۆشیەوە بورجـەکانی شاری پاوبرمان یەك بەیەك هەر کاتێ بینرا بتەکان سەرەو خواربونـەوە بۆلای زەوی، میسۆگەر کراو دەرکەوت کەمن بەندەی خوام وەك ئێوە نەك (پەرستراو). ڕاستیان پێ ئـەڵێم: ئـەو کاتەئەو فروستادەیەدێت بەڕاستی و بەبێ گومان ئـەو بتانـە لەشەوی لـەدایك بونـی ئـەو پێغەمبەرەوە سەرەو خوار ئەبن

٢ـ لە فەسلی (٨٢) هەشتاو دوودا هـاتوە: لەپاشان یەسوع ڕوی وەرگـێرا بـەلای ژنێکی سامیریدا ئە فەرمێ: ئەی ژن: ئێوەی سامیری کورنوش بۆ شتێ ئەبەن نایناسن، بەڵام ئێمەی عیبری کورنوش بۆ کەسێ ئەبەین ئـەی ناسـین ،مـن ڕاسـتی بـەئێوە ئـەڵێم : خـوا میهرەبان و ڕاستە پێویستە کورنوشی بۆ ببرێ بە گیان و بەڕاستیەوە، چونکە پەیمانی خوا لـە (ئۆرشەلیمە)وەرـ گێراوە لای پەیکەری سولەیمان نـەك لـە جێگەیـە تـرا، بـروام پێـکـەن بەڕاستی کاتێك دێت خوا میهرەبانی خۆی ئەبەخشێ بەبونەوەران لە شارێ تردا کورنوش و پەرستن جێگەی خۆی ئەگرێتەوە لـە هـەمـوو شـوێناندا بەڕاستی خـوا وەرئـەگرێ لـە ئادەمیزاد نوێژی ڕاستەقینە لە هەموـ جێگەیەدا بەمیهرەبانی خۆی. ژنەکە وەڵامـی دایـەوە

ئێمە چاوەڕوانی (مەسیا) ئەکەین چ کاتێ دێت فێرمان بکا، یەسوع وەڵامی دایەوە ئەی ژن: ئایا نازنی مەسیا ئەبێ هەر بێت؟. ژنەوەڵامی دایەوە: بەڵێ ئەی گەورەم ، لە کاتەدات یەسوع دڵخۆشبوو فەرموی: بۆم دەرکەوت ئەی ژن: بەڕاستی تۆ بڕواداری. بزانە لە کاتی بڕوا هێنان بەمەسیا هەمو هەڵبژێراوەکانی خوا ڕزگار ئەکا لەمەوو دوا. کەواتە پێویستە(مەسیا)بناسین ژنە ووتی: لە وانەیە تۆمەسیابی ئەی گەورەم؟ یەسوع وولامی دایەوە: بەڕاستی من نێراوم بۆ خانەدانی ئیسرائیل بە پێغەمبەرێکی ڕزگار کەر بۆیان. بەلاَم دوای من مەسیا دێت نێراوە لەلایەن خواوۆ بۆ هەمو بونەوەران، ئەو کەسەیە لەبەر ئەوخوا هەمو بونەوەران دروست کردوە، لە وکاتەدا پەرستن و کوڕنوش هەربۆخوا ئەبرێ لە نێو هەمو بونەوەراندا ، میهرەبانی خوا پەخش ئەبێ بە نێوانیانا.

٣ـ لە فەسڵی (٩٦) نەوەدو شەستدا ئەفەلرموێ: کاتێ نوێژ تەواو بو (کاهن)یانێ ئەو کەسەی دەم لەوە ئەدەن گۆیا ئەزانن پاشەڕۆژ چ شتێ پەیدا ئەبێ ووتی بەدەنگی بەرز، یەسوع ڕاوەستە پێویستە لەسەرمان بتناسین، تۆ چ کەسێکی لەبەردڵنیایی نەتەوەکەمان ، یەسوع فەموی : من یەسوعی کوڕی مەریەمم لە نەوەی داودم، ئادەمیزادێکی مردوو لە خوا ترسم ، داوا ئەکەم جگە لەخوا ڕێزو گەرەیی بۆکەس ڕەوانەبێ.. کاهن وەڵامی دایەوە: زۆر ڕاستە لە کۆکراوەکانی موسایشدا نوسراوە بەڕاستی خوا لەمەورا مەسیا ئەنێرێ، ئەو کەسەیش ئاگاداری ئەوانەمان ئەکا خوا ئەو کەسەی ئەیەوێ ، دێت بۆلای بونەوەران بەمیهرەبانی خواوە. هیوامان وایە ئەوەی ڕاستە پێمان ئەفەرموێ ، ئایا تۆ ئەو مەسیایەی چاوەڕوان ئەکرێ. یەسوع فەرموی، ڕاستە خوا بەڵێنی داوە. بەلاَم من مەسیا نیم چونکە ئەو بەر لە من دروست بوە و دووای من دێت. هەروەها یەسوع لە سەر فەرمودەکانی ڕۆیشت هەتا فەرموی: سوێندم بەمانەوەو ژیانی بێکۆتایی ئەو کەسەی من لە بەردەمیا ـ ڕاوەستاوم: من ئەو مەسیایەنیم ئێوە چاوەڕووانی ئەکەن هەموتابنەکانتان ، چونکە خوا بەڵێنی داوە بە ئیبراهیمی باوکمان و فەرموێتی: بەنەوەکانت بڵێ: لە هەمو

تابنەکانی سەرزەوی بەنەوێکی تۆ هەمویان پیرۆزئەکەم . بەلاّم کاتێ خوا منی بردەوە بۆلای خۆی، شەیتان بۆ جارێتر گێرەشێوێنیەکەی بلاّو ئەکاتەوە بەجۆرێ ئەوانە لە خوا ناترسن باریان گران ئەکا بەوەی کە گۆیا من خوام و کوڕی خوام. بەو بۆنەو کۆکراوەکەی من و ئامۆژگاریەکەم پیس ئەکەن بە هەڵبەستی خۆیان ، هەتا وای لێدێ نزیکەی (٣٠)سی کەس لە باوەڕداران دەست ناکەوێ. لە کاتەنا لەبارەدا خوا میهرەبانی ئەکا لەگەڵ بونەوەران ، ئەنێرێ بۆیان فروستادەی خۆی ، ئەو فروستادەیە کە هەمو شتێکی لە بەر ئەو دروست کردوە، لە باشورەوە سەر هەڵئەدا بەهێزێکی فراوانەوە، بت پەرستان لە ناو ئەبا، دەستەلاّتی شەیتان لەسەر ئادەمیزاد هەڵئەوەرێنێ،بەمیهرەبانیەوە دێت بۆ ڕزگارکردنی هەمو باوەڕداران، ئەو کەسانە نەبڕوا بەکۆکراوەی ئەو فروستادەیە ئەکەن ئەکەن زۆر پیرۆزن .

٤ـ لەفەسلّی (٩٧) نەوەدو حەوتدا یەسوع لەسەر ووتەکانی ڕۆیشت هەتا فەرموی: بەلاّم سەرخۆشی دانەوەو خۆیشم لەوەدایە بەهاتنی ئەو فروستادەیە هەمو بیرو باوەڕێکی درۆ ـ زنەکان دەربارەی من لەناو ئەچێ(کە بەدرۆی ئەوان من خوام)، ئاینە پیرۆزەکەی بلاّو ئەبێتەوە، هەمو بونەوەران ئەگەڕێنەوە بۆلای ئاینی پاك، هەر بەوجۆرەش ئیبراهیمی باوکمان بەڵێنی داوە، پیرۆزتر لە هەمو شتێ دڵخۆشی من بداتەوە کۆتایی هاتن بۆ ئاینەکەی نیەو بەردەوامە هەتاڕۆژی دوایی، چونکە خوا بەدروستی و بەپاکی ئەو ئاینە ئەپارێزێ .

دووای چەند دێڕێ لە و فەسلّەی پێشەوەی ئینجیلی(برنابا) ، کاهینەکە ووتی: مەسیابە چە ناوێ ناوئەبرێ ، ئەو نیشانەیە چیەهاتنی دیاری بکا؟،یەسوع وەلاّمی دایەوە فەرموی: ناوی مەسیا سەر سوڕینەرە!!، چونکە لەو کاتەدا دروستی کردووەو دایناوە لەڕوناکی ئاسماندا، خوا پێی فەرمو: هێدی و لە سەر خۆبە ئەی (موحەمەد) لە بەر تۆ ئەمەوێ بەهەشت دروست بکەم، کۆمەڵێکی زۆر لە بونەوەرانت پێ ئەبەخشم، پێم بەخشیوی، بەجۆرێ هەرکەسێ پیرۆزابایت لێ بکا پیرۆز ئەبێ بەڕوناکی خوا،ئەو کەسەی تاوانجت

تیێبگریێ بیێبەشە لە میهرەبانی خوا، کاتیێ تۆم نارد بۆلای بونەوەران ئەتکەم بە فروستادەی خۆم بۆ ڕزگاریان، بەرانبەر بەووتەکانت، ئاسمانەکان و زەوی لاوازن، بەلاّم تۆ لاواز نابی هەرگیز. بەڕاستی ناوی پیرۆزی تۆ (موحەمەدە)، لە و کاتەدا یەسوع ئەوانەی فەرمو دانیشتوانی خزمەتی هەمویان دەنگیان بەرز کردەوە و ووتیان: ئەی خوایە: دەسا فروستادەکەت بنیرە.ئەی موحەمەد: هەلّسەو وەرە بەپەلە بۆ ڕزگار کردنی بونەوەران.

٥ـ لە فەسلّی (١٣٦) سەدو سیو شەشا یەسوع فەرموی: پاش چەند سالیێ فریشتەی کاربەدەست (جبرائیل) ئەچیێ بۆلای دۆزەخ ، ئەبینیێ دۆزەخیەکان ئەلیێن: ئەی موحەمەد کووانیێ بەلیێنەکەت بۆمان کەهەر کەسیێ لە سەر ئاینی تۆبیێ لەدۆزەخا ـ نامیێنیتەوە بەبەردەوامی، دووای ئەوە فریشتەی کاربەدەست ئەگەڕیتەوە بۆ بەهەشت بەڕیزەوە نزیکی فروستادەی خوا ئەبیێتەوە، ئەو شتەی لە دۆزەخیەکانی بیستبو بۆی گیڕایەوە. بۆیە لەو کاتەدا فروستادەی خوا بەبارەگای خوای گەورە ئەگەیەنیو ئەلیێ: ئەی بەخیۆکەرو پەرستراوی من: بیری ئەو بەلیێنە ئەکەمەوەداوتە بەبەندەی خۆت کە ئەوانەی ئاینی منیان وەرگرتوەنەیان هیێلیتەوەلە دۆزەخدا هەتا هەتایە، خوای گەورەیش بەمیهرەبانی خۆی وولاّمی دایەوە فەرموی: داواکەتم وەرگرت، داوابکە ئەی دۆستی خۆم ، ئەوەی بتەویێ پیێت ئەبەخشم.

٦ـ لە فەسلّی (١٣٧) سەدو سیو حوتا ئەفەرمویێ:لە کاتەدا فروستادەی خوا ئەلیێ: ئەی بەخیۆکەرم: کەسی واهەیە ماوەتەوە لە دۆزەخدا بۆماوەی(٧٠)حەفتاسالّ کوانیێ میهرەبانیەکەت ئەی بەخیۆکەرم؟،بەکزۆلیەوە داوات لیێ ئەکەم ئەی خوایە:ـ ئازادیان بکە لەو سزایانە بەیەکجاری، خوا فەرمان ئەدا بەچوار فریشتە نزیکەکانی لای خۆی بڕۆن بۆ دۆزەخ ئەو کەسانەی لە سەرئاینی منن و باوەڕیان بەفروستادەی من کردوە لە دۆزەخ دەریان بهیێنن و بیان خەنە بەهەشت ، ئەوانیش ئەوەی بەوان بسپیریێ ئەیکەن وای لیێدیێ بۆ گەیاندن بەپلەی بەرزی ئاینی ئەو فروستادانە ئەو کەسەی بڕوای بە پیغەمبەرهیێنابیێ ئەبین بۆ

بەهەشت، لە بەر ئەوەی ئاینی ئەو فروستادەیەی کردووەبە ئاینی خۆی ئەیبەنە بەهەشت و بگرە ئەو کەسانەیش کردەوەی چاکیشیان نەکردبێ.

٧ـ هەروەها ناوی پێغەمەر﴿ ﷺ ﴾ بەناوی (موحەمەد)ە ڕون کراوەتەوە بەزەقی لە ئینجیلی (بریانا)دا لە فەسڵی (٣٤ـ ٣٥ـ ٤٤ـ ٥٥ـ ٩٨ـ ١٣٦ـ ٢٢٠ـ)هاتوە. بەرنابا یەکێکە لە هاوەڵە تایبەتیەکانی عیساو نوسەریشی بوە، وەئینجیلەکەی جیاوازی تەواوی هەیە لە گەڵ ئینجیلە دەست کراوەکانی تردا هەیە لەمانەی خوارەوەدا:

١ـ عیسا نەخوایەو نەکوڕی خوایە .(٢) ئەو سەربڕاوەی ئیبراهیم کردی بە قوربانی ئیسماعیلی کوڕێتی، نەك ئیسحاقی کوڕی.(٣) مەسیای چاوەڕووان کراو موحەمەدە نەك عیسا. (٤) عیسا.نەکوژراوەو هەڵنەواسراوە، کەواتە ئینجیلی بەنابا لە گەڵ قورئاندا یەك ـ ئەگرنەوە، وەکولە(الادیان فی القران)دا بێژراوە لە لاپەڕەی (١٨٢ـ ١٨٤) ئینجیلی (برانانی) وەکو باسکرا نهێنێکی شاراوەبوەلا (پاپارومە) لە کاتی عیساوە هەتا ئەو کاتەی یەکێ لە گەورە پیاوانی ئینگلیزی دەریخست بۆ زانایان ، بۆیەخۆی و چەند کەسێکی زۆر موسڵمان بون.. ئەوەی جێگەی باسە پاپا (جلاسیوس)ی یەکەم فەرمانیدا لە ساڵی ٤٩٢ـ ٤٩٦ـ بە قەدەغە کردنی ئینجیل بەرناباو شاردنەوەی لە گەڵ چەندین کۆکراوەی تردا ، وەکو زانرا بەر لە دایکبونی پێغەر ﴿ ﷺ ﴾ ئەو فەرمانە دەرکراوە، هیچ زانایێکی موسڵمان وبێلایەن و دادپەروەرانیتر دەستیان نەکەوتوە، وەئەو ئینجیلی بەرنامانە یەکێ لە زانای گاورەکان وەری گێڕاوە کە خەلیل بێگ سوعادەیە.

باسی مژدەدان بە هاتنی پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ لە کۆکراوەکانی (زەڕدەشت) پێغەمەرا (ئاڤێستا) نامەی زەڕدەشت لە کۆکراوەکەی خۆیا ئەڵێ: ئەوەی من هێناومە خۆتانی پێدا هەڵواسن و پشتی تێ مەکەن هەتا دێت بۆلاتان خاوەنی هوشتری سور لە بیابانی عەرەبەوە. بێگومان ئەم مژدەیە لەزەڕدەشتەوە ئەچەسپێنێ خاوەنی هوشتری سور لە دەشتی

عەرەبەوە. ئەبێ هەر پێغەمبەری ئیسلامبی، هەر ئەویشە ئەناسرێ بەخاوەنی هوشتری سوور، وەکو.. (محمدشریف) لە ناومەی خۆیا(الادیان فی القرآن) نوسیوێتی.

﴿ واقیموا الصلاة واتوا الزکاة وارکعوا مع الراکعین ﴾ وە ئێوە نوێژەکانتان ڕاوەستێنن و بیان کەن، وەزەکاتەکەتان بەخشن بەهەژاران ، هەردو لایان بەو جۆرەی یاسای ئیسلام ڕونی کردوەتەوە، بەجیهێنانی نوێژو بەخشینی زەکات پێویستە نرخی بۆ دابنرێ. کە واتەپێویستە لە سەرتان نوێژ بکەن ئەی بەنوئیسرائیلی لەگەڵ موسڵماناندا بەو جۆرەی ئەوان ئەی کەن. بەڵام بەبیرو باوەڕەوە، ئێوە کوڕنوش ببەن بۆ خوا لەگەڵ کوڕنوش بەرانی موسڵمانان: جولەکەکان لە نوێژەکانیانا ڕکوعیان نەئەبرد، بۆیە خوای گەورە دووای فەرمان دانی بەکردنی نوێژ فەرمان ئەدا بەڕکوع بردن لەو نوێژدا بەتایبەتی لەگەڵ موسڵماناندا، بەبێ ڕکوع نوێژ دروست نیە، بۆیە بەتایبەتی فەرمانیان پێ‌ئەدا ڕکوع بەرن.

ڕستەی ﴿ وارکعوا مع الرکعین ﴾ ئاماژەئەکا بۆ نوێژی بەکۆمەڵ، بەم ڕستەیە خوای گەورە لەبیرو باوەڕی جولەکەکان ئەدا کەڕکوع نابەن و نوێژ بەکۆمەڵ ناکەن. بۆمانی ڕون ئەکاتەوە پێویستە نوێژی بەکۆمەڵ بکرێ هەتا ببێتە هۆی کۆکردنەوەی خاوەن دڵان و یەکێتی باوەڕداران و نزیکبونەوەیان لەخواو نەهێشتنی چینایتی بەبێ‌بیانوی یاسایی، نوێژ کردن بەکۆمەڵ بە(٢٧)بیست و حەوت پلە گورەترە لە نوێژی تەنهایی.

﴿ اتامرون الناس بالبر ﴾ ئایا بۆئێوە فەرمان ئەدەن بە ئادەمیزاد بە چاکەکردن؟ ئەڵێن. بەخزم و هاوشیرەو خەزورو زاواکانتان و جگەی ئەوانیش: ئەوپیاوە واتە پێغەمەر هەر شتێکیان پی‌ئەڵێ گوێی‌لێی‌بگرن و بیکەن، وەهەر شتێ ئەو ئەیڵێ ڕاستەو پەیروی بکەن .

﴿ وتنسون انفسکم ﴾ وەئێوە خۆتانتان لە بیر ئەچێتەوە، بڕوا بەو پێغەمەرە نایەنن و پەیڕەوی ناکەن، ئەو جۆرە ڕەوشت و کردارانە نا لەبارو گڵاون، چۆن مرۆڤێ ژێر داوای چاکەکردن لە دانیشتوان ئەکاو خۆی نایکا.

﴿ وانتم تتلون الکتاب ﴾ وەئێوە ئەخوێننەوەنامەی خۆتان کەتەوراتــە ، ئـەزانن لـەناو-تەوراتا بەهەڕەشەی سەخت و تیژ بۆ ئەوانەیە خۆیان چاکــە ئەکـەن، گفتوگـۆو کرداریـان لـەیەك جیاوازن.

﴿ افلا تعقلون ﴾ ئایا ئیوەبۆ بیر ناکەنەوە و ژیرنابنەوە لە کاری نارەواو خۆتان ئــەزانن نارەوایەو کردارو گفتوگۆتان لە یەك جیاوازە؟ ئەوەی بەدانیشتوانی ئەڵێن خۆتــان بیکـەن، هەتا کردارو ووتەتان یەکبن، لاتان ڕونبێ ئەوانەی ژیری بەکارنەبەرن و خۆیان نەپارێزن لە دووا ڕۆژی خراپیان، خاوەنی ئەقڵیشن زیانۆ مەندترینی بونــەوەرانن. پێویستــە بزانــن ئــەو کارانە ئەوان ئەیکەن زۆر پەستە لەلای ئــەقڵ، بۆنــازانن ئــەو شــتەی لەتەوراتایــە ڕاستــە؟ کەواتە باوەڕ بەموحەممەد پێویست کراوی ئاینەکەیانە پێویستە پەیڕەوی بکەن.

بەڕاستی نەخۆشیو نەگبەتی پیاوانی ئایین و زانایــان ئەوەیـە: ئـایین بەپیشـەی خۆیــان - دائێنن، بۆ ئەوەی سامان بەدەست بهێننو ڕابوێرن و پلەی نەگبەتی جیــهانی لایـان باشـبێ کەبەدەستی بـهێنن. نـەك یاســای ئیســلام بکـەن بەچـەکی خۆیــان و بـەکاری بـێرن بــۆ برەنگاریوقلاچۆکردنی دووژمنانی خواو نەهێشــتنی گێرەشـێوێنی، بۆیــە ئـەبینرێ ئــەوەی بەدەم ئەی لێن بە کردەوە نایکەن، فەرمان ئەدەن بەچاکەو خۆیــان نایکــەن . یاســای خــوا ئەگۆڕن بەگوێرەی ئارەزۆی خۆیان و بۆسودی خۆیان، پارەو پــول پــەیدا کــردن . مانــای قورئان و فەرمایشتی پێغەمبەر﴿ ﷺ ﴾ بەگوێرەی ویستی خۆیــان ئــەیلێن: فتــوای وائــەدەن بەڕواڵــت ڕیکو پێکەو ڕێك بکەوێ لە گەڵ یاسای قورئاندا. بەڵام لەناوەڕۆکدا ئــەو پــەڕی جیاوازە لـە گەڵیا، پوختەو کاکڵەی ئایین دورە لـەوەۆ..

ئەنەسی کوڕی مالیك ئەڵێ : پێغەمەر فەرموی: لەشــەوی میعراجــادا بــەلای کۆمــەڵێکا ڕابوردم بەمەقەسی ئاگرین لێویان ئەقرتانن. بەجبرەئیلـم ووت: ئەمانە چ کەســێکن؟ ووتــی ئەوانــە خوێنــەوارو زانــای جیـهانین. فــەرمان ئــەدەن بەچاکــەکردن و خۆیـــان نایکـــەن، وەفەرمایشی خوا ئەخوێنێتەوە بۆ ئادەمیزاد.

دووبارە پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ ئەفەرموێ: وێنەی ئەوانەی چاکە بە جگەی خۆیان فێرئەکەن و خۆیان نایکەن وەك چرایە وایە ڕوناکی بۆ جگەی خۆی هەیەو خۆیشی ئەسوتێ. فەمایشی پێغەمەر﴿ ﷺ ﴾ لە وبارەوە زۆرن ، تەماشای تەفسیری قورئان و فەمودەی پێغەمبەریان بۆبکەن کەواتە ئەومالومە جولەکانە ئەقڵ ناخەنەکار ئەگینا چۆن بڕوا بەپێغەمبەرناکەن؟ نمونەی ئەوانیش ئێستا زۆرن کەسواری چارەوێی چەموشی ئەقڵی خۆیان بوون، بیر لە هیچ چاکەیە ناکەنەوە، ئاینی خۆیان بەپارە ئەفرۆشن ، هەتا ئەو چارە وێیە ئەیان خاتە خوارەوەو ملیان ئەشکێنێ، زیانۆ مەندی هەردوو جیهان ئەبن. وە هەندێکیشیان بەپارەی بێگانە دژی ئیسلام ئەدوێن، خۆیان بەپاڵەوان دائەنێن.

ئەم ئایەتانە هەرچەندە دەربارەی مالومەکانی جولەکە هاتوەنەتە خوارەوە. بەلاّم هەمو خوێنەوارو ئاوۆژگاری کەران ئەگرێتەوە کە فەرمان بەچاکە ئەدەن و خۆیان نایکەن ، بۆیە پێغەمبەر ئەفەروێ: زۆر خوێنەوار هەیە شەیتان یاری پێ‌ئەکاو بە گوێرەی مەبەستی گلاّوی خۆی هەڵی ئەسەڕێنێ. واتە ئەوەی ئەیلێن خۆیان نایکەن، ئەوە ئەگەیەنێ بڕوای بە ئاین نەبێ.

﴿ واستعینوا بالصبر والصلاة ﴾ وەئێوە ئەی مالومەکانی جولە کە داوای یارمەتی لە خوابکەن بە هۆی ئارام گرتنتان لە سەر ئازارو ڕۆژو گرتن و بەهۆی بەجێ هێنانی هەمو فەرمانەکانی خواو نەکردنی هەمو گوناهێ، داوای یارمەتی بەهۆی بەجێ هێنان و کردنی نوێژەکان بکەن.خوای گەرە باسی نوێژ دووپات ئەکاتەوەو دووای فەرمان دان بەداواکردنی ئارام گرتن، هەتا بەباشی بچەسپێنرێ لە مێشکدا بەجێ‌هێنانی نوێژ پتر لە هەمو فەرمانێ پلەیێکی تایبەتی بۆدانراوە بۆیە پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ ئەفەموێ: کە کاتی کارێکی گرنگ ڕوی بدایەو توشی خەفەت ببوایە هەڵئەستاو دەستی ئەکرد بە نوێژ کردن بۆ نەمانی ئەو خەفەتە.

خوای مەزن دووای ئەوەی باسی بەرزی ئیسلام و کردەوە و گفتوگـۆی موسـڵمانانی کرد کە وەك یەك وابن و دەستی بیٚبگرن و واز لـە سەرۆکایەتی جیهانی پڕوپوچ بـهێنن و سودو پول و پارە پاڵیان پێوە نەنیٚ بۆ خراپە کردن: فەرمان ئەدا بەئارام گرتن و ڕۆژو نوێـژ کردن و بەجیٚ هێنانی هەمو پەرستشیٚ بۆ خوابـیٚ، داوا کردنیـان لـە خوابیٚ بـۆ کردنـی هەمویان

﴿ وانها لكبيرة ﴾ وە بەڕاستی داوای یارمەتی لە خوا بۆ ئـارامیو چـاوەڕوانی خۆشـی پاشەڕۆژ وە پاڕانەوە لە خوا بۆ کردنی نوێـژو ڕۆژو، وەڵام دانـەوەی پێغەمبـەر﴿ﷺ ﴾ لـە هەمو ڕویٚکەوە گەورەو گرانە لەسەر شان بەتایبەتی کردنی نوێژ.

﴿ الاعلى الخاشعين ﴾ گرانەن مەگەر لە سەر ئەوانەنەبیٚ لە خوا ترسن بەرانبـەر بـەخوا بەڕێزو بەکزۆڵیـەوە، هەسـت بـەترس و خۆپاراسـتن لـە بیٚفـەرمانی خوائەکـەن، خۆیـان بەخزمەتکاری مرۆڤایەتی ئەزانن بەتایبەتی بۆ باوەڕداران سـەریان پێوەنیـە بڕوایـان بـەخواو پێغەمبەرو دووا ڕۆژ هەیە.

﴿ الذين يظنون انهم ملاقـوا ربـهم ﴾ ئەوکەسـانەی ئـەوتۆ بـڕوای بلیٚگومانیـان هەیـە کەبەڕاسـتی ئـەزانن و چـاوەڕوانی ئـەوە ئەکـەن پـاش مـردن ئـەوان ئەگەنـــە خزمــەتی پەروەردەکەری خۆیان، بۆ وەرگرتنی پاداشتی چاکەی خۆیان ، بەچاوی سەر خوا ئەبێنن ، ئەوەیش گەرەترین پاداشت بەخزمەت گەیشتنی پەروەردگاری خۆیـان، ئـەو بینینـە چـۆن بینێنەکەی خوا ئەیزانیٚ بەتەنها.

﴿ وانهم اليه راجعون ﴾ وە بەڕاستی ئەزانن بۆ لای خوای خۆیان ئەگەڕێنەوە لە پاشـە ڕۆژدا، پاداشتی کرداری خۆیان وەرئەگرن .

بەڵام ئەو کەسانەی بڕوایان بە دووا ڕۆژو پاداشت نیە، بە ئومێدی پاداشـت نـین ، لـە سزاو تۆڵـە ناترسـن، ئـەو کەسـانە نەگبـەتی سـواری سـەریان بـوە، قورسـایی گونـاه دایگرتون،هەمو چاکەو فەرنانی خوا لایان قورسو گرانە، ئەو کەسـانە وەك دوو ڕوەکـان

وان، لـە وەی ڕابـواردن و کـەل و پـەلی جیـهان پەرسـتن، گـێرە شـێوێنو خراپـە کـارن، سەرسەری و سەرلێ شێواون لە ڕابووردوداو ئێستاو لەمەودواش.

يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ وَأَنِّي فَضَّلۡتُكُمۡ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٤٧﴾ وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا لَّا تَجۡزِي نَفۡسٌ عَن نَّفۡسٖ شَيۡـٔٗا وَلَا يُقۡبَلُ مِنۡهَا شَفَٰعَةٞ وَلَا يُؤۡخَذُ مِنۡهَا عَدۡلٞ وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ ﴿٤٨﴾

﴿ یابنی اسرائیل اذکروا نعمتی التی انعمت علیکم ﴾ ئەی کوڕانی ئیسرائیل بیری ئەو چاکەو۔ بەخششانە بکەنەوە پێم بەخشیون و ڕژاندومە بەسەرتانا، بۆ ئەوەی سوپاسـی خـوا بکەن، گوێبگرن و بەباشی ببیسن ، لەو چاکانەیە شۆکەو شێلاقەم بۆ ناردون ، هەورم بۆ کردن بەسێبەر ئاوم لە بەردی ڕەق بۆ هەڵقولاندن و چەندین شتی تریشم بۆ کردوون. بـا ئەوەیش بزانرێ باسکردن و گێڕانەوەی میهرەبانی خواو بەخشش لە گـەڵ بـاو باپیرانیـان گەورەترین هۆیە بۆ ئەوەی نەوەکانیان سوپاسی خوابکەن، بۆ ئەم ڕێزو گەورەییـە ـ هەیانـە لە باوو باپیرانەوە دەستیان کەوتوە ، بۆیە خوای گەورە ڕویان تێـدەکاو ئەفـەرموێ: ئـەی کوڕانی ئیسرائیل، هەتا دوای ئایەتی ﴿٤٨﴾. کەواتە ئەگەر بچوکـی خـوا بـەجێ نەیـەرن ئەبنە جێگەی تۆڵەی سەختی نالەبار لە ئێستاو لەمەو دووایش، بۆیە خوای گـەورە جارێ تر دووپاتی کردەوەو فەرموی: ئەی کوڕانی ئیسرائیل. ئەوەمان لەبیر نەچێ هـەمو جارێ باسی جولەکەکان و تیرەکانی تر ئەکرێ و هەڕەشەیان لێئەکرێ مەبەست تەنها ئەوەنیە لەو ڕوداوانە شارەزابین . بەڵکو لە هەمان کاتدا بۆ ئاگادار کردنەوەی عەرەبەکانە بەتایبـەتی، موسڵمانان بەگشتی: چونکە ئـەوانیش ڕێزیـان لـە پێغەمـەرەوە وەرگرتـوە ، بـەو بۆنـەوە سەربەرزی هەردوو جیهانیان دەست کەوتوە ، ئەگەر ئەوانیش پشت بکەنە یاسـای خـوای

گەورە پتر لە جولەکەکان ئابڕویان ئەچێت و ئەبن بەپەند، بیٚهـێزو بیٚنـرخ ئـەبن و ئـەبن بەبەندەو بچوکی دووژمنانی ئیسلام ، توشی دووبەرەکی نێـو خۆیـان ئـەبن ، هـەتا وایـان لیٚدیٚ بەرئەبنـە خۆیـان و ئاگایـان لـەدووژمنی خۆیـان نـامێنیٚ ، لـەبیٚهێزیدا جێگـەی جولەکەکانی پێشو ئەگرنەوە، بۆیە خوای گەورە ئەفەمویٚ: ﴿ لقدكان فی قصصـهم عـبرةٌ لاولی الالباب ﴾ بەڕاستی لـە گێڕانـەوەی چـیرۆکی ڕابـوردو جولەکـەکان پـەندو تـەمیٚ خواربە بۆ ئەو کەسانەی خاوەنی ئەقڵن، هەتا ئەو کردەوە گلاٚوانە جولەکـەکان کردویانـە نەتەوەکانی ئێسـتا نەیکـەن ، لـە نەپەرستنی خـواو داوێـن پیسـی و ئـارەق خواردنـەوەو قومارکردن و کوشتنی ناڕەوای یـەکتری . عومـەری کـوڕی خـەتاب ئـەڵێ: (قـد معنـی بنواسرائیل ، ومایغنی ماتستمعون عن غیرکم ) بەڕاستی ڕابوردن و نەمان بەنو ئیسرائیلی و ، وەسود ناگەیەنیٚ بەئێوە شتیٚ لە جگەی خۆتانەوە ئەی بیسن . ئەبوایە بەسـەرهاتی ئـەوان ئەمێتان وەرگرتایە.

﴿ وانی فضلتکم علی العالمین ﴾ وەبیر بکەنەوە کەبەڕاستی من ڕێزی ئێوەم داوە بەسەر هەمو ئادەمیزادا . یانی ڕێزی باوو باپیرانتانم داوە بەسەر ئادەمیزادی ئەو سەردەمەی خۆیان . نەك ئادەمیزادی هەمو سەردەمیٚ . بەلاٚم دوای ئەوەی دەستیان دایە خوانەپەرستن و یاخی بون لە خواو گوێیان لە فەرمودەی پێغەمەرەکانیان نەگرت ، خـوای گـەورە بیٚمیـهرەبانی خۆی بەسەردا ڕێژان، سەر شۆڕو کزۆڵ و بیٚنرخی کردن .

پێویستە بزانریٚ پێغەمەری ئیسلام گـەورەترینی هـەمو پێغەمـەران بـوە ، ئۆمەتەکەیشـی چاکترین نەتەوەن، وەك خوا ئەفەرمویٚ ﴿ کنتم خیرامته اخرجت للنـاس ﴾ ئیوەچاکـترین نەتەوەیەکن هێنراونەتە دەرەوە بۆ ڕێگەنومایی ئادەمیزاد .

بەکورتی مانای ئەو ڕستەیە ئەمەیە : جولەکەکان ئاگادارئەکا بۆ ئـەوە بگەڕێنـەوە لـەو هەڵەیە توشیان بوە و بانگەوازی ئیسلام وەرگرن ، بگەڕێنەوە بۆلای کۆمەڵی باوەڕداران و

بۆلای پەیمانی خوا، هەتا جێگـەی سوپاسـی ڕێزیـان بـۆ بگەڕێتـەوە دووبـارە وەك دۆخـی جاران.

﴿ واتقوا یوما لاتجزی نفس عن نفس شیئاً ﴾ وەبترسن و خۆتان بپـارێزن لـە ڕۆژێکـی زۆر سامناك کەڕۆژی دوواییو ڕۆژی پرسیارو وەلاّم و پاداشتە جیّبەجیّ ناکا هیچ کەسیّ بۆهیچ کەسیّ هیچ شتیّ ، هەمو کەسیّ خۆی و کرداری خۆی ئەگاتە فریای ، هیچ کەسیّ پاداشت لە کەسی تر وەرناگریّ.

کەس نابیّ بەجێگەداری کەسی تر بۆ وەرگرتنـی پـاداشو تۆلّـە، وەئـەو ڕۆژەی ڕۆژی دادپەروەرییە، پێویستە ئەم ڕۆژەی ژیانمان بکەینە نموونەی ئەو ڕۆژە: یاسای بەرزی ئیسـلام نابیّ کەسی بیکاو یەکیّ تر نەیکا. یەکیّ بچەوسێنرێتەوەو یەکیّ تـر رابوێـریّ، یـەکیّ پـارە پەیدا بکاو بەهەشت بفرۆشیّ، هەموو کەسیّ پێویستە خۆی ئەمڕۆ بەپاکی تۆو بچێنیّو دوو بەیانی خۆی دوورینەی بکاو بیخوا. کەواتە ئێستایش هەموو کەس خۆیو کرداری خۆی.

ئاماژە بۆ ناوەرۆکی ئایەتی ﴿٤٧﴾ لەبیرمان بـیّ بـۆ ڕێزگرتـن لەبەنوئیسـرائیلی خـوا پێغەمبەری زۆری لیّ ناردوون، وێنەی موساو هارونو یەسوع و عوزەیرو عەزیزو زەکەریاو یەحیاوچەندین پێغەمبەری تر، گەزۆو شێلاقەی بۆ ناردون هەتا بیانخۆن.

﴿ولایقبل منها شفاعة﴾ وەوەر ناگیریّ لەهیچ کەسیّ تکاو پاڕانەوەو میانجی گـەری بـۆ کەسی ترکەواتە تکاو پاڕانەوە سودی نیە بۆ ئـەو کەسـانەی باوەڕیـان نـەهێناوە، باکـاری شایستەی لەپێش خۆیەوە نەناردبیّ بۆ توێشوی ئەو ڕۆژە، توانای بەرەنگاری کردنو یـاری دانی بۆ کەسیّ تر نیە لەو ڕۆژەدا.

﴿ولایؤخذ منها عدل﴾ وە وەرناگیریّ لەهیچ کەسیّ فیدیـەو بـەرتیل باهـەموو سـامانی جیهان بیّ لەرۆژی دواییدا بۆ ئەوەی ڕزگاری بیّ لەئاگری دۆزەخ، یاکەسیّ لە جێگـەی خۆیا دانیّ بۆ ئەوە لەبریتی ئەو بچێتە دۆزەخ.

﴿ولاهم ینصرون﴾ وەئەو کەسانە یارمەتیان نادرێ بۆ ئەوەی ڕزگاریـان بـیێ لەسزای خودا. کەواتە کەس ناگاتە فریای، کەس بۆی ناپاڕێتەوە، کەس ناتوانیٚ بۆی بکا.

لەمانای ئەم ئایەتەوە بۆمان ڕون ئەبێتەوە پاڕانەوە لەهیچ کەسـێکەوە بـۆ هیـچ کەسـێ وەرناگیرێ بەڵام زانایـان ئـەڵێن: ئـەو ئایەتـە هاتوەتـە خـوارەوە بـۆ دەم کـوت کردنـی جولەکەکان کەلایان وایە باوك و باپیرە پێغەمەرەکانیان لای خـوا بۆیـان ئەپاڕێنـەوە، خـوا لەوان خۆش ئەبێ، خوای گەورە لـە وەڵامیان ئەفەرموێ: بۆ ئێوە نابێ کەباوەڕتان بەقورئان و بە محمد نیيە.

بۆ ئاگاداری: لێرەدا باسی (شفاعة) ئەکەین یانێ پاڕانەوە لە خزمـەت خـوادا; زانایـان لەو بارەیەوە ئەکرێن بە دوو بەشەوە:

١- زۆربەی زۆری زانایان کە جێگەی متمانەن بڕیاری بێگومانیـان داوە کـە پاڕانـەوە لای خوا لـە پاشە ڕۆژدا گومانی تێدانییە بۆ موسڵمان، بـۆ بـەرز بونـەوەی پلـەی هـەندێ کەس لـە بەهەشتا، بە تایبەتی لـە لایەن پێغەمبـەرەوە و پێغەمبـەرانی تـر و زانایـانی ئـاینی و شـەهیدان و فریشـتەکان و پیـاو چاکـان و باوکـان و کـوڕان و خزمـان و دراوسـێ و مامۆستایان و قوتابیان و ناسیاوان بە گشتی، کەواتە ئێمەی موسڵمان پێمان وایـە پاڕانـەوە لای خوا لـە ڕۆژی دوایدا هەیە. بەڵام چۆنیەتی و شیکردنەوەی ئـەو پاڕانەوەیـە نـازانرێ. لەهەمان کاتا بڕوای بێگومانمان وایە گەورەترین پاڕانەوە و یارمەتی بۆ ئادەمیزاد کـردەوەی خۆیەتی، سەر کەوتو تر پاڕانەوە پەشیمان بونەوەیان لـە گوناە.

خوای گەورە ئەو کەسەی پەنای ڕاستی بۆ بەرێ و داوای بەزەیی و میهرەبانی لێ بکات وەڵامی ئەداتەوە، بەمەرجێ بەکزۆڵەییەوە بێ و بەتەمای سـەخاوەتی ئـەو بـێ بـێ بەشـی ناکا. بەمەرجێ بە بیروباوەڕی ئیسلامەوە مردبێ، بۆیە خوای گـەورە لـە باسـی ڕێـزداری پێغەمبـەردا ئەفـەرموێ: ﴿ولسـوف یُعطیـك رَبّـك فَـتَرضی﴾ وە لـەمـەودووا ئەبەخشـێ پەروەردەکەری تۆ هەموو ڕێزێ دووابێ تـۆ ڕازی و خۆشـنود ئـەبێ ئەگـەر بەباشـی لـەو

ڕەزایەتیە وورد بینی بکرێ ئەبێ بەچەندە ئەنداز بکرێ مەگەر خوا خۆی بیزانێ، بۆ دابین کردنی شەفاعەت پێغەمبەر ئەفەرموێت: ((شفاعتي لأهل الكبائر)) پاڕانەوەی من بۆ خاوەنی گوناهە گەورەکانە لە ئومەتی خۆم. بەڵام نابێ مرۆڤ گوناه بکا بێ شەرمانە و بەتەمای پاڕانەوە بێ، ئەوە لەوەوە زۆر نزیکە لاقرتێ بە فەرمانی خوا بکا، خوایە پەنامان بدەی لە خراپەو گوناه.

٢- کەمێ لە زانایان ئەڵێن: پاڕانەوە بۆ ئەوانە نابێ گوناهی گەورەیان کردبێ و پەشیمان نەبوبێتەوە لە گوناهە گەورەکان وەکو نوێژ نەکردن و زەکات نەدان و ڕۆژو نەگرتن و پوختەی ئەو باسی پاڕانەوە بەم جۆرەیە: پاڕانەوە لە ڕۆژی دواییدا بۆ موسڵمانان هەیە ئەو فەرمودانەی خوا و پێغەمبەر (ﷺ) کەوا ئەگەیەنن پاڕانەوە نی‌یە، بۆ بێ باوەڕان و دووڕوان و لاقرتێ کەران و گاڵتە کەران بە ئایینی و بە ئایین خوازان. نەك بەگشتی.

وَإِذْ نَجَّيْنَـٰكُم مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ يُذَبِّحُونَ أَبْنَآءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ ۚ وَفِى ذَٰلِكُم بَلَآءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴿٤٩﴾ وَإِذْ فَرَقْنَا بِكُمُ ٱلْبَحْرَ فَأَنجَيْنَـٰكُمْ وَأَغْرَقْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴿٥٠﴾

دووای ئەوەی خوای گەورە بەکورتی باسی ئەوانەی کرد بەخشیوێتی بە کوڕانی ئیسرائیل لەمەو دووا بەشی کراوەیی و بەدرێژی باسی ئەو چاکانە ئەکا بەخشیوێتی بەوان ئەفەرموێ:

﴿وإذ نجيناكم من آل فرعون﴾ وە بیری ئـەو کاتـە بکەنـەوە کـە ئێوەمـان ڕزگـار لـە پیاوەقوڵانی فیرعەون و هاوئاینەکانی و پیاوانی تری.

فرعەون نازناوی پاشایانی ئەو سەردەمەی میسریەکانە، هەروەك کیسرا بۆ فارسـەکان و قەیسەر بۆ ڕۆمەکان و نەجاشی بۆ حەبەشە و توبەع بۆ یەمەنیەکان و خاقان بۆ تورکـەکان. ئەم جۆرە ناوانە بۆ پاشاکانیان باوی نەماوە، سوپاس بۆ خوا.

زانایان هەریەکەیان بەجۆرێ ناوی ڕاستەقینەی فیرعەونیان بردوە. بەڵام ئـەوەی شـایانی باسێ ناوی هەرشتێ بوبێ گرنگ نی‌یە، ئەوەی جێگەی باسێ ئەو پاشایە لەو کاتـەدا زۆر دوژمنی کورانی ئیسرائیل بووە، هیچ جۆرە بەزەییەکی تێدا نەبوە بۆیان، خوێـن ڕێـژ و دڵ ڕەق بوە بەتایبەتی بۆ جولـەکەکان.

﴿يسومونكم سوء العذاب﴾ سەخت ترین سزای ئـەچێژا بـە ئێـوە، وەك ئـەوە بـەردی بەئێوە ئەبرێوە و بەئێوەی ئەگوازتەوە بۆ دروست کردنی خانو، بیری بەئێوە هەڵئەەند، هـەر کامتان توانای کردنتان نەبوایە پارەی لێ ئەسەندن، ئەوەی بە دڵنیا بهاتایە بۆ لـەناو چونتـان پێتانی ئەکرد.

ئەو کارانە بەئێوەیان ئەکرد ژیانی ڕۆژانەتان بو، بەکاریان ئەهێنان لە بێگـاری کردنـدا، سزای گرانتری وەك ئەمانەی خوارەوە.

﴿يُذَبّحُون أبْناءَكم﴾ کوڕەکانی ئێوەیان سـەر ئـەبڕی و ئـەیان کوشـتن بەهـەر جـۆرێ بوایەو ، گەورە و بچوکتانیان ئەکوشت نەوەك گەورە بن و کۆ ببنە بۆ گێرە شێوێنی.

ئەوەی پاڵی نا بەفیرعەونەوە بۆ ئەو جۆرە کردارانـە، بەهـەر جـۆرێ بوزانیبـوی و وای ئەزانی و بیروباوەڕی وابو کوڕانی ئیسرائل بۆ دووا ڕۆژ ئەبنە هۆی نەمانی دام و دەزگـای خۆی و کزبونی قیبتیەکان و داروودەستەکەی، بۆیە ئەویش بڕیاری دابوو لـەناویان ببا بـۆ پاراستنی شکۆی خۆی ئەو جۆرە کردارە ناڕەوایانە بۆ پاراستنی هـەر ڕژێـم و یاسـایە لـە ڕابردووا ئێستا و لـەمەو بەرو لـەمەو دووایش شتێکی ئاسایی‌یە بۆ کاربەدەستانی ترسنۆك و

چاو چنۆك، ئاگرو دارو کوشتن و سزا بەکاردێنن بۆ نەمانی تاقمێ دژی یاسای خوێن ڕشتنیانێ.

﴿ویستحیون نساءکم﴾ وە ژنەکانتانیان بە زیندوی ئەهێشتەوە هەتا بیان کەن بەکارە کەر و بیان خوازن بەزۆری شەلاق بێ جیاوازی گەورە و بچوکی ژنەکانتان، ئەوکارەیان خراپتر بو لەکوشتنی پیاوەکانتان.

خوای گەورە ڕوری فەرمودەی ئەکاتە جولەکەکان سردەمی پێغەمبەر (ﷺ) هەرچەندە ئەو کارانە توشی ئەوان نەبوە. بەلاّم ئەمانیش لە ئاینی پێشوەکانیان و لەوان ڕازین و خۆشیان ئەوێن کەواتە هاوبەشی ئەوانن.

﴿وفي ذلکم بلآء من ربّکم عظیم﴾ وە لەکوشتنی کوڕەکانتان و هێشتنەوەی ژنەکانتان ناخۆشی و نەگبەتیکی زۆر گەورەیە لەلایەن پەروەردەکەرتانەوە توشی ئێوەی کردوە ، بۆ ئەوەی تەمێ خوار بن و کۆشش بکەن و ئارام بگرن بەرانبەر دوژمنانی خوای خۆتان.

هەروەها لە ڕزگار کردنتان لەدام و دەزگای فیرعەو ڕێز داری و بەخششی خوای گەورەیە بۆتان بۆ ئەوەی سوپاسی خوا بکەن.

کورتەی مانای ئەو ئایەتە ئەمەیە: جولەکەکان ئەو پەڕی کزۆڵ و چەوساوە و هەژار بوون و دوژمنەکانیان ئەوپەڕی هێز و بەتوانا و ساماندار بون. خوای گەورە بە هۆی موسا پێغەمبەرەوە ئەوانی بردە جێگەی دوژمنەکانیان و جێگەی ئەوانیان گرتەوە لەبێ دەسەلاتیدا نەمان ، کەواتە بیانویان نامێنێ کە وولاّمی جاڕ و بانگەوازی ئیسلام نەدەنەوە بە هۆی پێغەمبەرەوە. ئەبوایە تەمێ خوار بونایە و جارێ تر کاری ناڕەوایان نەکردایە و کەسیان نەچەوسانابێتەوە.

فێرعەونی دوێنێ و بەخت نەسرو ڕۆمان و نازیەکان ئەوەی بەجولەکەکانیان کرد لە ڕابردوودا، ئێستا زاوێنیە جولەکەکان بەکاری دێنن لەگەڵ عەرەبەکانی فەلەستین و

باشوری لوبنان، ڕۆژێ ئەبێ کاروفەرمانی خوا وەرگەڕێ و جارێ تریش توشی نەگبەتی و چەوساوەیی بێن بەهۆی کردەوەی ناهەمواریانەوە.

لێرەدا ئەمەیشمان لەبیر بێ ئەو کەسەی فەرمان بدا بەکوشتنی ئادەمیزادێ بەنارەوا ئەگەر فەرمان پێ دراو پێویست نەبێ گوێ ڕایەڵی فەرمان دەرکەربێ بە گوێرەی یاسا وەك پۆلیس و سەرباز و موچە خۆر پێویستە فەرمان دەرو فەرمان پێ دراو هەردوولایان لە تۆڵەی کوژراوەکەدا بکوژرێن، وە گەر وانەبو وەك باوك و کور و مامۆستا و قوتابی کامیان بکوژبێ ئەوەیان ئەکوژرێ و بەس.

﴿وإذ فرقنا بكم البحر﴾ وە بیری ئەو کانە بکەنەوە ئێمە دەریاکەمان بۆ ئێوە لەیەك پچڕاند و بۆتانم کرد بە (١٢) دووازدە ڕێگە هەریەکەیان بۆ بەرەیەکتان لە (١٢) دووازدە کوڕەی یەعقوب، لەو ڕۆژەدا میسرتان بەجێ هێشت لەگەڵ موسادا، کەئەتان بینی دەریا لە پێشتانەوە و دوژمن لە دوواتانەوە و ئەترسان لە هەردوولایان و بنەبڕبێن.

﴿فأنجيناكم﴾ دووایی ئێمە ئێوەمان ڕزگار کرد لەترسی خنکاندنی ئەو دەریایە و لەگەیشتنی فیرعەون پێتان و بەئاسودەیی گەیشتنە کەناری دەریا، بەچاوی خۆتان دیتان قوڕو لیتەی دەریاکە ووشك بوویەوە نەك ڕۆچن بەنێو قوڕدا.

﴿وأغرقنا آل فرعون وأنتم تنظرون﴾ وە ئێمە فیرعەون و پیاوە ماقوڵەکانی و پیاوانی تریانمان خنکاند بە ئاوی دەریاکە، ئێوە تەماشاتان ئەکردن بەخنکاوی و بەمردوی بەچاوی خۆتان و دیتان ئاوی دەریاکە لەیەك بچڕا بۆ ڕزگار بونی ئێوە، دووای ڕزگاری ئێوە ئاوەکە تێکەڵاوی یەکتر بوونەوە و چوبەسەر فیرعەون و تاقمەکەیدا و خنکاندنی و لەناو چون ئەو دەریایە کە موسا و کوڕانی ئیسرائیل ڕزگاریان بو لەناویا فیرعەون و تاقمەکەی خنکان زانایان ئەڵێن: (دەریایی سورە لەسەر کەنداوی سووەیس)

کورتەی ئەوز ڕوداوە بەم جۆرەیە: خوای گەورە کاتێك ویستی فیرعەون و تاقمەکـەی لەناوببا فەرمانی دا بەموسا خۆی و کوڕانی ئیسرائیل لـە میسـر بچنـە دەرێ، ئـەویش بـە خۆی و خزمانیەوە بە نهێنی لە شەودا چونە دەرێ، بەرەو فەلەستین ڕۆیشتن.

فیرعەون کەبـەوەی زانـی فـەرمانی دا بەهـەموو جەندرمـەکانی و نـاردنی بـۆ هـەموو هەرێمەکانی ژێردەستەی لەشکرێکی زۆری کۆکردەوە، کەوتـە دووای جولـەکـەکان کـە بەرلەوەی بگەنە فەلەستین بیان گێڕێتەوە، بۆ ئەوەی ترس و بیم بلاو نەبێتەوە بەناو شـاردا، وای بلاو کردەوە بەناو میسردا ئەوکەسانە تـاقمێکی کـەمن و هـەلاتوون و مەترسـیان لێ ناکرێ و ئێمەیان بەو هەلهاتنە ئالۆز کردوە، پـارەو خشـلی ژنـەکانمانیان بـردوە و نـەیان داونەتەوە، لە هەلس و کەوتیان ئاگادار بوین.

فیرعەون و لەشکرەکەی کەوتە دووای موسا و بەنوئیسرائیلی. فیرعەون و تاقمەکـەی باخوبۆلاخ و زێڕ و بارەگای گەورەو کوشکی بەرزی خۆیانیان بەجێ هێشت لە میسردا و جارێتر نای بیننەوە و بۆیشیان ناگەڕێتەوە بەلام بەنوئیسرائیلی لە فەلەستینا ئەبنە خـاوەنی وێنەی ئەوانەی ئەوان هەیان بو.

کوڕانی ئیسرائیل گەیشتنە کەناری دەریای سور لەسەر کەنداوی (سووەیس) فیرعـەون و لەشکرەکەیشی لەگەل خۆر کـەوتنا بـەوان گەیشـتن، لـەو کاتـەدا کوڕانـی ئیسـرائیل بڕوایان وابو لەناوئەچن، ترس و بیم کەوتە دلیان، بەموسایان ووت: ئـەوا فیرعـەونمان پـێ گەیشت و توانای ئەومان نی‌یە چ شتێ بکەین؟ موسا فەرموی: مەترسن خوای خۆم لەگەل منە ڕێگە نومایم ئەفەرموێ، بۆ ڕێگای ڕزگاریم. لەوکاتەدا خوا پەیامی نارد بۆ موسـا کـە داردەستەکەی بدا بە دەریاکەدا.

موسا داردەستەکەی کێشا بەدەریاکەدا، ئاوەکەی پارچە پارچە بـو، وە (١٢) دووازدە ڕێگەی وشکی لێی پەیدا بو، هەریەکەیان بۆ بەرەبابێ، ئاوی دەریاکە بـەم لاولایانـا وەکـو کێو بەرز بوبوەوە. کوڕانی ئیسرائیل بەو ڕێگە کراوانەدا چونە ئەوبەری دەریا. لەوکاتەدا

فیرعەون کەچاوی بەو ڕێگانەی ئاوی دەریاکە کەوت کە جولەکەکان پێیانا ئەچون، ئەوانیش خۆیانیان پێ داکرد بە دووای جولەکەکاندا، ئاوی دەریاکە دای بەسەریاندا هەموبان خنکان و مردن. موسا و ئەوانەی لەگەڵیا بون ڕزگاریان بو، بەچاوی خۆیان ئەوانەیان هەمو بینی .

قورئانی پیرۆز لەناوچونی فیرعەون لەچەند ئایەتا باسی ئەکا بۆ ئەوەی هەمو گوێگران پێی تەمێ خوار بن، لە هەرجێگەیەکدا بەشێوەیەکی شایان باسی ئەفەرموێ جارێ بەکورتی و جارێ تر بە درێژی، بۆ ئەوەی وورد بینەوە و لەناوە ڕۆکەکەی باشتر بگەین، لە هەرجێگەیە تامێکی تایبەتی هەیە و تەواو کەری ئەوەکەی تریانە..

وَإِذْ وَٰعَدْنَا مُوسَىٰٓ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً ثُمَّ ٱتَّخَذْتُمُ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَنتُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿٥١﴾ ثُمَّ عَفَوْنَا عَنكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٥٢﴾ وَإِذْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْفُرْقَانَ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿٥٣﴾

﴿وإذ واعدنا موسی أربعین لیلة﴾ وە ئێوە بیری ئەو کاتە بکەنەوە ئێمە بەڵێنمان دا بەموسا بەمانەوە چل شەویی تەواو هەتا ئەو شتەی داوای کردبوو بیدەمێ کە تەورات و یاسای خوایە وە موسایش بەڵێنی دابو بەخزمەکانی بچێ بەسەر ئەو بەڵێنەی پێ درابو لەلایەن خواوە.

﴿ثم اتخذتم العجل مِنْ بعدِهِ﴾ لەپاش ئەوەی موسا ڕۆیشت ئێوە گوێرەکەیەکتان داناو کردتان بە خوا بۆ خۆتان و دەستتان کرد بە پەرستنی بە دیار نەبونی موسا لاتان.

﴿وأنتم ظالمون﴾ وە ئێوە ستەمتان لە خۆتان کـرد بـەو پەرستنەو کـارە ناڕەوایـە کـە لەجێگەی خوا داتان نابو، ئەبوایە هەر خواتان بپەرستایە و پەرستراو هەر ئەبێ خوابێ.

﴿ ثم عفونا عنكم من بعد ذلك﴾ لەپاشا ئێمە خۆش بوین لـە ئێـوە و لەگوناهـەکانتان بوروم، دووای ئەوە ئێوە پەشیمان بوونـەوە لـەو گوناهـە گەورەیـەکردبوتان بـە پەرسـتنی گوێرەکە، ئەو سزایە ئەبوایە توشتان بوایە بەو پەشیمان بونەوە لەسەرم هەلگرتن.

﴿ لعلكم تشكرون﴾ بۆ ئەوە ئێوە سوپاسی من بکەن لەسەر ئەو لێ بوردنەو ئـەو هـەمو میهرەبانیە من لـەگەڵتانم کرد.

بۆئاگاداری: ووشەی موسا بەزمانی عیبری لەدوو ووشە پێك هاتوە: (مو) بـەمانا ئـاوە، وە (سی) کە (شێ) بەزمانی عبری و عەرەبەکان کردیانە بە (سی) یانی درەخـت، کەواتـە ئەبێ بە(ئاویی درخت) موسای پێ ناوبراوە، لەوەوە هاتوە کاتێ (ئاسیای) ژنـی فیرعـەون کارەکەرەکانی دەستور پێدا بون خۆیان بشۆرن لای ئاوو درختێ، تەماشایان کرد تابوتـێ ئاو هێنای و ئەوانیش گرتیان تەماشایان کرد منالێکی تێدایە، لەگەڵ خۆیان بردیان بـۆلای ئاسیا، بەو بۆنەوە ناویان نا موسا.

خوای گەورە دووای ئەوەی باسی ئەو بەخشندەییە کـرد کـە بەخشـیبوی بـە کوڕانـی ئیسرائیل: بریتی بون لە ڕزگار بونی کوڕەکانیـان و هێشـتنەوەی ژنـەکانیان. لـەناوبردنی فیرعەون، لێ خـۆش بـون لـە سـزای پەرسـتنی گوێرەکـە دووای پەشـیمان بونـەوەیان. ئەفەرموێ:

﴿وإذ آتينا موسى الكتاب و الفرقان لعلكم تهتدون﴾ وە بیری ئەو کاتە بکەنـەوە ئێمـە دابومان بە موسا ئەو نامەیە کە تەوراتە و ڕاست و چەوت جیا ئەکاتەوە، حەڵاڵ و حـەرام، دۆست و دوژمن لەیەك جوێ ئەکاتەوە، بۆ ئەوەی ئێـوە ڕێنومـایی وەرگـرن و شـارەزای یاسای خوا بن و خۆتـان لـە گومڕایـی دوور خەنـەوە، بـیر لـە نیشـانە گـەورەکانی مـن بکەنەوە.

وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ إِنَّكُمْ ظَلَمْتُمْ أَنفُسَكُم بِٱتِّخَاذِكُمُ ٱلْعِجْلَ فَتُوبُوٓا۟ إِلَىٰ بَارِئِكُمْ فَٱقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ عِندَ بَارِئِكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٤﴾ وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهْرَةً فَأَخَذَتْكُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴿٥٥﴾ ثُمَّ بَعَثْنَٰكُم مِّنۢ بَعْدِ مَوْتِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٥٦﴾ وَظَلَّلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْغَمَامَ وَأَنزَلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْمَنَّ وَٱلسَّلْوَىٰ ۖ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ ۖ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٥٧﴾

﴿وإذ قال موسى لقومه ياقوم إنكم ظلمتم أنفسكم باتخاذكم العجل﴾ وە ئێوە بیری ئەو کاتە بکەنەوە موسا وتی بەخزمەکانی: ئەی تاقمەکانی من بەڕاستی ئێوە ستەمتان کرد لە خۆتان بەهۆی دانانی گوێرەکەکە کردبوتان بەخوای خۆتان ئەتان پەرست، ئەوکەسانەی کاری ناڕەوا بکەن شایستەی ئەوەن سزایان بدرێ.

﴿فتوبوا الى بارئكم﴾ کەواتە ئێوە پەشیمان ببنەوە بۆلای خوایێ دروست کەری ئێوەیە بەجۆرێ شورەیی و ناتەواوی جیاوازیتان تێدا نییە و ئەندام و هەندامتان ڕێك و پێکە،

لەیەك جویّ ئەبنەوە هەریەکەتان لەوی ترتان بەڕەنگ و شیا وازو دیمەنی شیاو بۆتان، لە نەزانین ئەوپەڕیتان گرتوە، چۆن واز لە پەرستنی خواتان هێنا و بۆلای کوێرەکە پەرستن کە هەروەنکو خۆتان ئەوگوێرەکەیە گێل و نەفامە.

﴿ فاقتلوا أنفسكم ﴾ دووایی پێویستە ئێوە خۆتان بکوژن، ئەوەیش دووای ئەوە بو گوێرەکە پەرستان وتیان: بە چ جۆرێك بگەڕێینەوە بۆلای خوای گەورە، موسا فەرموی: ئەوکەسانەتان گوێرەکەتان نەپەرستوە گوێرەکە پەرستان بکوژن، بۆ ئەو مەبەستە ئەگێڕنەوە باوك و کوڕخزمی خۆیانیان ئەبینی و پرکێشیان نەئەکرد ئەو فەرمانەی خوا بەجیّ بهێنن، بۆیە خوای گەورە تەم و هەورێکی ڕەشی بۆناردن وایان لیّ هات یەکتریان نەئەبینی، دوایی بەربونە خۆیان و کوشتنی یەکتری، ئەوانەیان گوێرەکەیان پەرستبون هەمویان کوژران، دووای ئەوە هەورو تەمەکە نەما ، لەبەر ئەوەی فەرمانی خوایان بەجیّ هینا هەمویان بەشەهیدی مردن ژمارەی کوژراوان هەرچەندە بیّ گرنگ نییە، ئەوەی شایستەی ئەوان بیّ فەرمانی خوایان بەجیّ هینا. بەڕاستی ئەو فەرمانی بەوان درابو زۆر گران و سامناك بو کە باوك و کوڕ و خزم یەکتری بکوژن ئەو کوشتنە وەك ئەوە وایە خۆیان بکوژن بۆیە خوا ئەفەرمویّ: ﴿فاقتلوا أنفسكم﴾ بەلاّم سروشتێکی ڕوخاو پەست کە خۆی لە گوناه نەگێڕێتەوە و دەست بکەن بە کوێرەکە پەرستن بە ئامۆژگاری کۆڵ نادەن، پێویستە بە تێخ و نوکی شمشێر کۆڵیان پیّ بدریّ، بەڕاستی باجی قورسی خۆیانیان دا و ئەو پەڕی سودیان وەرگرت و تەمیّ خواربون بەگشتی ، بۆیە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) ئیبنو ماجە ئەی گێڕێتەوە و فەرمووی: هەر کۆمەڵی گوناه لەناویانا بکریّ، ئەوا ئەوانەیش گوناه کەر نەبوون گەورە و بەدەستەلاّت بن و بەرەنگاری نەکەن لەو گوناهە سزاو تۆڵەی هەمویان ئەگریتەوەوە لەهەردوو جیهاندا:

﴿ذلكم خيرلكم عند ربكم﴾ ئەو پەشیمان بوونەو خۆ کوشتنە چاکترە بۆ ئێوە لە یاخی بونتان لای خوای دروست کەرتان، بەو کوشتنە یا ئەبنەوە لە بت پەرستیو ئەگەن بەژیانێکی بەردەوامی و نەبڕاوە ، خۆ ئەبیّ هەربیش مرن، ئەو مردنە زۆر پەسندو ڕەوایە کە خۆیانیان کوشت.

﴿فتاب عليكم إنه هو التواب الرحيم﴾ دواوای ئەوەی فەرمانی خواتان بەجێ هێنا خوا پەشیمان بۆ ئەوەی لە ئێوە وەرگرت و بەزەیی خۆی بەسەرتانا ڕژاند، بەڕاستی خوا هەر ئەوە بەزۆر پەشیمان بونەوە وبگرێ لەبەندەکانی خۆی، زۆر میهرەبان و خاوەن بەزییە.

پوختەی مانای ئەم چوار ئایەتانە ڕابوردن بەم جۆرەیە: دووای ئەوەی کوڕانی ئیسرائیل بەڕانومایی موسا ڕزگار یان بوو لەدەریاکە و فیرعەون و تاقمەکەی خنکان کوڕانی ئیسرائیل پشوێکی خۆشیان دا ، ئیتر گەڕانەوە بۆ میسر یا نەگەڕانەوە گرنگ نیە؟ بەلاّم کاتێ لەمیسرا بون موسا ئاگاداری کردبوون خوای گەورە فیرعەون بەم زووانە لەناو ئەبا، لەپاشان نامەیەکتان بۆ ئەنێری لەلایەن خۆیەوە و ئەیکا بە یاساو ڕوونی ئەکاتەوە ئەو شتانەی بیکەن و ئەوانەی نەیکەن و قەدەغە بن لەسەرتان، بۆیە پێویستە ئێوە کاری پێ بکەن بە پەیڕەو بۆ خۆتان ، کاتێ فیرعەون لەناو چو موسا داوای لەخوا کرد ئەو نامەیە بۆیە نێرنێ، خوا فەرمانی پێدا بڕوا بۆ سەر لوتکەی کێویی توری بەڕێز (٣٠) سی ڕۆژ لەوێ بەڕۆژوبێ خوا پەرستیبکا.

کاتێ (٣٠) سی ڕۆژەکەی تەواو بو خوا فەرمانی پێدا (١٠) دە ڕۆژی تر بمێنێتەوە هەتا پەرستنەکەی تەواوتر بێ، دواوای (٤٠) ڕۆژ خوا نامەکەی پێ بەخشێ، موسا بەر لەوەی بڕوا بۆ پاڕانەوە لە کێوی تور ئامۆژگاری هاورنی برای کرد و پێی فەرمو: جێگە داری من بە لە ناو خزماندا، کاروباریان ڕێك خەو ئاگات لەخۆتبێ نەکەویتە دوای گێڕە شێونیئەوان و، ئەوانەی تۆویی خراپە ئەچێنن، موسا ئەوکاتە ڕۆیشت بۆ پاڕانەوە لە کێوی (طور) فەرمووی (٣٠) ڕۆژم پێ ئەچێ کە خوا فەرمانی پێدا (١٠) دە ڕۆژی تر بمێنێتەوە بۆ ڕۆژوگرتن ووتیان: موسا بەلێنەکەی ڕاست نەبوو، لەوکاتەدا (موسای سامیری) کینەی بۆگەنی دلّی جولا، ئەو ڕوداوەی بەهەل زانی، ئەو زێڕەی ژنانی میسردا بویان بە ژنانی ئیسرائیل و لەگەلّ خۆیان هێناوبۆیان لێی وەرگرتن و توانیەوە لە نێو ئاگرداو گوێرەکەیکی لەو زێڕە بۆ دروست کردن، بە جۆرێکی ئەنداز باری و هونەری ڕەنگی بۆ

ڕێژابو، ئەگەر با بچوایە تە ناویی لەدەمێیەوە دەردە ئەچو، دەنگێکی لێ پەیدا ئەبوو وەکو گا ئەی بۆڕان، سامیری بەگێل و گەوجی ئیسرئیلەکان پشت ئەستوور بوو فەرمانی پێدان ئا ئەمەیە خواکەتان موسا لە بیری چوەتەوە ، ئەوانیش دەستیان کردبە پەرستنیو بت پەرستی ئەو کاتە باو بوو لەناو میسر یەکاندا ئەوانیش پێی داهاتبون بێ ئەرێ و نەرێ کوڕنوشیان بۆ برد لەوکاتەدا هارون زۆر بەتیژی بەرهەڵستی کردنو پێی ووتن: سەرتان لێ شێواوە کاریوا مەکەن.

هەرچی توانای بو خستیەکارەوە لە گوێرەکە پەرستن وەریان گێڕێ سوودی نەبوو، هەر لەسەری بەجیزبوون هەتا موسا هاتەوە موسا ئامۆژگاری کردن و بەجولەکەکانی فەرمو: ستەمتان لە خۆتان کردووە بە پەرستنی گوێرەکە، ئەوانیش پەشیمان بونەوە، بۆیە خوای گەورە فەرمانی پێدان خۆیان بکوژن، ئەوانیش دەستیان دایە خۆ کوشتن خوای گەورە پەشیمان بونەوەکەی لێ وەرگرتن و دڵیان خۆشبو، ئەم باسە چەند جارێ باس ئەکرێ لە قورئانی پیرۆزدا، هەر جارێ بە جۆرێکی تەواو کەر بۆ ئەوەی پێشەوەی خۆی.

ئەم چیرۆکە چەندین سود پەندی تێدا بەدی ئەکرێ:

١- ئەوە ئەگەیەنێ ئۆمەتی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ چاکترین ئۆمەتە، چونکە جولەکەکان ئەو هەموو بەڵگانەیان بە چاوی خۆیان ئەبینێ کەچی دووای کردەوەی پڕ پوچ ئەکەوتن بە زۆری، بەڵام موسلمانان لەگەڵ ئەوەیشدا پێویستیان هەبوو بە بەڵگەی بەهێزبۆ ناسینی قورئانی پیرۆز، نرخیان بۆ درۆو دەلەسەی دوژمنان دا نە ئەنا بڕوای بێگومانیان بە قورئانی هەبوو، ئەوەیش ئەوە ئەگەێنێ موسڵمانان ئاقڵترو زیرەکترن.

٢- پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەم چیرۆکەی ئەگێڕایەوە لەگەڵ ئەوەیش نەخوێنەواربوە، ئەوەیش بەڵگەیە بۆ ئەوەی بەسروش زانیوێتی.

٣- ئەو چیرۆکە بۆمان دابین ئەکا کوێرانە دووای کەس ئەکەوین بگەڕێین بەدووای بەڵگەی بێگوماندا، ئەك وەك جولەکەکان بەبێ بەڵگەو ووردبوونەوە دووای موسای سامیری کەوتن و دەستیاندایە گوێری کە پەرستنی.

٤- خوای گەورە بەم چیرۆکە دڵخۆشی پێغەمبەر ئەداتەوە ئارام بگرێ‌و خۆ ڕاگرێ بەرانبەر خراپەو نالەباری بت پەرستەکانی عەرەب، هەرووەك موسا خۆ ڕاگربو بەرامبەر بە کردەوەی گێلانەی کوڕانی ئیسرائیل.

لێرەدا ئەوەتان بۆ ڕۆن ئەبێتەوە خوای گەورە ئەو پەڕی میهرەبانە بۆ موسڵمانان پەشیمان بونەوەیان بەپاڕانەوەلێ‌ی وەرئەگرێ، بێ ئەوەی فەرمانیان پێ بدا خۆیان بکوژن بە پێچەوانەوە بۆ جولەکەکان کاتێ پەشیمان بونەوە یان لێ وەرگیرا فەرمانیان پێ درا خۆیان بکوژن، هەرووەکو ئێمە ئەگەر بە ناڕەوایی مرۆڤی بکوژین پەشیمان بونەتەوەمان لێ وەرناگیرێ هەتا خۆمان نەدەن بەدەستی خاوەن مافەوە بۆ کوشتنمان.

﴿وإذ قلتم یاموسی لن نؤمن لك حتی نری الله جهرة﴾ وە بیری ئەوکاتە بکەنەوە ئێوە ووتتان: ئەی موسا بەدەنگی بەرزەوە ئێمە بڕوا بەتۆناکەین کە ئەڵێت پێغەمبەرم هەتا خوا نەبینین بە ئاشکرا بەبێ پەردەو هیچ شتێ نەبێ لەنێوان ئێمەو خوادا، ئاگادارمان بکا کە پێغەمبەرو نێراوی خوای، ئێمە نازانین ئەوکەسانەی گومانیان لەبونی خوادا هەیە لەم چەرخەی ئێمەدا بەبێ بەڵگە، بۆ لاسایی جولەکەکان ئەگەنەوە لەبێ باوەڕی و چەندە بازییان؟ جولەکەکان ئەیان ووت بەموسا: باوەڕ بەتۆ ناکەین هەتا خوا نەبینین، ئەوانەی ئەم سەردەمیش ئەڵێن: ئەوەی هەستی پێ ئەکەین بە چاوایا بەشتی‌تر نابێ هەبێ، هەرووەها ئەو چەنە بازیانە تازەنیەو کۆنە لەگەڵ بوونی مێژوودا پەیدا بووە و ئەیجونەوە چین بەچین هاتووە خۆیان کێف ئەکەنەوە لەناو چوونو هیچ شتێکیان سەوز ئەکردووە.

ئایین و ئایین پەرستان بەکوێرایی چاویانەوە بەردەوامن، زۆرترین لەوانەی دووای فەرموودەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ نەکەوتوون بەگوێرەی ... خۆیان ئەدوێن وئەڵێن: خوای

گەورە ئەمڕۆو پاشە ڕۆژیش نابینرێ، بەڵام کۆمەڵی دەستیان گرتووە بەڕەوەشتی پێغەمبەرو موسڵمانە پێشووەکان ئەڵێن: بینیی خوا لە جیهاندا دروست نیە، لەپاشە ڕۆژو بەبێ گومان ئەبینرێ جۆرەکانی و چۆنێتی ئەو بینینە گرنگ نیە، با ئێمە نەتوانین شی بکەینەوە.

﴿فأخذتكم الصاعقة﴾ دووایی کوتوپڕ ئێوەی گرت و دای بەسەرتانا لەلایەن خوای گەورەو هەروە گرمە و بەڵایی هەمووتان مردن بەهۆی ئەو ووتە گەورەو بێ شەرمیەوە، ئیتر ئەو بەڵایە بەئاگربێ یا بەدەنگێکی سەخت و بەرز گرنگ نیە، ئەوەی گونجاو بێ هەمویان مردن بەهەرشتێ بێ .

﴿ وأنتم تنظرون ﴾ وەئێوە بەچاوی خۆتان ئەوەی بوبەهۆی مردنتان ئەتانبینی .

﴿ ثم بعثناكم من بعد موتكم ﴾ لە پاشا ئێمە ئێوەمان زیندو کردوە لەدووای مردنتان بەو بەڵایە هەتا ئەوەی ماوەتەوە لە ژیانی تەمەنی دیاری کراو بۆتان کۆتای پێ دیێ، ئەوفەرمودەیە گەورەترین بەڵگەیە بکرێ بەوێنە بۆ زیندو بونەوە لە دووا ڕۆژدا.

ئەوەی جێگەی باوەڕ بێ ئەوکەسانە هەمویان مردن جگە لەموسا. بەڵام موسا بێهۆشی بەسەردا هات، ئەوەتە خوا ئەفەرموێ: ﴿فلمّا أفاق﴾ یانێ موسا کاتێ بێدار بویەوە لە خوا پاڕایەوە خوا هەمویانی زیندوکردەوە.

ئەوەی جێگەی سەر سوڕمانە ئەمەیە: هەندێ لە زانایانی ئەم چەرخە کە مامۆستا (موحەمەد عەبدەیە) یەکێکە لەو کەسانە ئەڵێن: خوا نەیگێڕاونەتەوە بە زیندوی بۆ جیهان دوهەم جار بەزیندویی، بەڵکو مانای زیندوبونەوەیان وا لێ داوەتەوە نەوەی زۆریان لێ ئەکەوێتەوە، یەکێ تریش لە مامۆستایان کەبەزمانی کوردی مانای ئەم جێگەیەی کردوە دووای ئەوان کەوتوە، ئەو مامۆستایە بریتی‌یە لە شێخ موحەمەدی خاڵ، لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێزم بۆیان بەچ بەڵگەیە لەمانای دەرکەو توی ئاشکرای ئەو ئایەتە لایانداوە، بەڵام زانایانی بروا بێ کرای کۆن وتازە بڕوایان وایە بۆجاری دووهەم زیندو کراونەتەوە، وە ئەویش ڕاستە و بێ گومانە، نابێ لەمانای دەرکەوتوی قورئان لابدەین بەبێ بەڵگە، لەگەڵ

ئەوەیشدا ئەو کارە بۆ خوا ئاسایی و ئاسانە و گران نیە، وێنە ئەوەیـە: زینـدوا کردنـەوەی عوزەیر پێغەمبەر کە گومانی تێدا نی‌یە وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿فأماته الله مئة عام ثـم بعثـه﴾ یانی دووایی خوا مراندی سەد ساڵ لەپاشا خوا زیندوی کردەوە.

﴿لعلكم تشكرون﴾ بۆئەوەی ئێوە سوپاسی خوا بکەن کە لەدووای مردنتـان زینـدوی کردنەوە، بۆ ئەوەیش ئێوە و جگە ئێوە تەمێ خوار بن و پەرستنی خوا بەجێ بهێنن.

ئەوەی شایانی باسێ خوای گەورە بەناوەڕۆکی ئـەم ئایەتـە بـۆ ئەوکەسـانەیە لەسـەردەمی موسادا داوای چاوپێکەوتنی خوایان کرد. کەواتە هـەموو جولـەکـەکانی ئـەم سـەردەمە و لەمەودووا ناگرێتەوە ژمـارەی ئـەو کەسـانەی لـەخنکاندن ڕزگاریـان بـو، ژمـارەی ئـەو کەسانەی بەهۆی کوێرەکە پەرسـتنەوە کـوژران دیـاری نـەکراوە، جێگـەی سەرسـوڕمانە هەندێ لەزانایان بەبێ بەڵگە لە گیرفانی خۆیانەوە باسـی هـەندێ شـتیان کـردوە ئـەڵێن: ژمارەی ئەو کەسانە خۆیانیـان کوشـت بـۆ ئـەوەی پەشـیمان بونـەوەیان لێ وەربگـیرێ و گوێرەکـەیان پەرسـت (٧٠٠٠٠) حـەفتا هـەزار کـەس بـون ، ژمـارەی ئـەو کەسـانەی ڕزگاریان بو لە خنکان (٦٢٠٠٠٠) شەش سەدو بیست هەزار کەس بون جگە لـە ژن و پیرو منداڵ هەروەها ژمارەی لەشـکری فیرعـەون کـە کەوتنـە دوای کوڕانـی ئیسـرائیل و خنکان ئەوانیش بەڵگەی ڕاست بۆ دیاری کردنیـان نیـە. بـەڵام بـۆ دیـاری کردنـی ئـەو کەسانەی داوای چاوپێکەوتنی خوایان کردبو هەیە کە حەفتا کەس بون.

ئەو هەموو بەڵگەو نیشانە زۆرانە خوا بەخشیبوی بـە جولـەکـەکان و ئـەو لێ بـوردن و خۆشبڕنانەی خوا کاری نەکردە سەر سروشتی پیسیان، بڕوایـان بـە هیـچ شـتێ نـەبو بـە جۆرێ هەستی پێ بکرێ، لەگەڵ ئەوەیشدا دەم درێژی و چەنەبازی زۆریان ئەکرد، جگـە لە دارو فەلاقە وولامی هیچ شتێ تریان نە ئەدایەوە، ئەو کارانە ئەوە ئەگەێنێ ئەو ماوەیە بـە چەوساوەیی و کۆیلەی لەگەڵ ستەمی فیرعەون بردویانە سەر خوڕەوشتی تێکدابون، ئـەبێ چ شتێ لەوە خراپتر بێ ئەو چەوسانەوە و یاخی بونەی فیرعەون پەیدای کردبـێ لـەواندا؟

ڕێزو ڕەوشتی چاکیانی تەفرو تونا کردبو، ناموسی تێك دابون، بەندایێتی تێدا ڕەواندبون بۆ جگەی خوا، هەرکاتێ دارو لێدانیان لەسەر هەڵگیرایە یاخی ئەبون و لەخۆیان بایی ئەبون، ئینەت ڕەوشتی جولەکەکان ئەبێ هەر وابێ، وەکو بەچاو ئەبینرێ لەوانەی بە فەلەستین و قودسی پیرۆزیان کردوە.

ئەو کردەوە پیسانە نەك بۆ جولەکەکانەو بەس، بەڵکو هەر کۆمەڵێك فێری بچوکی بێگانە بوبێ و سەربەستی بە خۆیەوە نەدیبێ بەزوی لە خۆی ئەگۆڕێ و لەخوا یاخی ئەبێ، دەست ئەکا بەکوشتن و تالآن و داوێن پیسی، پەلاماری ئاینی خوا و ئایین پەروەران ئەدەن، ئەوەی جولەکەکان ئەیکەن ئەوانیش بە زیاترەوە ئەیکەن، ڕەگزپەرستی بەکاردێنن، وەك ئەوەی ڕژێمی عێراق ئەیکا بە کوردەکان (١٨٢٠٠٠) سەدو هەشتاو دوو هەزار کوردی زیندە بەچاڵ کرد، (٥٠٠٠) شارو شارۆچکەو گوند و دێهاتی ڕوخاند، بە هەزاران کەسی ئاوارە کرد بەئاگاداری هەمو ڕژێمە بەناو موسڵمانەکانەوە، کیمیا بارانی هەڵەبجە و جێگاکانی تر شایەنی ئەو ڕاستیێەن.

کورتەی مانای ئەو دوو ئایەتە: موسا لە کێوی تور گەڕایەوە بۆلای خزمانی، ئەی بینی کە گوێرەکە ئەپەرستن، دوای ئەو گلەیی و بناشتەی لە نێوان موسا و هاروندا پەیدا بو لەبارەی گوێرەکە پەرستنەوە موسا پێغەمبەر، موسا میری بانگ کرد و سەرزەنشتی کرد و دەری کردو گوێرەکەکەی سوتاند و خۆڵەکەی فڕێ دایە ناو دەریاوە، دوای پەشیمان بونەوەی جولەکەکان و داوای لێ بوردن لە خوا بۆ ئەوانەی گوێرەکەیان پەرستبو، موسا لە پیاو چاکانیان (٧٠) حەفتا کەسی لێ هەڵبژاردن، چونە دەرەوە بۆ کێوی تور، داوایان لەموسا کرد گوێیان لە فەرمودەی خوا بێ لەگەڵ موسا ئەیکا، موسا داوای کرد و خوا لێی وەرگرت، کاتێ نزیکی کێوەکە بونەوە هەورێك هەمو کێوەکەی داپۆشی، موسا خۆی و خزمانی چونە ژێرە هەورەکەوە، هەموکاتێك خوای گەورە لەگەڵ موسادا گفتو گۆی بکردایە ڕوناکیێکی یەکجار زۆر و بەتین ئەیدا بەنێو ڕومەتی موساداکەس نەی ئەتوانی

تەماشای بکا، گوێیان لەهەمو فەرمودەکانی خوا بو، لەو کاتەدا خزمانی موسا لەخۆیان بایی بون، داوای چاوپێکەوتنی خوایان کرد بەو بۆنەیەوە خوا هەمویانی مراند، موسا گریا و پاڕایەوە و دەستی بەرز کردەوە و، داوای لە خوا کرد زیندویان بکاتەوە. ئەو باسە لەمەو دووا بەدرێژی و شی کراوەیی تر باسی ئەکرێ.

﴿وظلّلنا عليكم الغمام﴾ وە ئێمە هەورێکمان کرد بە سێبەر بەسەرتانەوە لە بیابانی سینادا هەتا بتان پارێزێ لە گەرمایی ئەو دەشتە وشکە و چۆڵەی (تەیهەدا) بۆ هەرلایە بچونایە بەسەرتانەوە بو.

﴿وأنزلنا عليكم المنّ والسلوى﴾ وە ئێمە ناردومانە خوارەوە بەسەرتانا لەو چۆڵەوانیەی سینادا و لەو بێ ئاویەدا گەزۆ و شۆ کە بەسەر درەختەکاندا، ڕەنگەکەی وەك بەفر و تامەکەی وەك هەنگوین هەرلە ڕۆژ بونەدا هەتا کەوتنی هەتاوی خۆر و نارومانە خوارەوە بەسەرتانا شێلاقە، باڵندەیە لە ئاسمانەوە ئەهاتە خوارەوە، بە گوێرەی پێویستی خۆتان کۆتان ئەکردەوە وە سەرتان ئەبڕین.

﴿كلوا من طيبات مارزقناكم﴾ ئێمە بە ئێوەمان ووت: ئێوە بخۆن ئەو خواردەمەنیە پاك و خۆشانەی شتی ئێمە بەخشیومانە بە ئێوە لەو گەزۆو شێلاقە یەرژاند ومان بەسەرتانا بەبێ ماندوبون، هەڵیان مەگرن و مەیان شارنەوە، وابزانن کۆتایی پێ دێت، پشت بە خوا ببەستن، چاو چنۆك و بێ بڕوا مەبن بەخوا و بزانن نامێنێ.

﴿وما ظلمونا﴾ وە ئەو کەسانە ستەم و زیان لە ئێمە نادەن کە بێ فەرمانی ئێمە ئەکەن و پشتتیان بە ئێمە نەبەستوە.

﴿ولكن كانوا أنفسهم يظلمون﴾ وە بەلاّم ئەو کەسانە بەو بێ فەرمانیەی ئێمە ستەم لە خۆیان ئەکەن، خۆیان توشی نەگبەتی ئەکەن بەوەی ئێمە لەوانمان گرتەوە ئەو ڕۆزیە کە بەبێ ماندو بون بەسەرمانا ئەڕێژان.

کورتەی ئەو ڕوداوە: ئەو کاتەی کوڕانی ئیسرائیل بە فەرمانی خوا لەمیسر چونە دەرێ بێ فەرمانی خوایان کرد لە دەشتی (تەیهدا) و سەریان لێ شێوا، ڕێگەیان بـۆ هیـچ لایـێ دەرنە ئەکرد، پەنایان بۆ موسا برد و ووتیان، لـە گـەرمانا برژایـن و برسـیمانە و تینومانـە خوای گەورە هەوری بۆ کردن بە سێبەر ، گەزۆ و شێلاقەی بەسەردا ڕێژان لە گەرمایی و برسێتی و تینوێتی ڕزگاریـان بـو، دەسـتیان کـرد بـە خواردنـی گـەزۆ و شـێلاقە لەگـەڵ خواردەمەنی تردا.

وَإِذْ قُلْنَا ٱدْخُلُوا۟ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةَ فَكُلُوا۟ مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ رَغَدًا وَٱدْخُلُوا۟ ٱلْبَابَ سُجَّدًا وَقُولُوا۟ حِطَّةٌ نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطَٰيَٰكُمْ ۚ وَسَنَزِيدُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٨﴾ فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ قَوْلًا غَيْرَ ٱلَّذِى قِيلَ لَهُمْ فَأَنزَلْنَا عَلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ رِجْزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿٥٩﴾

ئەو ئایەتانە درێژە پێدانی ئایەتـەکانی پێشـوە، هاتونەتـە خـوارەوە بـۆ هـەڵبژاردنی ئـەو چاکانە خوا دابونی بە جولەکەکان، کەچی ئەوان پێی لێ نـانێن، لـەو کاتـەدا سـەریان لێ تێك چوبو لەدەشتی سینادا، وە ئەفەرموێ.

﴿وإذ قلنا ادخلوا هذة القرية﴾ وە ئێوەی بەنی ئیسرائیل بیری ئەو کاتـە بکەنـەوە ئێمـە وتمان بە باوباپیرتان لەسەر زمانی موسا: ئێوە بچنە نێـو ئـەو دێیـە، کاتـێ پێـم ووتـن ئێـوە ڕێگەتان لێ ونبوبو لە چۆڵەوانی سینادا، کە ئەهاتن و ئەڕیشتن، نەتان ئـەزانی سـەر بۆچـی لایەکی دەرکەن: ئەو دێیە بریتی‌یە لە (بیت المقدس) یان بریتی‌یە لە (ئەریحا) لە نزیك (بیت

المقدس)ەوە، هەرکامیان بێ مەبەستەکە ناگورێ. خوا فەرمانی پێ دان بڕۆن و خۆیان ڕزگار بکەن لە چۆڵ و دەشتی سینا، پاش ماوەی (عاد) کەلەوێ مابون دەریان کەن و خۆتان لە جێگەیان دانیشن کوڕانی ئیسرائیل زۆر لەو تاقمە ئەترسان بەلایانەوە وابو پالەوان و ئازان ئەمان پێیان ناوێرن بۆیە نەڕۆیشتن و پشتیان کردە فەرمانی خوا.

﴿فکلوا منها حیث شئتم رغداً﴾ دوایی ئێوە بخۆن لە بەرهەم و میوەی ئەو دێیە لە هەر شتێ ئێوە ئارەزۆی ئەکەن و هەرجێگەیە خۆتان ئەتانەوێ بەخۆشی نۆشی گیانتان بێ ، ئەم فەرمانە دوای ئەوەبوە کە گەزۆ و شێلاقەتان لێ بڕا، لەو دێیەدا کەس بەرهەڵستیتان ناکاو تەنگ و چەڵەتان نامێنێ و پرسیارتان لێ ناکرێ.

﴿وادخلوا الباب سجّدا﴾ وە ئێوە بچنە نێو ئەو دێیە و لەنێوەرگایەکەوە موسا بۆتانی دیاری ئەکات بە کوڕنوش و سوجدە بردنەوە بۆ خوا، بۆیە ئێوە بەفەرمانی موسا بکەن چونکە ئێوە نابەڵەندن و نەچونەتە نێو ئەو دێیە.

﴿وقولوا حطّة﴾ ئێوە بڵێن: خوایێ داواکاری و فرمانی ئێمە ئەوەیە گوناهمان هەڵوەرێنی و لێمان ببوری، ئەو دێیە بکەیتە جێگەتان.

﴿نغفر لکم خطایاکم﴾ ئێمە خۆش نەبین لە گوناهەکانتان دوای ئەوەی سوژدەتان برد و دوای لێ بوردن بکەن بەکزۆڵێوە بەرانبەر بەئێمە.

﴿وسنزید المحسنین﴾ وە ئێمە زۆرتر ئەکەین پاداشتی ئەو کەسانەی چاکە کەرن ئەوانەتان گوێرەکەتان نەپەرستبو، گەزۆ و شێلاقەتان هەڵنەگرتبو و پشت بەستبون بە خوا، ئەو کەسانەی ترتان گوێرەکەتان پەرستبو گەزۆ و شێلاقەتان هەڵگرتوە پەشیمان بنەوە و داوای لێ بوردن بکەن لێتان خۆش ئەبم.

﴿فبدل الذین ظلموا قولاً غیر الذي قیلَ لهم﴾ دوایی گۆڕییان کەسانێکی ئەوتۆ ستەمیان لە خۆیان کردبو فەرمودەیە بەوان بێژا بەجگەی شتێکی ئەوتۆ بێژرابو بەوان، یانێ ئەوان فەرمانیان پێدابو بچنە نێو شاری قودسەوە کەچی نەچون. لە خوا بپاڕێنەوە و کارێکی

وابکەن خوا لەوان خۆشبێ نەیان کرد، ئەو ستەمەی ببێتە هۆی سزا دانیان و تۆڵەیان لێ بکرێتەوە کردیان، لەباتی گوێی ڕایەڵی پشتیان کردە فەرمانی خوا، ئەوەی بیفەرموایێ نەیان ئەووت. لاقرتیان پێ ئەکرد و یاخی و سەرکێشی ئەبون و گوناهیان ئەکرد.

﴿فأنزلنا علی الّذین ظلموا رجزاً من السماء﴾ دوای ئەو کردەوە خراپانە ئەوان کردنیان ئێمە ناردمانە خوارەوە بەسەر کەسانێکی ئەوتۆ ستەمیان کردبو لە خۆیان سزایێکی گران و دیاری کراو بۆیان لە ئاسمانەوە.

﴿بما کانوا یفسقون﴾ بە هۆشێکەوە لە سنور ی لایان دابو، لە فەرمانی خوا دەرچوبون، خوای گەورە ئەو سزایەی دیاری نەکردوە، ئیتر چاوە قولە بێ یا بەفری زۆر هەروەها ژمارەی لەناو چوەکانی بەو سزایە دیاری نەکردوە زۆر بوبن یا کەم، ماوەی کات ژمێری یا ڕۆژی گرنگ نیە، ئەوەی شایەنی باس بێ ئەو بەڵایە توشیان بوە زۆریشی لەناودان.

وَإِذِ ٱسْتَسْقَىٰ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ فَقُلْنَا ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْحَجَرَ ۖ فَٱنفَجَرَتْ مِنْهُ ٱثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا ۖ قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ ۖ كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ مِن رِّزْقِ ٱللَّهِ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٦٠﴾

هەروەك ئەوەی خوای گەورە ئاسانی کرد بۆ کورانی ئیسرائیل خواردەمەنی لە دەشتی سینادا، بەو هەورە سێبەری بۆ کردن، تێر ئاویشیان ئەکا بەهۆی پاڕانەوەی موساوە وەك ئەفەرموێ:

﴿وإذ استسقى موسى لقومه﴾ وە بیری ئەو کاتە بکەنەوە موسا داوای ئـاوی کـرد لـە خوا بۆ تاقمەکەی خۆی لەوکاتە تینویان بو ئاویـان دەسـت نـە ئەکـەوت، دەسـتیان کـرد بەچەنەبازی و گلەیی و بناشت لەگەڵ موسادا، تۆ ئێمەت لـە میسـر دەرکـرد و دەسـتت برین، ئێمە لەچیمان کەم بو لەوێدا. چ شتێکمان پێ ئەکەی لەم بـێ ئاویـەدا؟ بـۆ ئـەوەی جولەکەکان بۆڵە بۆڵ نەکەن خوا بە موسای فەرمو:

﴿فقلنا اضرب بعصاك الحجر﴾ دوایی ئێمە بە موسامان ووت، تۆ بـدە داردەستەکەت لەو بەردە موساش بەداردەستەکەی کێشا بەو بەردەدا.

﴿فانفجرت منه إثنتا عشرة عينـا﴾ هـەڵقولا لـەو بـەردە (١٢) دوازدە کانیـاو ئـاوی شیرین، بە ئەندازەی ژمارەی نەوەی (١٢) دووازدە کوڕانی یەعقوب پێغەمبەر . وەك خـوا ئەفەرموێ.

﴿قد علم كلّ أناس مشربهم﴾ بەڕاستی هەمو کەسـێکتان لـەو (١٢) دووازدە بـەرەیێ ئەیانزانی بە جێگەی خواردنەوەی ئاوی کانیاوی خۆیان، هیچ لایـەکیان دەسـت درێژیـان بۆسەر کانیاوی ئەوی تریان نە ئەکرد، ئەو زانینەیشیان پێویست بو بۆ ئەوان، چونکە هەمو بەرەکان ڕەگەزپەرست بون خۆیان هەڵ ئەکیشا بە ڕێـز داری تـری بـەرەی خۆیـان. هیـچ بەرەێکیان ژنیان لەوی تریان نە ئەخواست خۆیان بەگەورەتر دائەنا، هەریەکـەیان بەتـەنگ زۆرکردنی خۆیانەوە بون، با بەلەناوچونی بەرەکەی تریان بێ، بۆیـە خـوای گـەورە (١٢) دووازدە کانیاوی بۆ دروست کردن هەروەك (١٢) ڕێگـەی لـەدەریای سـوور بـۆ دابـین کردن ، خوا فەرموی :

﴿ كلوا واشربوا من رزق الله ﴾ ئێوە بخۆن و بخۆنـەوە لـەو خواردەمەنیـەی خـودا بـۆ ئێوەی دروست کردووە لەگەزۆ و شیلاقە و ئاوی هەڵقولاو لەو بەردە .

﴿ولاتعثوا في الأرض مفسدين﴾ وە ئێوە خراپە بڵاو مەکەنەوە لەزەویدا بەخراپە کـردن و گێرە شێوێنی خۆتان، دەست درێژی بۆ سەرپاکژ و پاوەنی مەڕو ماڵاتی یەکتری مەکـەن.

با ئێوە نەبن پەچاوڵی کراوی خراپ بۆ کەسانی تر، ئـەو دوازدە کانیـاوە ئەگـەر لـە ڕۆژ ئاوای سویسەوە بێ دورنیە، چونکە ئەو جێگەیە ئێستا پێی ئەوترێ کانیەکانی موسا، کـەمێ ئاویان هەیە، هەندێ دارخورمای تێدا ڕواوە.

ئەو داردەی موسا لە هەر درەختێ بێ، لـە چ لایەکـەوە دەسـتی کـەوتبێ، چ کەسـێك دابێتی بەو، ئەو بەردە ئاوی لێ هەڵقوڵاوە بەردی سینا بێ، یا لـەجێگەیێ تـرەوە هێنابێتیـان، بەردەکە چوار گۆشەبێ یا لاکێشبێ، خڕبێ یا پان، گرنگ نیە. هەڵقوڵانی ئاو لـــە بـەردی ڕەق بە لێدانی دار دەستی موسا لە توانای مرۆڤدا نیە. جگە لە خوا ، کاری نا ئاسایی بەو جۆرە لە توانایی کەسی تردا نیە.

بەڵام بۆ خوا هەمو شتێ ئاسانە بە فەرمودەی خۆی: ﴿کن فیکون﴾ واتە تۆ ببە کوتو پڕ ئەبێ. هەروەك پچڕانی دەریا و وەستانی ئاو بە وێنەی کێوەکان، هاتنە خوارەوەی گـەزۆ و شێلاقە لە ئاسمان ، گێڕانی ئاگر بە ساردی. لە دایکبونی عیسا بێ ئەوەی مێردی هەبێ بـە پاکی و بێ داوێن پیسـی. زیندوکردنـەوەی مـردوان. دروسـت کردنـی بـاڵدە لـە قـوڕ. دروست کردنی بونەوەران لە نەبونەوە یەکەم جار. کەواتە هەرکەسێ باوەڕی بەخوا و بــە توانای خوا هەبێ ئەو بەڵگانەی بەسە، هەرکەسێ بـاوەڕی بـەخوا نـەبێ باوەڕیشـی بەوانـە نابێ. ئێمەی باوەڕدار بڕوای بێگومانمان بەو کارانە هەیە.

وَإِذْ قُلْتُمْ يَـٰمُوسَىٰ لَن نَّصْبِرَ عَلَىٰ طَعَامٍ وَٰحِدٍ فَٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُخْرِجْ لَنَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ مِنۢ بَقْلِهَا وَقِثَّآئِهَا وَفُومِهَا وَعَدَسِهَا وَبَصَلِهَا ۖ قَالَ أَتَسْتَبْدِلُونَ ٱلَّذِى هُوَ أَدْنَىٰ بِٱلَّذِى هُوَ خَيْرٌ ۚ ٱهْبِطُوا۟ مِصْرًا فَإِنَّ لَكُم مَّا سَأَلْتُمْ ۗ وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ وَٱلْمَسْكَنَةُ وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ ۗ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ وَيَقْتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ۗ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ﴿٦١﴾

کوڕانی ئیسرائیل لە نێو بیابانی (سینا)دا بەو وشێکەو بەردەلانیە و هەیبو، لە ژێر ئەو ئاسمانە گەرمەدا، خوای گەورە لەو بەردە ڕەقە ئاوی بۆ هەڵقوڵاندن، لە ئاسمانەوە گەزۆو شێلاقەی بەسەر درەختا بۆ ڕێژان، بەڵام تینەت و خوێکی پارچە پارچە کراوی پەست و ڕزاوکاری کردە سەر ڕەوشتیان نەی هێشت بەو ئاواتە بگەن لە میسر بۆی دەرکرابون، هەر لەبەر ئەو مەبەستە بەرزە لەو بیابانەدا مابونەوە. خوای گەورە بە پێشەوایی موسا لە گاڵتە پێ کراوی و ژێردەستەیی ڕزگاریان بکا. بەڵام ئەو مەبەستە گەورەیە و ئەو سەربەستی‌یە بەبێ نرخ دەست ناکەوێ، ئەو فەرمانە خراوەتە ئەستۆیان پێویستە خۆیانی بۆ بەخت بکەن. بەڵام ئەوان نەیان ئەویست ئەو نرخەی بۆ بدەن، ئەو شتەی داوا کراوە لێیان بەجێ‌ی بهێنن و خۆیانی بۆ بەخت بکەن، بگرە ئەو ژیانە نزمەی دەقیان پێوە گرتبو

نەیان ئەدا بەژیانێکی تازە و خۆش و بەرز، هەتا بەرەو ئاواتی گـەورە و سەربەسـتی و رێـز بکەونە رێگە، جولەکەکان ئەو میوە رەنگاو رەنگەی لە میسردا دەقیان پێوە گرتبـو ئـەیان ویست، لە نیسك و سیر و پیاز و خەیار جابۆ ئەوانەی ڕابوردن خوا ئەفەرموێ:

﴿وإذ قلتم ياموسى﴾ وە ئێوە بیری ئەو کاتە بکەنەوە ئەتان ووت: ئەی موسـا: لـێرەدا خوای گەورە بیریان ئەخاتەوە کردەوەیە تری خراپی باوباپیریـان و سـوپاس نـەکردنیان بـۆ خوا بەرامبەر بە چاکەی خوا، جولەکەکان ئەیان ووت بـە موسـا لـە چۆلـەوانی سینادا: خواردەنی گەزۆ و شێلاقە لەبەرچاومان کەوتوە، بیری خواردەمەنی جۆربەجۆری میسـریان ئەکردەوە بۆیە بۆڵەیان ئەکرد و ئەیان ووت:

﴿لن نصبر على طعام واحد﴾ ئێمە ئارام ناگرین لەسەر خواردەمەنی تەنها بە بەردەوامی مەبەستیان لەو خواردەمەنی‌یە گەزۆ و شێلاقە بو کە بەبێ ماندو بـون دەسـتیان ئەکـەوت، بۆیە بە موسایان ووت:

﴿فادع لنا ربك يخرج لنا مما تنبت الأرض﴾ کە واتە تـۆ داوا بکـە لـە پـەروەردگاری خۆت: دەربهێنێ بۆ ئێمە و بۆمانی پەیدا بکـا هـەندێ لـەو شـتەی زەویـی ئـەی ڕوێنـێ و سەوزی ئەکا.

﴿من بقلها﴾ لە سەوزە پاکەکانی زەویی وەك کەوەر و کەرەوز و پنگە و سەوزەی‌تر.

﴿وقثائها وفومها وعدسها وبصلـها﴾ ولـە تـرۆزی و سـیر و نیسـك و پـیازی زویـی. ووشەی (فوم) بەمانا گەنم و نۆك هاتوە. ئەگەر داوای گەنم و نۆکیشـیان کردبـێ دور نیـە کەواتە ووشەی (فوم) گەنم و نۆك و سیریش ئەگرێتـەوە، موسـا زۆر سـەری سـوڕما لـەو داوایەی ئەوان. بە توڕەییەوە فەرموی:

﴿قال أتستبدلون الذي هو أدنى بالّذي هـو خـير﴾ موسـا ووتـی ئایـا ئێـوە ئەگۆڕنـەوە شتێکی ئەوتۆ پەست و بێ ڕەواجە کە ئەو شتەیە ئێوە داوای ئەکەن بەوەی ئەوتۆ ئـەو شـتە چاکترە بۆ ئێوە کە گەزۆ و شێلاقەیە. زێڕ چۆن ئەگۆڕێتەوە بە مس. واتە گـەزۆ و شـێلاقە

نزیکە لێتانەوە و نرخی گران ترە، چۆن ئەی گۆڕنەوە بەو شتانەی ئێوە داوای ئەکەن و دورە لێتانەوە و نرخیشی کەمترە. ئەگەر ئێوە وازنایەرن و بەچێزن لەسەر داواکاری خۆتان.

﴿إهبطوا مصراً﴾ ئێوە دابەزن و بڕۆن بۆ نێو شارێ لەشارەکان بەتایبەت شاری قودس. لەم چۆڵەوانیەی تەیهەدا لاچن و بەرەو شارێ بکەونە ڕێ، ئیتر پاڕانەوەی پێویست نیە، ئەوەی بتانەوێ لەو شارەدا دەستان ئەکەوێ.

بەجۆرێ تر مانای ئەم ڕستەیە کراوە: بڕۆنەوە بۆ میسر کەلێی دەرچوون، بڕۆنەوە بۆلای ئەو ژیانە پەستە و سەرشۆڕییەی دەقتان پێوە گرتوە، لەوێ نیسك و پیاز و ترۆزی و شتی ترتان دەست ئەکەوێ. واز لەم فەرمانە بەنرخە بێنن لێتان داواکراوە، شایستە ئێوە نیە، ئەو گفتوگۆی موسایە بۆ سەرزەنشتی جولەکەکانە و ئەیش فەرموێ:

﴿فإنّ لكم ماسألتم﴾ دوایی بەراستی بۆ ئێوە ئەبێ ئەو شتەی داواتان کردوە، واتە ئەوەی ئێوە داواتان کردوە لە نێو شاراندا دەست ئەکەوێ، نەك لە تەیها، لەوێ هەمو کەسێ ئەو شتانەی دەست ئەکەوێ و زۆریشن، بەلاّم بڕوا ناکەم ئێوە ئەوەندە ئازابن بڕۆن بۆ شارێ داگیری بکەن و بەخۆشی بژین لەو شارەدا.

﴿وضربت عليهم الذّلة والمسكنة﴾ وە دراوە بەسەریانا کزۆلّی و هەژاری، نەك هەژاری دارایی، بەلّکو هەژاری دڵ و دەرون، جولەکە هەر چەندە ساماندار بێ لەدلاّ هەر هەژارە و تێر ناخوا، واتە جولەکەکان و سەربەرز و سەربەخۆ بون و خواردەمەنی و هۆی گوزەرانیان بە فراوانی و ئاسانی بە سەریانا ئەڕژا لەدەشتی سینادا، ئەو گوزەرانە چاکە و بەرزەیان نەویست ئەیان ویست بازرگانی و پیشەسازی و کشت و کاڵ بکەن، نەیان ئەزانی ئەوانە ئەبنە هۆی دووبەرەکی و جەنگ و ئاژاوە و کێشمە کێش و کوشتن و بێ فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکانیان، بێگومان ئەوانەیش ئەبنە هۆی پەرتەوازەی خۆیان و ژێردەستەیی دوژمنانیان.

﴿وباءوا بغضب من الله﴾ وە ئەو جولەکانە گەڕاون بەوەی شایستەی خەشمێکی گەورەبن لە لایەن خواوە، ئەو خەشمە لەوان جوێ نابێتەوە.

﴿ذلك بأنهم كانوا يكفرون بآيات الله﴾ ئەوکزۆڵی و هەژاری و خەشمەی خوا بەسەریانەوە بەو هۆییە بو بڕوایان بە ئایەتەکانی خوا نیە، باوەڕیان بە قورئان و ئینجیل و موحەمەد و عیسا نیە، وە ناونیشانی پێغەمبەریان لە تەوراتا گۆڕیوە و کوژانویانەتەوە، سوپاسی ئەو ئیشانە گەورانە ناکەن خوا پێیانی بەخشیوە، وەکو بچڕانی ئاوی دەریا بۆیان، ڕاگرتنی هەور بەسەریانەوە، ڕژاندنی گەزۆ و شێلاقە بەسەر درەختەکاندا بۆیان، هەڵقو"لاندنی ئاو بۆیان لە بەردی ڕەق.

﴿ويقتلون النّبيّين بغير الحق﴾ و پێغەمبەرەکانیان کوشت بە جگەی ڕاستی و بە نارەوایی و بێ دادێ، وەکو کوشتنی شەعیا و زەکەریا و یەحیا و چەندین پێغەمبەری تر و هەوڵدانیان بۆ کوشتنی پێغەمبەریش ﴿ﷺ﴾.

﴿ذلك بما عصوا وكانوا يعتدون﴾ ئەوبێ باوەڕی و کوشتنی پێغەمبەرانە بەهۆی گوناە کردنی زۆریان و ئەوان لایاندا بو لە فەرمانەکانی خوا کە بونە هۆی دەست درێژیان بۆسەر پێغەمبەران و دڵ ڕەقیان و چەندین کاری تری خراپ.

جولەکەکان لەگەڵ ئەو هەموە کردە و خراپەیان پڕوپاگەندەی زۆری سەرسوڕینەریان بلاّو ئەکردەوە، وەلایان وابو کە هەر خۆیان ڕانوومایی کراون، هەر ئەوان بەتەنها گەلی هەڵبژاردەن بۆ خوا، هەرئەوان پاداشتی چاکەی خوا وەرئەگرن، ڕێزگرتنی خوا هەرتەنها بۆ ئەوانە، لێرەدا قورئانی پیرۆز بەدرۆیان ئەخاتەوە، هیچ گەلێ بەخۆیەوە نەدیوە ئەوەی جولەکەکان بە خۆیانەوە دیویانە لە دڵ ڕەقی و بێ باوەڕی و دەست درێژی و چاو چنۆکی و وەرنەگرتنی ڕانومایی ، کوشتن و سەربڕینی پێغەمەران و داهێنانیان بەمشار ، چ شتێ بێ لەوانە خراپتر ؟ لێرەدا باسی : هەڵسەنگاندنی لە نێوان سۆشیالیست و سەرمایەدارەکان ئەکەین بەڕاستی خوا بەخشیبوی بە بەنو ئیسرائیلی سێبەر و خواردەمەنی

و ئاوی شیرین بەبێ ماندو بون لە دەشتی (سینا) دا بەیەکسانی، نە هەژاریان بونە ساماندار. نە یەکێکیان برسی و ئەوی تریان تێر. نە یەکێکیان چەوساوە و ئەوی تریان ستەم کار. نەیەکێکیان خاوەن بەرهەم و ئەوی تریان ئارەق ڕێژ، نەستەم کردن لە دابەش کردنی سامان و بەرهەمیانا و هۆی ژیانیانا هەبو، هەمویان وەك یەك ئەژیان، هیچ شتێ لەوانەیان نەبو لەهەمو لایێکەوە، ژن و پیاو منالّ و گەرەیان بە یەکسانی ئەژیان، ئەو جولەکانە یەکەم گەل بون بەهاوبەشی بژین بەبێ جیاوازی نێوانیان، ئەگەر ئابوری و نەتەوایەتی و ڕەگەز پەرستی نێوان خۆیان نەبوایە، بێ بەهۆی جەنگ و گێرە شێوێنی و یەك کوشتن و داوێن پیسی، ئەو جولەکانە بۆچی یاخی ئەبون و لەفەرمان و ئامۆژگاری کەرێکی ئاسایش خوازی وەك موسا، ئەو کەسانە بۆ ئەبێ گوزەرانی یەکسانیان پێ ناخۆشبێ؟ لە چ شتێکیان کەم بو، بۆ ئەیان ووت: ئارام ناگرین لەم ژیانەی سینا بەبەردەوامی. بەرانبەر بەو هەموە چاکانە خوا لەگەلّی کردبون کەچی ئەوان هەر خەریکی بێ باوەڕی و گوناە کردن بون..

سۆشیالستەکان ئەلّێن هەمویان یا زۆربەیان: سەرمایە داری دایك و باوکی هەمو پەستی و ناخۆشێکە. بەلاّم سوشیالیستی سەرچاوەی هەمو ڕێز و خۆشی و بەختیاریە، ئەگەر ئەوە ڕاستە (مۆسکۆ و پەکین) هەردوولایان سۆشیالست بون، لەیەك بچڕان و یەکتری تاوانبار ئەکەن؟ بگرە لەیەکیشیان کوشت و پڕوپاگەندە بۆ یەکتری ئەکەن، ئاواتیان نەمانی یەکتریە، بەر لەوانیش ستالینەکان و نیتوبەکان لەیەك بچڕان، ڕۆمانیش دژی هەمویانە..

سەرمایە دارەکانیش لەنێو خۆیان پڕوپاگەندەی گلاّو بۆیەکتری ئەکەن، هەمو ڕژێمێ لەوان دژی یەکتری ئەدوێن، ئەوپەڕی توانای خۆیان بەکار ئەهێنن بۆ یەك کەوتنی خۆیان هەتا ئێستاو، لە ناوەڕۆکدا دژی یەکترین. هەرچەندە بەڕوالّەت یەکن بۆ چەوسانەوەی گەلانی هەژارو، بۆ دزینی سامانی گەلان، وەك بەچاوی خۆمان ئەی بینین، بگرە زۆر جاران جگە کەشماکەشیش پەلاماری یەکتری ئەدەن بەئاگر و چەکی ڕۆخێنەر، پەلاماری بەریتانیا بۆسەر ئەرجەنتین و ئێرلەندە چاکترین بەلّگەن.. هیتلەر ئەی ووت: جگە

لەڕەگەزی ئاری کەسێ تر شایانی مانەوە نیە. بەڵام زۆرترین دوژمنـانی وەك خـۆی ئـاری بون، لەدوایدا ئەو بیروباوەڕە گلاوەی سەری کێشا بـۆ لـەناو چونـی خـۆی و سەرشـۆڕ کردنی گەلانی ئەڵمان، بەمەلاین گەلانی تر لەناو چون، شارو پایتەختەکانیان کـاول بـون. دام و دەزگای شارستانیەت بەرەو پاش گەڕانەوە، بوبە بەوهۆی چاندنی دوبـەرەکی لـەنێو ئادەمیزادا. بەڕاستی هێزێکی ئاوارە و نهێنی هەن لە نێو ئادەمیزادا کە نایەنە ژمارە بۆ گێرە شێوێنی و کاری نارەوا، لەدەرەوەیشیەوە چەندین گیرو گرفتی زۆر و فراوان پاڵیـان پێـوە ئەنێ بۆچەوسانەوەی یەکتری، ئەو کەسەی بیەوێ بیان ژمێرێ کـارێکی نـەگونجا و ئـەکا، ئادەمیزاد لەگەڵ ئەوانەدا لە هەڵس و کەوتایە بـۆ دژی یـەکتری. پەنجـە درێـژ کـردن بـۆ ئابووری و هێزی ئاین و ڕەگەز پەرستی و بڕوا نەبون بەئاین بۆ پەیداکردنی ئاژاوەی نێـوان ئادەمیزاد بەکۆمەڵ یا بەتەنها کە هەریەکەیان هۆیەکی تایبەتین بـۆ ئەوانـە باسکران ڕاسـتە بەڵام هەژاری هۆیەکی بە هێزە بۆ کردنی کاری خراپ و گوناە کردن، زۆر جـارانیش بـە چاو ئەبینرێ بە هێزترین هۆیە بۆ ناکۆکی، بێزراوە هەژاری لە بێ باوەڕیەوە نزیکـە. بـەڵام هەر تەنها هەژاری نیە و بەس .. پێویستە لە بیرمان نەچێ و بزانین هەمو هـۆی ژیـان پـەیدا کرابێ بۆ ئادەمیزاد ئاسـایش و ئـارامی بـۆ سـاز نابـێ هـەتا بڕوایـەکی بـەتین و تـەواوی بەمرۆڤایەتی نەبێ، بڕوایەکی وابێ ڕێك بکەوێ لەگەڵ خوڕەوشتی بەرزدا و پاڵی پێوە بنـێ بۆ بڕوا بون بەئاین، هێزێکی وا پەیدا بکا لە مێشکا پاسە وان بێ بۆ گەڕانەوەی لـە کـاری پەست بۆ خۆی و بۆ مرۆڤایەتی، سود و زیانی هەموان بەهی خۆی بزانێ، ئەوەی بۆ خـۆی بیەوێ بۆ خەڵکیشی بەڕەوا دانێ، هەمو ئادەمیزاد لە ستەمی دڵنیا بن، ئـەو هـێزە بکـا بـە سەرباز و پۆلیس و پاسەوان بۆ خۆی، لە ترسی ئەو هێزە نـەتوانێ ستەم و ئـاژاوە بـەکار بهێنێ، هەموکەسێ لەلایەن خۆیەوە وابێ هەمو ئـادەمیزاد بـە ئاسـودەیی و برایـتـی ئـەژین، ئەوەش بەوە ساز ئەبێ جگە لەم ژیانە بڕوای بێ گومانی وابێ ژیانێکی تری نـەبڕاوە هەیـە، بڕوای وابێ لە دوا ڕۆژدا پاداشت و تۆڵە وەرئەگرێ، بێگومان ئـەوەش بـەبێ ئـاین پێـك

نایە، ئەو ئاینەش دارای ئەو یاساو پرۆگرامە بێ هەر ئاینی ئیسلامە، ئەو بروایەش بە شەو بەرۆژ ناخەوێ ، باوەکو پۆلیس و سەرباز و پاسەوان و هەمو کاربەدەستان بخەون.

إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلنَّصَـٰرَىٰ وَٱلصَّـٰبِـِٔينَ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَعَمِلَ صَـٰلِحًا فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾

﴿إن الذين آمنوا﴾ بەراستی کەسانێکی ئەو تۆ باوەریان هێناوە بە زمان و بە دڵیان و بەکردەوەیان، باوەرمان هێناوە ئەوانە وەك باوەرداەکان بە پێغەمبەر (ﷺ).

﴿والذین هادوا﴾ وە کەسانێکی ئەو تۆ بون بە یەهود و جولەکە لە کورە گەورەی یەعقوبن کە یەهوزایە.

﴿والنصاری﴾ وە ئەوکەسانەی بون بەگاور یاریدەی عیسایان داوە..

﴿والصّابئین﴾ وە کەسانێکی ئەو تۆ لایان داوە لە ئاینی بەناو بەنانگ بۆلای جگەی ئەو ئاینە و ئەوکەسانە لایان داوە لە ئاینی یەهودی و ئاینی نەسرانی، و فریشتەکانیان پەرستوە، وە بێژراوەی زەبور ئەخوێنن.

﴿ من آمن بالله والیوم الآخر﴾ کەسانێکن باوەریان هێنابێ بە خوا و بەرۆژی دووایی بە باوەرێکی بێگومان و بروایێکی خاوێن.

﴿وعمل صالحاً فلهم أجرهم عند ربهم﴾ وە کردەوەی چاکی کردوە، دووایی ئەو کەسانە بۆیان هەیە پاداشتی خۆیان لە لای پەروەردگاری خۆیانەوە لە پاشە رۆژدا.

﴿ولاخوف علیهم ولاهم یحزنون﴾ وە ترسیان لەسەر نیەو ئەوان خەفەتبار نابن لە دوا رۆژدا.

بۆ ئاگاداری: لەمانا کردنی ئەو ئایەتەدا چەندین بیر و بۆچون هەیە لە هــەمویان ڕونـتر ئەو مانایەی پێشوە، زانایان لەمانا کردنی ئەو ئایەتە بە (٨) جۆر مانایان کردوە، لەهەمویان ڕاستر ئەو مانایەی پێشوە، بە سێ جۆری تری ڕاست مانا کراوە:

١- بەڕاستی مەبەست لەو ئایەتە ئەمەیە: کە ڕونی ئەکاتەوە کە بەڕاستی گرنگی بە نـاو نادا هەرگیز یەکسانە ئەو ناوانە لە جۆری موسڵمانبێ. یا باوەڕدا یا یەهودی، یا سابیئی، یا نەسرانی، چونکە ناو خۆی لە خۆیا نەزیان ئەگەیەنێ و نەسود ئەبەخشێ و بەناو دابـەزین و بەرز بونەوە نابێ بەڕاستی ئەوەی گرنگ بـێ لای خـوا بـڕوای ڕاستەقینەیە بـەو کـردەوە چاکە. بێگومان ئەو مانایە ڕاستە لە خۆیا، بـەڵام ڕستەکانی ئایەتەکـە بـەزەقی ئـەو مانایـە نابەخشن.

٢- بەڕاستی ئەو کەسانەی باوەڕیان هێناوە و کەسانێکی ئەو تۆ بــوون بـە جولـەکـە و بەگاور و بەلادەرانی ئەو دو ئاینەی موسا و عیسا بۆ ئاینێ تر، کەسێکن باوەڕیان هێناوە بە خوا و بە ڕۆژی دوایی و کردەوەی چاکی کردوە و بێ فەرمانی خـوای نـەکردوە بـەوەی باوەڕی بە پێغەمبەری ئیسلام نەهێنابێ، دووایی بۆ ئەوکەسـانە هەیـە پاداشتی خۆیـان لـە خزمەت پەروەردەکەری خۆیان و ترسیان لەسەر نیـە لەوکاتـەدا بـێ بـاوەڕان ئەترسـن و ئەوان ناترسن لە بێ پاداشتی ، خەفەت ناخۆن لەوکاتەدا بێ باوەڕان خەفەت ئـەخۆن بـۆ ئەوەی کرداری چاکیان کردوە.

٣- بەڕاستی چەند کەسێك کە بەخزمــەت پێغەمبـەر نەگەیشـتون، لەگـەڵ ئەوەیشـدا بەدڵی پاکی خۆیان ڕانومویان وەرگرتبو بۆلای باوەڕبەخوا و وازیان لــە قەدەغـەکراوەکان هێنابو وەك درۆکردن و خواردنەوەی ئارەق و داوێن پیسی، لەو کەسانەن: قەیسی کوڕی ساعیدە، زەیدی کوڕعەمر، وەرەقەی کوڕی نەوفەل، جگەی ئەوانیش کەناویان ئـەبرێ بـە حەنیفیەکان کە خراپەیان لەسەر نیە. هــەروەها ئـەو جولـەکـەو سـابیئی گاورانـەی ئـەوتۆ بەخزمەت پێغەمبەر نەگەیشتوون هەتا بەشی کراوەیی ئایینی لێــوە وەرگـرن. ئـەو کەسـانە

هەمویان ترسیان لەسەر نیە، بەمەرجی بەردەوام بونیان لەسەر باوەڕ بەخوا و بەڕۆژی دووایی کردەوەی چاکیان کردبێ .

بۆزانین: هەندێ لە کەسانی بێ باوەڕ دووڕوویی ئەکەن بۆلای ئاینەکانی ترە بەڵگە بەوئایەتە ئەهێنێتەوە کە جیاوازی لە نێوان موسڵمان و جگەی موسڵماندا نیە لای خوا، بەبێ گومان ئەزانێ ئەوکەسانە باوەڕیان بە پێغەمبەر نیە دژی ئەوەستن، بگرە بوختان و درۆی وای ئەدەنە پاڵ بەشتێ عەرش ئەلەرزێنێ.

ئەو مانایانە هەمویان ڕاستن و ناوەڕۆکەکانیان یەکن، ئەوەیش ئەوەیە: پوختەی باوەڕهینان بە خوا و بە ڕۆژی دووایی و ئاینی ئیسلام، بۆ وەرگرتنی پاداشت و نەترسان و خەفەت نەخواردن لە ڕۆژی دووایی‌دا. وە ناوشۆرەت بایەخی پێ نادرێ و گرنگ نیە، ئیتر بە هەر ناوێ بیرێ، موسڵمان یان باوەڕدار. جولەکە بوبێ یاگاور و سابیئی بە مەرجێ باوەڕیان هێنابێ بە ئاینی ئیسلام. ناونیشان کەس بەرز ناکاتەوە و نزمی ناکا، زیان و سودیش ناگەیەنن ئەوەی گرنگبێ و بایەخی پێ بدرێ بیروباوەڕی ڕاست و کردەوەی چاك و باوەڕهێنانە بە خوا و بە ڕۆژی دووایی و بە ئاینی بەرزی ئیسلام.

بۆ ئاگاداری: لەو ئایەتەدا باسی جولەکەکان و گاورەکان و سابیئیەکان کران، بەچاکی ئەزانین باسی هەندێ لە تاقمەکانیان بکەین یەکە یەکە.

جولەکەکان تاقمیان زۆر ئەگەنە (٧١) حەفتا و یەك تاقم، هەمو تاقمێ خۆیان بەچاك ئەزانن، وایان داناوە هەرخۆیان دەستیان بە ڕاستیەوە گرتوە بە ئاینی جولەکەوە، بەناو بانگ ترین ئەو تاقمانە (٤) چوارن.

١- (الفریسین) یانێ ئەو کەسانەیان گۆشە گیرن و بەجوێ ئەژین لەنێو گەلی جولەکەدا ئەو کەسانە بڕوایان بە زیندو بونەوە و پرسیار و ڕۆژی دووایی هەیە. زۆربەیان ژن ناهێنن، کوڕی جگەی خۆیان ئەکەن بە کوڕ بۆخۆیان، هەتا بەهۆی ئەو کوڕەوە ناویان کوێر نەبێتەوە. ئەو جۆرە کارە پێی ئەوترێ: (التبنّي) بڕوایان وایە تەنها تەورات ڕێزدار

نیە. بەڵکو شان بەشانی تەورات چەندین ووتەی گێڕاوەی وا هەیە لەم دەمەوە بۆ ئەو دەم ئەوانیش پیرۆزن، کۆمەڵێ تری یاسا و ئامۆژگاری و ڕون کردنەوەی مانای هەندێ شت هەن، ئەوانەیش بە تەورات دانەنرێن لە پیرۆزیدا و کردنیان بە یاساکە مالومەکان یەك بەیەك بۆ یەکتریان گێڕاوەتەوە، ئەو گێڕاوە دەمیانە کە کۆکراونەتەوە ناویان (تلمود)ە وە ئەو تاقمە بەلایانەوە وایە مالومەکان (حاخامات) دەسەلاتێکی بەرزیان هەیە و بێ گوناهن، هەرشتێ بلێن وەك فەرمودەی خوایە، ترسان لەوان ترسانە لەخوا، ئەو تاقمە لە ناوەڕۆکدا یەکسان نین. بەڵکو زۆربەیان بە نهێنی ئامۆژگاری تەلمودیان گۆڕیوە، بۆیە تەلمود ئەڵێ (فریسین) حەوت بەشن، شەشیان ڕاست نین، بەشێکیان ڕاستە، بە گوێرەی خواستی خۆیان پێویستە ئەوەی ئەوان ئارەزۆی ئەکەن ئەبێ خوا بۆیانی بکا.

٢- (الصدوفیین) بە ناوی ڕابەرەکەیانەوە (صدوق الکاهن) نێونراون، ئەوانە لە خولەی (٣) سێەمی زاینیدا ژیاون، ئەو تاقمە بڕوایان بە زیندو بونەوە و پرسیاری ڕۆژی دووایی نیە و بەهەشت و دۆزەخ نیە، ئەڵێن: پاداشت لە جیهاندا تەوا و ئەبێ، بڕوایان بە بونی تەلمود نیە. بەڵکو وایش ئەزانن تەورات لە هەمو ڕوێکەوە پیرۆز نیە، مرۆڤ بۆی هەیە ئەو شتەی خۆی بەڕەوای دائەنێ بیخاتە نێو تەورات، زۆربەی ئەو تاقمە خاوەنی سامان و پارەن سەرۆکەکانیان ، ئەوانە لە پارتێکی سیاسیەوە نزویکترن لەوەی تاقمێکی ئاینی بن.

٣- ( القرّاؤن) ئەو تاقمە لە یەکەم جاری پەیدا بونیان نوێنەری جولەکەکان بون، بەرە بەرە فراوان بون و لایەن گریان زۆر بوە ، دووای کەمیونی فەریسیەکان بون بە جێگەی بڕوا، ئەو کەسانە بڕوایان بە تەورات هەیە نەك بە ئامۆژگاری مالومەکان، ئەڵێن ئەوەی مالومەکان بیلێن جێگەی ڕەخنەیە لەوانەیە چەوتبن و ڕاستیش بن، ووتەی مالومەکان شایانی دەست کاری کردنن و جێگەی پیرۆزی نین وەکو تەورات، ئەو تاقمە لە خولی (٨) هەشتەمی زاینیدا پێك هاتوە بە سەرۆکایتی (داودعەنان) یەکێ لە جولەکە زاناکانی بەغداد بوە.

٤- (الكتبة) کارو ئیشی ئەو تاقمە نوسینی یاسابوە، هەرکەسێ داوایان بکردایە بۆ هەرشتێ ئەوان بۆیان ئەنوسیوە، بە بۆنەی کارەکەیانەوە وایان لێ هات ژمارەیێکیان پیشەی ئامۆژگاری و وانە وتنەوە بۆ خۆیان وەربگرن، بە درێژی ڕۆژگار پلەی بەرزیان دەست کەوت، بە یاریدەی کاربەدەستانبۆ گەیشتن بە ئاواتیان ، وایان لێ هات چاودێری خوێندن گاکان و پەرستگاکان بکەن.

گاورەکان تاقمیان زۆرە ئەگەنە (٧٢) حەفتاو دوو تاقم، ئەو تاقمانە خاوەنی نامەن، بڕوایان بە هەندێ پێغەمبەران هەیە، زۆربەیان باوەڕیان بەتەنهایی خوا نیە، بەڵکو ئەڵێن: (٣) سێ خوا هەن و هەربویشن، لێرە باسی هەندێ تاقم ئەکەین لەسەر ئاموژگاری ئینجیل ڕۆیشتوون، ئەوەی خوا ناردویەتی بۆ عیسا، مەگەر کەم جار نەبێ لە ئامۆژگاری عیسا لایاندابێ، ئەوانەیش دوو تاقمن:

١- تاقمی (أريوس) ناوە بۆ قەشەی ئەسکەندەریە، ئەڵێ: خوایەکە. عیسا بەندەی دروست کراوی خوایە، ئەو ڕستەیە زەوی و ئاسمانەکانی پێ دروست کردوە عیسای پێ دروستبوە (كن فيكون) واتە خوا بیەوێ شتێ دروست بکات ئەفەرموێ ببە، دووایی کتوپڕ ئەو شتە ئەبێ.

٢- تاقمی (بولس) بەترێکێ بوە لە ئەفتاکیە ئەڵێ: خوایەکە لەهەموو ڕۆێکەوە. عیسا بەندە و فروستادەی خوابێ، وەك پێغەمبەرانی تر خوا دروستی کردوە لەمناڵدانی مەریەمەدا بەبێ مێرد، مرۆڤە و خوائێتی تێدا نیە و ئەڵێ: من نازانم ووشە چ شتێکە و (روح القدس) چ شتێکە؟ یانی (كلمه وروح القدس).

وە هەر لەم تاقمەدا ئەنرێ تاقمی (مقدونيوس) بترێکێ بوە لە قوستەنتین، ئەوانە ئەڵێن: عیسا دروست کراوی خوایە، مرۆڤ و فروستادەی خوایە وەکو پێغەمبەرانی تر بەلام عیسا (ووشەی خوایە و ڕوحولقودسیشە)، ئەو دوو تاقمە ناویان نەماوە و بێ ناوەڕۆك و بێ پەیڕەون. تاقمێ تریان هەیە بەناوی (البربرانبه) ئەو تاقمە ئەڵێن: عیسا و دایکی خوان

جگە لە خوای گەورە یانێ ئەڵێن: سێ خوا هەن ئەو تاقمەش بەوناوە ئیستا نەماون و لەناوچون.

وە لەمەودوا باسی (٣) سێ تاقمی تر ئەکەین لە گاورەکان، لەم سەردەمەدا هەن و بەناوبانگترینیان ئەمانەی خوارەوەن:

١- (الملکائیة) پەیڕەو پرۆگرامی ئەو تاقمە پەیڕەوی هەمو پاشا و هەمو گاورەکانە جگە لە پاشای (حەبەشە و نەوبە) پەیڕەویشە بۆ هەمو گاورەکانی (ئەفریقا و سەقلیە و ئەندەلوس و زۆربەی شام) ئەو تاقمە ئەڵێن خوا (٣) سێ شتە: باوك و کوڕ و روحولقودس، ئەوانە هەربوون، وە ڕوحولقودس بە جوبریل ئەوترێ، ئەو تاقمە ئەیشڵێن: هەمو لەشی عیسا خوای تەواوە و مرۆڤێکی تەواوە لەیەك جوێ نین، بەشە مرۆڤەکەی کوژراوە و هەڵواسراوە، بەشە خواکە توشی ئەو شتانە نەبوە، مریەم ئەو خوایە و ئەو مرۆڤەی لێ پەیدا بوە، خوا لەوەۆو هاتوەتە خوارەوە. خوا و مرۆڤ یەکن بەلای ئەو کۆمەڵەوە.

٢- (النّسطوریة) ئەو تاقمەیش بەبێ جیاوازی کەم زۆر وەکو مەلکانیەکان وان لە بیر و باوەڕدا. بەڵام ئەڵێن، مەریەم خوای لێ نەبوە بەو جۆرەی کوڕی بێ، بەڵکو مرۆڤێکی لێ بوە و خوای لێ پەیدا نەبوە بە جۆری کوڕی بێ، بەڵکو خوای لێی بوە، لەو تاقمن زوربەی گاورەکانی موسڵ و عێراق و فارس و خۆراسان. ئەو تاقمە سەر بە نەستوری بترێکی قوستەنتینن.

٣- (الیعقوبیة) ئەو تاقمە سەر بە یەعقوبی بەرزەنێ ڕاهیبی قوستەنتینن، ئەو تاقمە ئەڵێن: مەسیح هەر خوایەو مردوە و هەڵواسراوە و کوژراوە، هەمو بونەوەران (٣) سێ ڕۆژ بێ خوا مانەوە، لە دوایدا هەڵساوەتەوە وەکو جاران، وە خوا سەر لەنوێ دروست بویەوە بە جۆرێ هەر بوبێ و لەناو نەچوبێ، خوا لە منالدانی مەریەمدا بووە و هەڵگیراوە،

سەر بەبیروباوەڕی ئەو تاقمەن زۆربەی گـاورانی دانیشـتوانی میسـر و هـەمو دانیشـتوانی حەبەشە و پاشاکانی ئەو دوجێگەیە لەو سەردەمەدا.

ئەی خوێنەواران: ئەگەر خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا باسی ئەو تاقمانەی نەکردبایە بڕوا نەئەکرا کە لە نێو ئادەمیزادا پەیدا بوبێ هەڵگری ئەو جۆرە شێتیە، ئەوەندە نەفام بن.

بۆ ڕون کردنەوەی بیروباوەڕیان خوا ئەفـەرموێ لـەزمانی گاورەکانـەوە: ﴿إن الله هـو المسيح ابن مريم﴾ بەڕاستی خوا هـەر مەسـیحی کـوڕی مەریەمـە. ﴿إن الله ثـالث ثلاثـة﴾ بەڕاستی خوا سێیەمی سێیانە. خوا ئەپرسێ لە عیسا و ئەفـەرموێ: ﴿أأنـت قلـت للنـاس اتخذوني وأمّي إلهين من دون الله﴾ ئایا تۆ ووتوتە بە ئادەمیزاد: ئێوە دابنێن من دایکم بە دوو خوای خۆتان جگە لە خوا. ئێمە ئەگەر بمانەوێ باسی هەمو پەیڕەوی گاورەکان بکـەین بـە ئاسانی بۆمان ناکرێ، و زۆر کاتی ئەوێ.

لەمەو پاش باسی (الصّابئين) ئەکەین ئەو کەسانە بەوانـە ئـەڵێن: لـە ئاینـە گـەورەکانی موسا و عیسا لایانداوە بۆلای ئاینی تر، ئەوانـە فریشـتە پەرسـت و ئەسـتێرە پەرسـتن، لـە ڕۆژێکا (٥) نوێژ ئەکەن ڕو بەخۆر. بڕوایان بە خـوا و بـەزیندو بونـەوە و بـە هـەندێ لـە پێغەمبەران هەیە. بەڵام بڕوایشیان وایە هەندێ لــە ئەسـتێرەکان دەسـتیان هەیـە لـە پـەیدا کردنی چاکە و خراپە و نەخۆشـی و سـاغی و هـەندێ شـتی تـر، ئـەو تاقمـە هـەندێکیان دانیشتوی عێراقن. ژن و ژن خـوازی و کوشـتاری ئاژەڵیـان بـۆ ئێمـە ڕەوا نیـە، چونکـە خاوەنی نامەی ئاسمانی نین.

سابیەکان تاقمیان زۆرە بەناوبانگ تریان (٤) چوار تاقمن:

١- (أصحاب الهياكل) ئەو کەسانە ئەڵێن: پەیکـەری ئەسـتێرەکان هەڵسـوڕێنەری ئـەم بونەوەرەن.

٢- (أصحاب الرّوحانيات) ئەو تاقمەن لایـان وایـە ئەسـتێرەکان پەیکـەرێکن خـاوەنی گیانن، وەمرۆڤ بەخواوە ئەبەستن بۆ پەرستن.

٣- (أصحاب الأشخاص) ئەو کەسانە ئەڵێن: ئێمە پێویستمان بە نوێنەرێکی بینراو هەیە لە نێوان ئێمە و خوادا، ئەستێرەکان هەرچەندە ئەبینرێن وا ئەبێ جار بەجارێ وون ئەبن. کەواتە ئێمە پێویستمان بەپەیدا کردنی چەند بینراوێ هەیە لە پێش چاومانابن، هەتابیان کەین بە نوێنەر بۆ خۆمان لە نێوان ئێمە و ئەو پەیکەرە گیاندارانەدا، وە ئەستێرەکانیش نوێنەری ئێمە بن لە نێوان ئێمە و خوادا. کەواتە ئێمە دروست ئەکەین بۆ ئەستێرەکان وێنەیە شیاوبێ بۆ هەریەکە لەو (٧) حەوت ئەستێرە گەڕۆکە خاوەن گیانانە.

٤- (الحلولیة) ئەوانەن ئەڵێن: خوایەك خوایە ئاسمان و زەویی و ئەستێرەکان ئەو دروستی کردوون بەڵام ئەستێرەکانی کردووە بەهەڵسوڕێنەری خوارەوە لە زەوی و ئادەمیزاد و هەموو بوونەوەرانی سەرزەویی: خوا لە نێو ئەو ئەستێرانەدا دائەنیشێ و خۆی نیشان ئەدا لە وێنەی ئەو ئەستێرانەدا بەڵام خوا هەریەکە و زۆر نابێ.

ئەو زانایانە مانای قورئانیان کردوە بە حەوت جۆرە باسی سابیئین ئەکەن:

(١) ئەڵێن: سابیئەکان تاقمێکن لە ئاگر پەرستەکان.

(٢) ئەو تاقمەن فریشتەکان ئەپەرستن.

(٣) ئەو کەسانەن ئەستێرەکان ئەپەرستن.

(٤) ئەو کەسانەن ڕۆژ پەرستن و لەڕۆژێکا پێنج نوێژ ئەکەن ڕوو بەخۆر ئەوەستن.

(٥) تاقمێکن لە نێوان ئاینی جولەکە و ئاگر پەرستان بڕوایان بە خوا و بە زیندو بونەوە هەیە، فریشتەکان ئەپەرستن و لە نوێژا ڕوو ئەکەنە کەعبە، لە هەموو ئاینە پێشوەکان شتێکیان وەرگرتوە بۆ خۆیان.

(٦) ئەو کەسانەن بنچینەی ئاینەکەیان ئاینی نوحە.

(٧) ئەو کەسانە بێ ئاینن بڕوایان بە هیچ ئاینێ نیە. وە زۆر نزیکە لە سابیئەکاندا ئەو حەوت تاقمانە هەمویان بن.

بەڵام باسکردنی سابیئیەکان لەم سورەتەدا و لە سورەتی مائیدەدا لەگەڵ جولەکەکان و گاورەکاندا، ناوبردنیان لەگەڵ ئاگر پەرستەکان و بت پەرستەکاندا لە سورەتی حەجدا ئەوەمان بۆ ئەسەلمێنن بڕوایان بە تەنهایی خوا و بە ڕۆژی دوایی هەیە بە هەرجۆرێ بێ ئەوەی نوسیان کورتەیە بو لەباسی جولەکەکان و گاورەکان وسابیئیەکان و تاقمەکانیان. ئومێدم وایە برایانی خوێنەوار جێگەی متمانە و وەرگرتنیان بێ. لەگەڵ پاڕانەوەمدا لە خزمەت خوادا.

وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَـٰقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُوا۟ مَآ ءَاتَيْنَـٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱذْكُرُوا۟ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ ثُمَّ تَوَلَّيْتُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ ۖ فَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ لَكُنتُم مِّنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴿٦٤﴾ وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلَّذِينَ ٱعْتَدَوْا۟ مِنكُمْ فِى ٱلسَّبْتِ فَقُلْنَا لَهُمْ كُونُوا۟ قِرَدَةً خَـٰسِـِٔينَ ﴿٦٥﴾ فَجَعَلْنَـٰهَا نَكَـٰلًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهَا وَمَا خَلْفَهَا وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٦٦﴾

﴿وإذ أخذنا ميثاقكم﴾ وە ئێوە بیری ئەو کاتە بکەنەوە ئێمە پەیمانمان لە پێشوەکانی ئێوە وەرگرت کە هەموکارێکتان بە ناوەڕۆکی تەورات بێ و پەیڕەوی موسا بکەن، هیچ کەسێ

نەپەرستن لە جگەی خوا، چاکە لەگەڵ دایك و باوك و خزمانتـان و هـەتیوان و هـەژاران بکەن، چاکەیش بەدانیشتوان فێربکەن، خوا بەتاك و بەتەنها بزانن و دادپەروەر بن.

﴿ورفعنا فوقكم الطّور﴾ وەئێمە بەرزمان کردەوە بەسەرتانا کێـوی تـور.. ئـەو ڕوداوە لەو کاتەدا بو موسا بەبێ وچان چاکەی لەگەڵ بەنی ئیسـرائیل ئـەکرد. بـەڵام ئـەی بینـی ئەوان بەرەنگاریان ئەکرد بە توندی، لەو کاتەدا هەڕەشەیان لێکرا بە بنەبڕکردنیان بە بـەرز کردنەوەی کێوی تور بەسەریانەوە، ئەوانیش ترسان و گومانیان وابو ئـەو کێـوە ئەکـەوێ بەسەریانا، بۆیە کوڕوزانەوە لە خزمەت خوادا، لەوکاتـەدا فـەرمانی پێـدان هـەر فـەرمانێ بەوانی فەرموو بەگشت دڵیانەوە وەری گرن بەبێ ئەوەی پێیان ناخۆش بێ، هەر شـتێ لـە تەوراتایە ئەوان بەدانیشتوانی تری بڵێن. بەو بۆنەوە ئەبن بە خۆ پارێز لە خوا.

﴿خذوا ماآتيناكم بقوة﴾ وە ئێمە پێمان ووتن: ئێوە بگرن ئـەو شـتە ئێمـە بەخشـیومانە پێتان لە تەوراتا بەهەمو هێز و تواناتانەوە، وەلێ لامەدەن، ئەگەر ئێوە سەرپێچی بکەن ئەو کێوە ئەخەم بە سەرتانا، ئەوانیش بڕوایـان هینـا و پەشـیمان بونـەوە، خـوا کێوەکـەی لـە جێگەی خۆیا وەستان و لەرزە لەرزی نەما.

﴿واذكروا مافيه لعلكم تتقون﴾ وە ئێوە بیری شتێ بکەنەوە لـە تەوراتایە، بپـارێزن و کاری پێ بکەن، بە خەڵکی فێرکەن ناوەڕۆکەکەی تەورات و لـەبیری خۆتـانی مەبەنـەوە، بیری ئەوە بکەنەوە توشی سزای گەورە ئەبن ئەگەر واز لە یاسای تەورات بێنن، ئەگەر ئەو شتانەتان بەجێ هێنا خۆتان ئەپارێزن لە گوناهو ئەترسن لە سزای خوا، ڕزگارتان ئـەبێ لـە لەناوچوون، ئەگەر نەیان کەن بەو کێوە سەرتان ئەپژێنم ، ئەوەی باسـکران کـارو پیشـەی جولەکەکانی سەردەمی موسا بێ کە بەچاوی خۆیان ئەو کارە بەکەس نـەکراوەیان ئـەبینی کە بۆیان ئەکرا، جێگەی سەر سوڕمان نیە کە ئەمانەی ئـەم سـەردەمە بـاوەڕ بـە پێغەمبـەر ﴿ﷺ﴾ نەهێنن، ئەو پەیمانە مۆرکراوەی نێوانیان لە مەدینە بە ستەویان تێکی بدەن.

﴿ثم تولیتم من بعد ذلك﴾ لە پاشانا ئێوە پشتان کردە ئەو پەیمانە و وازتـان لـە کارپـێ کردنی هێنا، لە دووای وەرگرتنی ناوەڕۆکی تەورات و ئـەو پەیمانـەی دابوتـان بـە هـەمو هێزتانەوە، ئەو بەڵێنەتان شکاند.

﴿ فلولا فضل الله علیکم ورحمته﴾ دووایی ئەگەر گـەورەیی خـوا نەبوایـە بەسـەرتانەوە میهرەبانی وبەزەیی خوا نەبوایە و سزاکەی دوانەخستایە، ئێوە پەشیمان نەبونایەتەوە وەخـوا لێ وەرنەگرتنایە ، کێوەکەی لەسەرتان لا نەبردایە ، دوای شکاندنی ئەو بەڵێنـە دابوتـان بەئێمە لەکاتی بەرز کردنەوەی کێوەکەدا بۆ ئەوەی فەرمانەکانی خوا بەجێ بهێنن .

﴿ لکنتم من الخاسرین ﴾ بەڕاستی ئێوە ئەبون لـە زیـانۆ مـەندان لەجیـهاندا ، گومـڕا ئەبون لەگوناە نەئەگەڕانەوە و لەناو ئەچون ، لەپاشەڕۆژدا سـزا ئـەدران ، بـەڵام ئـەوەبوو ڕێزی دا بەسەرتانا بەگەورەیی خۆی ، بەمیهرەبانی خۆی کێوەکەی لەسەرتان لابرد .

کەچی دوای ئـەوەی خـوا سـزای کەوتنـە خـوارەوەی کێوەکـەی لەسـەر هـەلگرتن تەوراتیان گۆڕی بەئاشکرایی دەستیان دا بەگوناە کـردن ،بـێ فـەرمانی موسـایان کـردوو ئازاری زۆری چێشت بە دەستیانەوە ، خوای گەورە سـزای دان لەجیـهاندا ، هـەندێکیان بەڕۆچونیان بەنێو زەوی داو

هەندێکیان بەسوتانی ئاگر ، هەندێ تریان بەتاعون مـردن ئەوانـە هـەموویان لەتـەوراتی خۆیان نوسراون . پاشماوەکانیان ئەوشتانە پێشووەکانیان کردیان ئەمانیش بەپترەوە ئـەوانیان کرد باوەڕیان بەعیسا نەهێنا ، وویستیان بیکوژن ، ئیتر جێگەی سەرسـوڕمان نییـە بـاوەڕ بەپێغەمبەر﴿ﷺ﴾ نەبەرن .

﴿ولقد علمتـم الّذیـنَ اعتَـدوا فیکـم فـی السّبتِ ﴾ وەبەڕاسـتی ئێـوەی جولەکـەی دانیشتوی مەدینە ئەزانن بەکەسانێکی ئەوتۆ دەست درێژیان کرد لەڕۆژی شـەممەدا بۆسـەر ماسییەکان کەلەوڕۆژەدا فەرمانیان پێ درابوو جگە لەخوا پەرستی شتێ تر نەکەن کـەچی

دەستیان دابووە ڕاوە ماسی کردن . ئەو ڕوداوە لەسەردەمی پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ باسی کراوە ، ڕوداوێکە لەجولەکەکانەوە پەیدا بووە و بەم جۆرە بووە :

خوا فەرمانی دابوو بەجولەکەکان لەڕۆژی شەممەدا جگە لەخوا پەرستی کاریٚ تر نەکەن ، لەورۆژەدا ڕاوە ماسی قەدەغە کرابوو لەوان ، بۆیە ماسی‌یەکان لەورۆژەدا بەبیٚ ترس خۆیانیان دەرئەخست و کۆئەبوونەوە بەلاّم هەندیٚ لە جولەکەکان دەستیان دایە فێلّ و تەلّەکە ، بەو جۆرەی لەو ڕۆژەدا ڕاوەی ماسیەکانیان ئەداو ئەیان کردنە جێگەیە نەتوانن لیٚی دەرچن ، لەڕۆژی شەممەدا نەیان ئەگرتن ، ئەیان ووت : ئێمە لەڕۆژی شەممەدا کۆیان ئەکەینەوە و نایان گرین ، کۆکردنەوەو گرتنیان زۆر جیاوازن ، لەڕۆژانی دوای شەممە ئەیان گرتن ، لێرەداو لەسەر ڕۆشنایی ئەو فەرموودەی خوایە بیر لەدووڕوییو فێلّی هەندیٚ لەدەست بڕەکان ئەکەمەوە کەهەندیٚ لەوکەسانە بەدووڕوبی ئاین پەرست و نیشتمان پەروەرن ، دووڕوی و چاوچنۆکیان کردووە بەپیشەی خۆیان . گالّتە بەمەبەستی ووشەکان ئەکەن و ڕاستی‌تێك ئەدەن بۆ ئەوە هەندیٚ ئادەمیزادی سادە بخەلّە تێنن ، وێنە و نەخشەی ڕازاوە ئەکێشن بەسەر کردارە نارەواکانی خۆیانا بۆ خەلّەتانی ئەو نەزان و ساویلکانە و بیان خەنە نێو داوی ژەهراوی خۆیان لەهەموان سەیر تر هەندیٚ بەناو زانا و دۆستی خواو پیاوانی ئاینی چەندین نامیلکەیان داناوە هەندیٚ فێلّ و فرو دەست بڕینیان تێدا نوسیوە و ڕستە ڕەواو ڕاستی یەکانیان گۆڕیوە بۆ لای مەبەستی خۆیان و وانیشان ئەدەن بەدانیشتوانی سادە ئەوشتانەی ئەوان یاسای ڕاستەقینین .

هەندێکیان بەوناوەوە کەئێمە دۆستی خواین و لەپاشەڕۆژدا ئەگەینە فریاتان ، هەندێکیان بۆ نەکەوتنی تەلاّق ، هەندیٚ تریان نەهێشتنی زەکات یانیٚ دارای دانیشتوان زێڕوزیو نیە . ئەو کەسە دەست بڕانە وا ئەزانن خوا منالّەو بەو پڕو پاگەندە پوچانە نازانیٚ ، ڕاست وویٚژو درۆ درۆزن جزیٚ ناکاتەوە ، ئەو کەسانە ئەگەر خوا لەم ڕۆژەدا نەیانکا بەمەیموون وەك جولەکەکان گومانی تێدا نی‌یە لەپاشەڕۆژدا ئەیانکا بەسەگ و بەرازو

مەیمون ، ئەو کەسە هەرچەندە بەڕواڵەت نەگۆڕابن بۆلای لەشی مەیمون لەناوەڕۆکدا سروشتیان گۆڕاوە بۆ لای سروشتی مەیمون .

﴿ فقُلنا لَهم كُونوُا قِردة خاسئِين ﴾ بۆ یە دوایی ئێمە پێمان ووتن بەو کەسانەی درێژیان کرد لەڕۆژی شەممەدا وڕاوە ماسی‌یان کرد : ببن بەمەیمون بێ نرخەکان ، دور خراوە لە میهرەبانی و بەزەیی خوا ، ئەوانیش بوون بە مەیمون ، لەپاشا هەمویان مردن .

ئەو زانایانە مانای قورئانی پیرۆزیان کردووە بۆ چونیان وەك یەك نین ، لەبارەی گۆڕانی ئەو کەسانە بەمەیمون : ئایا بوون بەمەیمونی ڕاستە قینە ، بەجۆرێ لەشو شێوازیان وەك مەیمونی لێهات ، یاسروشت و خویان گۆڕا نەك بەلەش و بەقەوارە ، مەبەست و ناوەڕۆکی ئەم فەرموودەی خوایە دابین کرا بەسەریانا : ﴿ ختم الله علی قلوبهم ﴾ خوا مۆری دا بەسەر دڵیانا و چاکەی تێ ناچێ و لەهیچ شتێ ناگەن .

زۆرترین لەزانایان ئەڵێن : ئەو گۆڕانە ڕاستەقینە بووە ، هەر بەڕاستی بوون بەمەیمون بەگوێرەی مانای دەرکەوتوی ئایەتەکە ، پێویستمان بەلادان لەمانای دەرکەوتوی ئەوئایەتە نی‌یە ، لەگەڵ ئەوەشدا گۆڕانی لەشتێ بۆ لای لەشتێ ترو ڕەنگی ترو لەجۆرێکەوە بۆ جۆرێ تر بەگوێرەی ئەقڵ دروستە ، کەواتە ئایەتێ بێ بەڵگە یە لەسەر ئەو گۆڕانە وەك خۆی ئەمێنێتەوە و نای گۆڕین و بۆلاێی تر پەلامار نادەین بەبێ بەڵگە.

خوای گەورە توانای بەسەر هەموو شتێکا هەیە .بەڵام کەمێ لەزانایانی پێشوو وەك موجاهید ، لەزانا تازەکانی ئەمڕۆوەك ئیبن و عەبدەو مەراغیو ڕەشید ڕەزاو عەبدول وەهاب نەجار ، خوایان لێ ڕازی بێت ئەڵێن :ئەو گۆڕانە بەخورەوشت بووە ، نەك بەلەش و بەڕەنگ ، بەڵگەیان ئەوەیە نەبینراوە خوا هیچ گوناهـ بارێ بگۆڕێ بە جانەوەرێ ترو مرۆڤایەتی بشۆرێتەوە ، لەدام و دەزگای دروست کردندا شتی وا نابێ ، ڕێگەی خوا هەر یەکە ، ئەگینا ئەبوایە گوناهبارانی ئەمڕۆش وەك جولەکەکانی لەگەڵدا بکردنایە و بیکردنایە بەجانەوەرێ تر.

ئێمە لەگەڵ زوربەی زانایانـا ئـەڕۆین و ئـەو گۆڕانـە هەربەڕاسـتی بـووە نـەك بـەخوو بەڕەوشـت ، فـەرمودەی گـەورەمان موجـاهید و مامۆسـتای ڕۆشـن بـیر ئیبنـو عـەبدە ، هەرچەندە وەك بیرو باوەڕێکی گشـتی و دەرکـەوتوو لـەبینراوەکاندا بنچینەیـەکی تـەواو ڕاستە .بەلاّم بۆ لادان لەو بنچینەیە کارێکی نائاسایی وا هەیە کەویستی خوا بیەوێ ئـەبێ ، وەك کارە پەك خراوەکانی پێغەمبەران ورێزگرتنـی دۆسـتانی خـوا ، کـاری خـوا لـەگـەڵ کوڕانی ئیسرائیل لەو سەر دەمەدا لەو جۆرە کارانەیە و نائاسـاییانەیە بـۆ هـەموو کـەس نەکراوە وەناژمێرێن .

ئەو کەسەی وورد بێتەوە بەقوڵی وبۆی ڕاچێ لەوئایەتانە هاتونەتە خـوارەوە دەربـارەی کوڕانی ئیسرائیل بەتایبەتی و ئەوشتانەی لەسەردەمی موسادا پەیدا بوون بەتایبەتی تر بۆمـان ڕون دەبێتەوە ، وەکو خۆر لەنیوەڕۆدا ، خوای گەورە بەجۆرێ لەگـەڵیان جولاّوەتـەوە ، وێنەی ئەو شتانەی لەگـەڵ هیـچ گـەلێ نـەکراوەو نـابێ ، وەئـەو کردەوانـە وێنـەی هیـچ کردەوەیەکی تری ناسراوو نائاسـایی بێـت بەدوریشـی مەزانـە فـەرمودەی خـوا ﴿ واِنـی فضّلتُکم عَلی العالَمِین ﴾ یانی بەڕاستی من ڕێـزی ئێـوەم داوە بەسـەر هـەموو بونـەوەرانی سەردەمی خۆتان بەڵگەبێ بۆ ئەو کارانەی خوا لەگەڵی کردوون . کەبەتایبەتی هەر لەگەڵ ئەوانی کردووە ، بەڕاستی ڕزگار کردنیان لەستەمی فیرعەون و یاخی بونەکەی . پچڕانـی دەریای سور بۆیان و پەیدابونی دوازدە ڕێگە هەریەکەیان بۆ بـەرەیێکیان ، بـەبێ کۆشـش گەزۆ و شێلاقەی بۆ کردن بەخواردەمەنی بەبێ ماندوو بون . ئاو دەرهێنان بۆیان لەبەردی ڕەق بێ ئارەق ڕژان ، هەوری بۆ کردن بەسێبەر ، کێـوی تـوری لەسـەر بـەرز کردنـەوە تاخوا بپەرستن ، کوژراوی بۆ زیندوو کردنەوە هەتا بکوژەکەیان بۆ ڕوون ببێتەوە هـەتادێ ، ئەوانە هەموویان بەکەس ناکرێن لەجگە خوا ، بۆ کەسێ تـر نـەکراون جگـە لـەکوڕانی ئیسرائیل ، ئەو شتانە هەمووی بەڵگەی ڕون و ئاشکران بۆ نەهێشتنی گیرو گرفتی نێوانیان لەو سەردەمەداو هەموویان کاری نائاساین . تەنانەت هەرگیز بیریان لـە نەهێشـتنی گـیرو

گرفتی خۆیان نەئەکردەوە هەرکاتێ ڕوداوێکی نالەباری دڵ تەزێن برژایە بەسەریانا ئەچونـە لای موسا ئەیان ووت : ئەی موسا بپاڕێرەوە لەخوای خۆت ئەو کارەمـان لەسـەر لابـا و فلآن شتمان بۆ بکات ، موساش بۆیان ئەپاڕایەوە خوای گەورە لێی وەرئەگرت ، بەوانـەی باس کران بۆمان ڕوون دەبێتەوە بەرانبـەری کردنـی گـەلانی تـر بەبـەنو ئیسـرائیلی ئـەو سەردەمە لەجێگەی خۆیانی‌یە ، کەواتە فەرموودەی مامۆستا ئیبنـو عـەبدە کەئـەڵێ : خـوا ئەوەی ئەیکا لەگەڵ ئادەمیزادی ئەم سەردەمە هەرئەوەشی کـردووە لەگـەلانی ڕابـردوو . ئەوە ڕاستە لەهەموویانا جگە لەکوڕانی ئیسرائیل .

هەروەها ئەمەیشمان بۆ ڕوون دەبێتەوە : خوای گـەورە بەبەرزکردنـەوەی کێـوی تـور بەسـەریانا ئەیویسـت بەتـەوەزمی ئـەو یاسایانە لەتـەوراتان بەسـەریانا بسـەپێنێ ،ئـەوەش جیاوازی‌یەکی ترە لەگەڵ گەلانی تردا بـۆ بـەنی ئیسـرائیل . کەواتـە فـەرمودەی مامۆسـتا ﴿ تەبا تەبائی ﴾ لەتەفسیری ﴿ میزاندا ﴾

کەئەڵێ : بەرز کردنەوەی کێوی تور وا ئەگەیەنێ کەخوا بەزۆر ڕامیان بکا بـۆ ئـاین ، کەچی زۆریش لەئایندا نی‌یەو ئەوەتا خوا دەفەرموێ ﴿ لا اكراه في الدين ﴾ زۆر لـەئایندا نی‌یە ، ئەو فەرمودەیە دوورە لەڕاستی‌یەوە دەربارەی ئەو تاقمانەی موسا کەخوا کاری وای بۆ ساز ئەکردن دورترە لەوەی ئێمە بیزانین ، ئەو بەرز کردنـەوەی کێـوی تـورە یەکێکـە لەوانەی کەبۆ کەسی تر نەکراوە .

ئێمە هیچ شتێکمان بەدە ستەوە نی‌یە پشتی پـێ ببەسـتین وبیکەینـە بەڵگـە بۆچـی خـوا ئەوکارانەی بۆ جولەکەکان کردووە جگەی کەسانی تر ؟

ئەو شتەی ئێمە بتوانین بیکەین بەبەڵگەوە بۆ ئەو مەبەستە ئەمەیە خوای گەورە ئەیویست ئەو جولەکانە بکا بەچاو لێ کراوی هەموو ئادەمیزاد کە گوزەرانـێ دڵ پـێی خـۆش بـێ ئەوەیە کەخۆی بۆ ماندوو بکرێ ، دژی ڕوداوی ناهـەموار ڕابوەسـتێ ، بەدەسـتی خـۆی گیرو گرفت نەیەڵێ ، کـەوابێ مـرۆڤ بەوانـە نرخـی مرۆڤایـەتی خـۆی ئـەزانێ و پلـەی

شارستانیەت ئەبڕێ . مرۆڤ بیەوێ بژی و بەتەمای جگەی خۆی بێ و لەسەر خوانی جگەی خۆی بلەوەڕێ و بۆی ساز بکرێ لەگەڵ دابەستەی ئاژەڵ چ جیاوازی‌یەکیان هەیە؟ ئیتر پێویست بەئەقڵ وزانیین نامێنێ ، پشت بەستن بەخوانی خەڵکی مردن و تەمەڵی یە ، کۆشش و هەوڵدان هوشیاری و زیندویەتی‌یە . بەبێ کەم و پتر مێژوی جولەکەکان بەگشتی پەیوەندی توندی بەمێژوی ئەو جولەکانەوە هەیە لەسەر دەمی موسادا ژیاون ، جولەکەکان بنچینەی ڕاستەو خۆی نەوەکانی دوای خۆیانن لەهەموو ڕویەکەوە لەسەر سامانی ئادەمیزاد ئەژین و ئەلەوەڕێن ،بەو بۆنەوە لەمەو پێش باسی جولەکەکانمان کرد ، باپەنجە ڕاکێشین بۆ کۆمەڵێ لەزایۆنی دانیشتوانی ئەمەریکا ، لەدێی ﴿ بروکلین﴾ سەر بە ﴿ نیۆیۆرك ﴾ ناوی ئەو کۆمەڵە ﴿ جماعه شهود یهو ﴾ ئاواتی سەرەکی و کۆتایی یان بلاوکردنەوەی بێ نرخی و بێ ڕەوشتی و داوێن پیسی و پەیداکردنی بەلاو گومانە بۆ ئاین و تێکدانی نێوان هەموو ئادەمیزادی سەر زەوی بەگشتی ، بەتایبەتی ئاینی ئیسلام و موسڵمانان . ئەو کۆمەڵە ئەڵێن : بەم زوانە جیهان کاول ئەبێ ، مەبەستیان بلاو کردنەوەو سستی و تەمبەڵی یە بۆ جگەی خۆیان هەتا واز بێرن لەسامان و چەك ، بەڕوتی و نەخۆشی و نەزانی بژین و واز لەهۆی بەرگری بهێنن ، هەتا خۆیان سواریان بن و سامانیان بخۆن .

ئەو ڕوداوەی ئەم کۆمەڵە ئەمەم بیر ئەخاتەوە لەسەردەمی سالانی (١٩٣٥) ی زاینی نوسراوێ بلاو کرایەوە ، بەبیری من بەکرێ گیراوانی دوژمنانی ئیسلام و سەر بەو کۆمەڵە ئەو نوسراوەیان بلاو کردۆتەوە ،. ئەمیش دەقەکەیەتی ( پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ چووەخەوی زێوانی باخچەی پاکی پێغەمبەر ﴿ ﷺ﴾ فەرمویەتی بەو زێوانە : بەخەڵکی ڕابگەیەنە لەساڵی (١٩٥٠ ) ی زاینی بەرانبەر بەساڵی (١٣٧٠)ی کۆچی جیهان کاول ئەبێ و ڕۆژی دوایی پەیدا ئەبێ) ئەوەیش بۆ ئەوەی لەو کاتە دیاری کراوەدا کار بەپێچەوانەوە بێ ، دوژمنانی ئاین و سەر بەزایۆنی بیکەن بەتیری ژەهراوی خۆیان بۆ هەڵخەڵەتاندنی

ساویلکەکان بلێن : ئاینی ئیسلام ئاوایە ، ئەی کوێرن ونازانن هـەزار درۆی بـەو جـۆرە کار ناکاتە سەر ئاینی پۆلای ئیسلام .

لەدوای ئەو سالەیش ئەو پرۆپاگەندەی خەوە سالْ لەدوای سالْ سەری هەلْئەدایـەوە و بلاو یان ئەکردەوە لەهەموان سەیر تر ئەوەبوو پێویسـتیان ئـەکرد ئـەوەی ئـەو نووسـراوە بخوێنێتەوە ئەبێ چەند جارێ ئەویش بینوسـێتەوە و وەبـلاوی بکاتـەوە ، هـەروەها هـەموو کەسێ بۆ ئەوەی بەزۆری بلاو ببێتەوە . ئەوکەسانە – قوڕیـان بەسـەر– ئـەو کەسـەی بـە چاکی لە ئاینی ئیسلام تێ گەیشتبێ ئەو جۆرە پڕوپاگەندە فڕێ ی ئەدەنە نێو زبلەوە . هەر ئەو کۆمەلە یشبوون چەند ژمارەیەکی زۆر ناملیکەیان بە هەموو زمانێ بلاو ئـەکردەوە بـە بەرگی رەنگاو رەنگەوە ، زوربەیان بـۆ نێـو هـەرێمی موسـلمانان هـەروەها گۆڤارێکیـان دەرکردبوو بەناوی (برج المراقبە)ەوە چەند ناملیکەی تریان بلاوکردەوە وە تانەو تەشەریان ئەدایە پالْ پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ و ئەدایەپالْ قورئانی پیرۆز ئەمەیش ناوی هەندیکە لە وناملکانە :

١- ﴿هل خَدَمَ الدین الانسانیةّ﴾ ئایا ئاین خزمەتی مرۆڤایەتی کـردووە ؟ ٢-﴿ لِیَکـن الله صادِقاً﴾ باخوا ڕاست گۆ بێ ٣- ﴿ نِظام الدّهُور الاهـی ، والحـق یحرّرکـم والمصالحَـة وملاین منَ الّذینَ هم احیاءٌ لَن یموتوا ابداً ﴾ پەیرەوو کاتی خولی خوایـی و ، ڕاسـتی ئێـوە سەربەست ئەکا ئاشنەوایی و مەلایین لەکەسانێکی ئەوتۆ ئەوان زیندوونو هـەرگیز نـامرن . ئەو ناملیکەی دوایی‌یە لەبەیروت چاپ کراوە .. کار بەدەستانی میسر هـەنێ لەئـەندامانی ئەو کۆمەلەیەیان دەرخست لەکۆبونەوەی نهێنی دا گرتنیان و دانیـان بـە دادگـا لەسـالی (١٩٦٧) ی زاینی .

قورئانی پیرۆزو ئینجیل ئەو جولەکانەی بەدوژمنی مرۆڤایەتی داناوە ،مێـژوویان باشترین بەلگەیە بۆ ئەو مەبەستە ، هەر لەبەر ئەوەیشە ئەو جولەکانـە بـلاوی ئەکەنـەوە و ئـەلێن : جیاوازی لەنێوان گەلان و ئاینەکاندا نیە بۆ پێك هێنانی بـەرژەوەندی و مەبەسـتی گـلاوی خۆیان ، چەندین ناملیکەیان بۆ ئەو مەبەستە داناوە .

ژمارەی زۆر لەپەیمانگاوقوتابخانەیان بۆ ئەو مەبەستە ساز كردووە بۆ خوێندنی ، بۆ بڵاو كردنەوەی مەبەستی خۆیان ، كۆمەڵیان دروست كردووە بۆ هەمان مەبەست لەوكۆمەڵانە: (الماسونيَة العالَمية ) .

لەئامۆژگاری كۆمەڵی (جماعه شهود يهو ) يە ، ئەو بیرو بۆ چونە پوچەیە كەئەفامەكان ئەیلێن (خواو شەیتان ئاژاوەو ناكۆكی لەنێوانیانا پەیدا بوو ، بۆ ماوەی (٦٠) شەست خولەك لەئەنجامدا خوا كۆڵی داو گۆشەگیر بوو ، فەرمانو هەڵسوڕانی گەلانی دایە دەست شەیتان چ شتێكی ئەوێ بیكا خوا بەتەنیایی مایە وەو كەسی لەگەڵ نەما جگەلەنەوەی ئیسرائیل ، بۆیە خوا بەشەیتانی ووت : هەموو ئادەمیزاد بۆ تۆ واز لەو نەتەوەیە بێنە بۆ من ، لەسەر ئەوە پێك هاتن بەڵام كار بەپێچەوانەوە هەڵئەسوڕێ لەئەنجامدا نەتەوەی ئیسرائیل لەنیلەوە هەتا فرات داگیر ئەكەن ، هەموو پێغەمبەرەكان لەگۆڕەكانیان دێنە دەرێ ئەبنە كاربەدەستی پایە بەرزی ئەو ڕژێمە ، لەدوایی دا هەموو ئادەمیزاد ئەبنە ژێر دەستەو خزمەت گوزاری ئەو ڕژێمە ، شەیتان سەر شۆڕ ئەبێ و ڕەحمان سەرئەكەوێ ، ئەو كۆمەڵە لایەنگروو بەكرێ گیراوی زۆریان هەیە لەبەیروت و عەممان و بەغدا و دیمشق و قاهیرە و مەغریب و سعودیە لەمەو بەر بەئاشكرا ...مەبەستمان لەباس كردنی ئەوانەی ڕابورد ئەمەیە : پەنجە ڕاكێشان بۆ سەری مارەكە چۆن ئەوكارانەیان بۆ دابین ئەكرا ؟ زۆر ڕون ئەبێ دەستێ بوبێ بۆ ئەو مەبەستە یاریدەی دابن ، ئەو دەستانە لەژێرەوە هەندێ نامەردانە ڕۆژنامەو گۆڤار نووس ئەخەنە كار بۆ ئەو مەبەستە بۆگەنە ، نەخشەیان بۆ ئەكێشن بۆ بڵاو كردنەوەیان بەگورجی ئەگەنە جێگەی مەبەستیان ، بۆ سەرلێشێوانی هاونیشتمانان ، دروست كردنی ڕەگەز پەرستی وناكۆكی ئاین لەنێوان برایانی موسوڵمان بەتایبەتی و ئاینەكانی تر.

﴿ فجَعَلناها نَكالاً لِما بَينَ يَدَيها وَ ماخَلفَها ﴾ دوایی ئێمە گێڕامان ئەو گۆڕانەیان بەمەیمون بەترساندن بۆ كەسێ لەسەردەمی ئەو گۆڕانەیاندایە بەمەیمون ، بۆ ئەو كەسانەیش

لەپاش ئەوانەوە وێن لەگەلانی تر هەتا ڕۆژلای دوایی ، هەتا بەنوسینەوەی ئەو ڕوداوە تەمێ خوار بن ، گوناهباران فێڵ وفڕ بەکار نەبەرن بۆ نەکردنی فەرمانەکانی خوا .

﴿ وَ مَوعِظَةً لِلمتَقِين ﴾ وەگێڕامان بە ئامۆژگاری کردن بۆ کەسانێ لەخوا ئەترسن و خۆیان ئەپارێزن لەگوناه ، بۆ ئەو کەسانەیش تەمێ خوار بن بەهۆی گۆڕانیان بەمەیمون وەبیری لێ بکەنەوە هەتا باشتر لەخوا بترسن ، ئەو باسە جارێ تر لەمەو پاش لەقورئانی پیرۆز باسی ئەکرێ .

بۆ زانین : مرۆڤێکی بەساڵا چوو هەستی بەنزیك بونەوەی مردنی خۆی کرد ، بەندەیەکی چاکی خوا پەرست بووپرپوچی ڕازاوەی ژیانی جیهانی لای نەدابوو لەخوا پەرستی ، ئومێدی بەخوا بوو ، سامان و کوڕی زۆریشی نەبوو لەخوا پەرستی لای بدەن ، خاوەنی هیچ شتێ نەبوو جگە لەمانگایێ کەبردی‌یە نێو چیمەن و دارستانێ لەخوا پاڕایەوە بەدڵێکی پاك و لەشێکی دامەزراو ، ئەی ووت : ئەی خوایە ئەومانگایەم دایە دەستی یۆ هەتا ئەم کوڕەم گەورە ئەبێ ، هەروەها ئەو هیوایە هاتو چۆی ئەکرد لەدڵیا ، ئاواتیشی بەخوا بەهێز بوو هەتا مرد ، مانگاکەشی مایەوە بۆ تەنها کوڕە هەتیوەکەی ، ئەوەیش ڕواڵەتێکی نەماوەیەناگاتە فریای ئەو کوڕە ئەگەر خوای لەگەڵ نەبێ بەلام میهرەبانی خوای بۆ ماوەتەوە و گەورەتر لەهەموان ، هەتیوەکەش پەیتا پەیتا مانگاکەی بەخێو ئەکرد بەو هیوایەی باوکی بوکە بەمیرات بۆی بەجێ هێشتبوو ، بڕوای وابوو ئەو مانگایە دواڕۆژێکی سودی بۆ خۆی ئەبێ ، بەهۆی پاڕانەوەی باوکی .

دوایی واڕێکەوت، کەسێ لەگەورەپیاوانی ئیسرائیلی کە زۆر ساماندار بوو لەهەموو ڕووەیەکەوە ، خوا تەنها کوڕێکی پێ بەخشیبوو ، هەموو سامانەکەی بۆ ئەو کوڕە ئەگەڕایەوە دوای مردنی .

بەلام هەندێ لەئامۆزاکانی ئەو تاقە کوڕەیشیان کوشت :بۆ ئەوەی دوای مردنی باوکی سامانی ئەو پیاوە بۆ ئەو ئامۆزایەی بگەڕێتەوە ، کەچی کوشتنی ئەو کوڕەیان دایە پاڵ

هەندێ تر لە کوڕانی ئیسرائیل گێچەڵۆکەی نەگبەتی بۆی هەڵکردن ، وەخت بوو جەنگێکی وێڵ لەناو کوڕانی ئیسرائیل پەیدا ببێ ، بەبێ تاوان چەند کەسێ لەناو بچن ، بۆیە دیسانەوە بەلاساری خۆیانەوە پەلاماری موسایان دایەوە ،داوای کارەساتی کوژراوەکەیان لێ کرد ، ئەویش بۆ ئەو مەبەستە لەخوا پاڕایەوە ، خوا پەیامی بۆ موسا نارد مانگایە سەر بڕ ن هەندێ لەئەندامی ئەو مانگایە بکێشن بەکوژراوەکە و زیندوو ئەبێتەوە ، هەواڵی بکوژەکەی خۆیان ئەداتێ پاش بگرەو بەردەیەکی زۆر چەنە دانیان لەگەڵ موسادا ووتیان : ئەی موسا ئایا گاڵتەمان پێ ئەکەی یا بەڕاستیتە ، موسا فەرمووی: من پەنا ئەگرم بەخوا ئەوەی من ئەیزانم چۆن گاڵتە ئەکەم ، دوایی پرسیاریان لەڕەنگ وشێوازی ئەو مانگایە دوو جارو سێ جار مانگاکەیان سەربڕی و کوژراوەکە زیندوو بۆیەوە ، هەواڵی بکوژی خۆیانی دانێ ، بۆ ڕوون کردنەوەی ئەو ڕوداوە خوادەفەرموێ:

وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تَذْبَحُوا۟ بَقَرَةًۖ قَالُوٓا۟ أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًاۖ قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٦٧﴾ قَالُوا۟ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِىَۚ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا فَارِضٌ وَلَا بِكْرٌ عَوَانٌۢ بَيْنَ ذَٰلِكَۖ فَٱفْعَلُوا۟ مَا تُؤْمَرُونَ ﴿٦٨﴾ قَالُوا۟ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوْنُهَاۚ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ

إِنَّهَا بَقَرَةٌ صَفْرَآءُ فَاقِعٌ لَّوْنُهَا تَسُرُّ ٱلنَّـٰظِرِينَ ﴿٦٩﴾ قَالُوا۟ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِىَ إِنَّ ٱلْبَقَرَ تَشَـٰبَهَ عَلَيْنَا وَإِنَّآ إِن شَآءَ ٱللَّهُ لَمُهْتَدُونَ ﴿٧٠﴾ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا ذَلُولٌ تُثِيرُ ٱلْأَرْضَ وَلَا تَسْقِى ٱلْحَرْثَ مُسَلَّمَةٌ لَّا شِيَةَ فِيهَا ۚ قَالُوا۟ ٱلْـَٔـٰنَ جِئْتَ بِٱلْحَقِّ ۚ فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿٧١﴾ وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْسًا فَٱدَّٰرَْٰٔتُمْ فِيهَا ۖ وَٱللَّهُ مُخْرِجٌ مَّا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٧٢﴾ فَقُلْنَا ٱضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا ۚ كَذَٰلِكَ يُحْىِ ٱللَّهُ ٱلْمَوْتَىٰ وَيُرِيكُمْ ءَايَـٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٧٣﴾

﴿واذ قالَ موسى لِقَومِهِ اِنَّ اللهَ يامُركم ان تَذبَحُوا بَقَرَة ﴾ وەبیری ئەو کاتە بکەنەوە پیاوێکتان کوشت ، بەو بۆنەوە بوو بەئاژاوەتان ، هەندێکتان ئەوانی ترتان تاوان بارئەکرد ، بۆیە ئێمە پەیامان نارد بۆلای موسا بۆ نەهێشتنی ئاژاوەی نێوانیان ، لەو کاتەدا موسا فەرموی ، بەتاقمەکەی خۆی خوا فەرمانی بەئێوە داوە کە مانگایە سەرببڕن ، وەلەوکاتەدا موسا ئەو فەرمانەی پێ ڕاگەیاندن هەر مانگایەکیان سەر ببڕیایە مەبەستەکەیان پێک ئەهات . بەلام درێژەیان دا بەلاساری‌یەکەی خۆیان وە چەنەبازی‌یەکەیان ، بۆ

مەبەستەکەیان و هەروەك خوای گەورە کارەکەشی لەسەر گران کردن : ناونیشانی مانگاکەی لێ پەنهان دان هەتا تەمێ خوار بن ئەوەندە دەم درێژی نەکەن لەگەڵ موسا ، سەرگەردان بون بۆ دۆزینەوەی ئەو مانگایە ، بۆیە خوای گەورە فەرمانی پێدان مانگایە سەرببڕن نەك زیندەوەرێ تر چونکە مانگا لەوێنەی ئەو گوێرەکەیەبوو پەرستیان هەتا بزانن بێ نرخ و لاوازە ، چۆن ئەوان ڕێزیان ئەگرت و ئەیان پەرست ؟

﴿ قالُوا اتَتَخِذُنا هُزُواً ﴾ بەموسایان ووت ، ئایاتۆ گاڵتەمان پێ ئەکەی ؟ئێمە پرسیاری ئەو کوژراوەت لێ ئەکەین ، کەچی تۆ فەرمانمان پێ ئەدەی مانگایە سەر بڕین ، ئەو لاقرتێ پێ کردنەی تۆ ڕاست نی‌یە لای ئێمە .

﴿ قالَ اعوذ بالله ان اکونَ مِنَ الجاهِلِین ﴾ موسا فەرمووی من پەنائەگرم بەخوا کەمن لەکەسانی نەزان ونادان بم وگاڵتەچی بم ، من گاڵتەو لاقرتێ بەهیچ جۆرێ ناکەم ، چۆن لەگەیاندنی فەرمانی خوادا گاڵتەو لاقرتێ ئەکەم ؟

﴿ قالوا اُدعُ لَنا رَبَكَ یُبَیّن لَنا ما هيَ ﴾ ووتیان بەموسا تۆ داوابکە لە پەروەردگاری خۆت بۆ ئێمە بۆمان ڕون بکاتەوە و پێمان بناسێنێ چۆنە ڕەنگ و شێوازی ئەو مانگایە . پرسیاری جولەکەکان بەوجۆرە دارڕژاندنە ئەوە ئەگەیەنێ کەئەوان زۆر بێ شەرمن لە خزمەتی خوادا و پێغەمبەراندا ، ئەڵێن : پەروەردەکەری تۆ یانێ هی موسایە بەتەنها نەك هی ئەوان ، وەدووبارە پرسیارەکەیان وائەگەیەنێ ئەو ڕوداوە پەیوەندی بەوانەوە نیە بەڵکو پەیوەندی دارە بەخواو بەموساوە ، لەگەڵ ئەوەیشدا زۆر بەمیهرەبانی‌یەوە وەڵامی ئەدانەوە لەسەر زمانی موسا

﴿ قالَ انه یقولُ انها بَقَرَةٌ لا فارضٌ ولابِکرٌ عَوانٌ بَینَ ذلكَ ﴾ موسا فەرموی : بەڕاستی خوا ئەفەرموێ ئەو مانگایە فەرمانتان پێ دراوە سەری ببڕن ئەوەندە پیر نی‌یە نەزێت ، ئەوەندە کەم تەمەن نی‌یە ئاوس نەبێ ، مام ناوەندی‌یە لەو بەینەدایە ،واز لەلاساری وپرسیار

بێنن ئەو ڕستەیە گێل و گاواری جولەکەکانمان بۆ دەرئەخات ، یەکسەر خوا نافەرموێ : لەو نێوەدایە چونکە تێ ناگەن .

﴿ فَافعَلوُا ماتؤمَرُون ﴾ دوای بەگورجی ئێوە بکەن ئەوشتەی فەرمانتان پێ ئەدرێ سستی مەکەن لەسەر بڕینی ئەو مانگایە وجێبەجێی بکەن ئەو فەرمانەی پێتان دراوە .

﴿ قالوا ادعُ لَنا رَبَّك یُبَین لناَ ما لَونها ﴾ ووتیان بەموسا : زانیمان تەمەنی ئەو ماگایە چەندە بەڵام تەمەنداری وازۆرن ، داوابکە لەپەروەردگارەکەی خۆت ڕونی بکاتەوە بۆ ئێمە ڕەنگی ئەو مانگایە چۆنە ؟ فەرمانی دراوە سەری ببڕین .

﴿ قَالَ انه یقولُ انها بَقَرَةٌ صفراء فاقعٌ لونها ﴾ موسا فەرمووی : بەڕاستی پەروەردگاری من ئەفەرموێ ، بەڕاستی ئەومانگایە ڕەنگەکەی زەردێکی تۆخی یەکجار زەردە .

﴿ تَسرُ الناظرین ﴾ خۆش نود دەکا ڕەنگەکەی تەماشاکەرانی ، ئەوەندە جوان و ڕێك و پێکە لەش و تەنی ، تەماشاکەران وائەزانن تیشکی خۆرە لەپێستەکەی دێتە دەرێ جولەکەکان گێل و گەوجی خۆیانیان دەست پێکردەوە بۆ جاری سێیەم :

﴿ قالوا ادع لَنا ربَّك یُبَیّن لنا ماهی انَّ البقَرَ تَشابه عَلَینا﴾ ووتیان بەموسا تۆ داوابکە لەبو ئێمە ڕونی بکاتەوە بۆ ئێمە ئەومانگایە چۆنە ؟ بەڵێ زانیمان تەمەن و ڕەنگی چۆنە ؟ مانگای بەوجۆرە زۆرن . بەڕاستی ئەو مانگایە فەرمانی پێدراوە ئێمە سەری ببڕین کە لەتەمەندا مام ناوە ندییە و ڕەنگی زەردی تۆخیوا زۆرن ، چۆنیەتی ئەو مانگایە لەسەرمان کەوتووە و لێمان تێك چووە ، ووشەی ﴿ البَقَر﴾ بۆ نێرو بۆمێ بەکار ئەهێنرێ ، وەك ووشەی ﴿ قَوم﴾کەواتە جێگەی پرسیار نییە بۆچی جارێ پیتی ﴿ تاء ﴾ ی پێوەیەو جارێ پێوەی نییە .

﴿ وانا اِن شاءَ الله لمهتَدون ﴾ وەبەڕاستی ئێمە خوا ئارەزوی هەبێ ڕێگە نومایی وەرئەگرین ئەو فەرمانەی پێمان دراوە جێبەجێی ئەکەین .

﴿ قالَ انه یقول انها بَقَرةٌ لاذَلولٌ تُثیرٌ الارضَ ولاتسقی الحرثَ ﴾ موسا فەرموی بەڕاستی پەروەردگاری من ئەفەرموێ : بەڕاستی ئەو مانگایە مانگایەکە بەرەڵا کراوە بۆ لەوەڕاندن ، نەرام کراوە بۆ کار کردن لەزەوی و زەوی بکێڵێ نەبۆ ئەویش ڕووەك و شینایی و شێن چێنراوی پێ ئاو بدرێ .

﴿ مُسَلّمة لا شیةَ فِیها ﴾ دورە لەشورەیی و نەنگی ، نیشانەی خراپی پێوەنیە ، جگە زەردی پەڵەی تری پێوە نیە بەهۆی کارکردنەوە برین دار نەبووە بەرەڵا بووە نەبەستراوەتەوە خراپەو ناحەزی تێدانی یەو نابینرێ .

﴿ قالوا الآنَ جِئتَ بِالحَق ﴾ ووتیان ئائێستا ئەی موسا تۆ هێناوتە ڕاستی‌یەکەی و بۆمانت ڕون کردەوە ئەزانین چ مانگایەکە . لەو ووتنەی ئەوان وادەرئەکەوێ لەوەو بەر موسا ڕاستی نەهێناوە بابڕوایان بەڕاستی ئەوانەی پێشو نەبووە هەتائێستا ، بەهەرچۆنێ بێ گێل و گەوجی خۆیان دەرئەخەن .

﴿ فَذبحوها وما کادوا یَفعَلون ﴾دوایی چون و گەڕان بەشوێن ئەو مانگایەدا و دەستیان کەوت لای کوڕی ئەو پیاو چاکەی باسی کرا ئەو کوڕە دوای مردنی باوکی زۆر گوێڕایەڵی دایکی بوو بەتایبەتی لەفرۆشتنی ئەو مانگایەدا ، جولەکەکان ئەو مانگایەیان کڕی بەنرخێکی زۆرو سەریان بڕی . نزیك بوو ئەو کارە نەکەن وە ئەو فەرمانەی پێیان درابوو لەسەر بڕینی ئەو مانگایە جێ بەجێ‌ی نەکەن ، بەهۆی پرسیاری زۆریان و دوودڵیانەوە دوای فەرماندان بەسەربڕینی ئەو مانگایە و داواکردنی جولەکەکان لەموسا بۆ دۆزینەوەی ئەو مانگایە کە سەری ببڕن ، خوای گەورە ڕوو ئەکاتەوە مەبەست لەفەرمان دانە بەجولەکەکان هۆکەی چ شتێ بوو خوا فەرموی :

﴿ وَاذقَتَلتم نَفساًفادّارءتم فیها ﴾ وە ئێوە بیری ئەوکاتە بکەنەوە ئەی بەنو ئیسرائیلی ، ئێوە مرۆڤێکتان کوشت ، دوایی ئێوە ناکۆکی و ئاژاوەتان لەنێودا پەیدا بوو بۆ دۆزینەوەی بکوژی ئەو مرۆڤە ، هەریەکەتان ئەو تاوانەتان لەخۆتان دور ئەخستەوە ، ئەتان دایە پاڵی

ئەوی ترتان ، هەر یەکەتان ئەتان ووت : ئێمە نین و ئێوەن ، وەهیچ کەستان بەووتەی خۆتان ئاگاداری کوشتنی ئەو مرۆڤە نین بەلای خۆتانەوە .

بەوڕستە خوای گەورە کوشتنی ئەو مرۆڤە ئەخاتە ئەستۆی هەمویان ، هەرچەندە هەر یەك نەفەر ئەو پیاوەی کوشتوە هەتا ئەوە بگەیەنێ هەر گەلێ بەتوندی خۆیانیان بەیەکەوە بەست وەك یەك کەسیان لێ دائەنرێ . کەواتە کارێ یەکێ کیان وەك هەمویان کردبێت وایە ، چونکە هەمویان پێی ڕازین هەروەها لەگەڵ ئەو جولەکانەیەتی لەسەردەمی پێغەمبەردان ، لەبەر ئەوەی ئەوان پاشماوەی ئەو کەسانەی سەردەمی موسان ، بەکردەوەکانیان قیناتن .

﴿واللهُ مُخرِجٌ ما كنتم تَكتمون ﴾ وەخوا دەری خست و ڕونی کردەوە شتێ ئێوە دای ئەپۆشن لە باسی ئەو مرۆڤە کوژراوە دا کەکوشتبویان ، دەستتان دابویە ناکۆکی نێوان خۆتان بەهۆی بکوژەکەوە ، هەتا بکوژی ڕاستەقینە دەرکەوێ ، هیچ کەسێ بەنارەوایی ستەمی لێ ناکرێ . کەوا بوو شاردنەوەکەی بێ سوودە ، خوا هەموو شتێ ئەزانێ وەدەریشی ئەخا ، هەموو خراپی و لاساری ئێوە ئەزانێ .

﴿ فَقُلنا اضرِبُوه بِبَعضِها ﴾ دوایی ئێمە بەئێوەمان ووت ئێوە بدەن لەلەشی ئەو کوژراوە بەهەندێ لەئەندامی ئەو مانگا سەر بڕاوە ، ئیتر ئەو ئەندامە زمانی ئەو مانگایە بێ یاڕانی یا جێگەیە تر بێ گرنگ نیە ، ئەوەی شایانی باس بێ ئەو لێدانە بەڵگەیە لەسەر توانای خوا وەئاسانی کارو باری کوڕانی ئیسرائیل خوای گەورە ئەو کارەی لەگەڵ کردن بەتایبەتی ، هەرچەندە ئەو کوژراوە یەکەم کەس نەبووە نارەوا خوێنی برژێ بەلام لەبەرێز داری موساو لەکیس نەچونی ئەو خوێنە ، ئەگەر وانەبوایە گومانیان پتر ئەبوو بێ باوەڕتر ئەبون ، بڕوایان بەموسا کەمتر ئەبویەوە .

﴿ كَذلِكَ يُحيِ اللهُ المَوتى ﴾ هەربەوجۆرەی بەلێدانی ئەندامێکی ئەو مانگایە ئەو مرۆڤە کوژراوە زیندوو بۆیەوە هەروەها خوا زیندوو ئەکاتەوە هەمو مردووەکان لەڕۆژی دواییدا

بەئاسانی تر بۆ وەرگرتنی پاداش و تۆڵە ، ئەو کەسەی بتوانیٚ تاکە کەسیٚ زیندوو بکاتەوە ئەتوانیٚ هەموو بونەوەران زیندوو بکاتەوە ، ئایا لەپاش ئەو بەڵگە بینراوە گومانتان هەرئەبیٚ و گوناه ئەکەن ؟

﴿ وَيُرِيَكُم اياتِه لَعَلَكُم تعقِلون ﴾ وەهەر بەو جۆرە خوا نیشان ئەدا بەئێوە و پێتان ئەبینیٚ چەندین بەڵگەو نیشانەی ئاشکرا لەسەر توانای خۆی بۆ ئەوەی ئێوە ئەقڵ بەکار بهێنن ئەو کەسەی ژیری خۆی نەخاتە کار وەك ئەقڵی نەبیٚ وایە ،

بۆ ئاگاداری : ئەو زانایانەی مانای قورئانی پیرۆزیان کردووە هەر لەزانایانی ئەم سەردەمەوە هەتا ئەگاتە ئیبنو عەبباس و بەویشەوە خوا لیٚیان ڕازی بێت باسی سەربرینیٚ ئەو مانگایە و کوشتنی ئەو مرۆڤە و ڕون کردنەوەی بکوژەکە بەو جۆرە مانایان کردووە ئێمە باسمان کرد . یانی دارڕاندنی باسەکە بەم جۆرەیە : ئێوە بیری ئەو کاتە بکەنەوە مرۆڤێکتان کوشت و کەوتنە دوبەرەکی کردنی یەکتری ، خوا فەرمووی : مانگایە سەربڕن و هەندیٚ لەبەدەنی بدەن لەو کوژراوە و زیندوو ئەبێتەوە ، ناوی بکوژەکەتان پیٚ ئەڵیٚ ، ئەوانیش کردیان و ناوی بکوژەکەیان بۆ دەرکەوت .

کەواتە ئەو چیرۆکە یەك چیرۆکە لەناوەرۆك و لەمەبەستاو یەك جار بەستراون بەیەکەوە ، زۆر پەیوەندارن بەیەکەوە چونکە مەبەستەکە یەکە کەبریتی‌یە لەڕون کردنەوەی بکوژەکە بەلاٚم بەڕواڵەت بەدوو چیرۆك ئەبینریٚ ، لەبەر ئەوەی جولەکەکان تاوانیان زۆرن بەدوو تاوانی تر لەو چیرۆکەدا ئەیان ترسێنیٚ : یەکەم بەتاوانی گاڵتە کردنیان بەفەرمودەی موسا و کتو پڕ نەچونیان بەدەم فەرمانی موساوە ، دووەم بەتاوانی کوشتنی ئەو پیاوە بەناڕەوا بۆیەش خوای گەورە فەرماندان بەسەربڕینی مانگاکەی پێشخستووە لەو چیرۆکەدا بەڕواڵەت وبەناوەرۆك ،لەسەر باسی کوژراوەکە هەتا ئەو تاوانە بگرێتەوە ، بەپێچەوانەوە باس بکرایە : یانیٚ کوشتنی مرۆڤە پێش خرایە بەیەك چیرۆك دانەنرا بەڕواڵەت و بەناوەرۆك ، ئەو دوو مەبەستەمان لەکیس ئەچوو.

لەپێشەوە باسکراوە خوای گـەورە ئـەوکارە بـە کـەس نەکراوانـەی کردوویـەتی بـۆ کوڕانی ئیسرائیل بۆ کەسی تری نەکردووە ،بەرامبەر بەهیچ کەسی ترناکرێن ئەوەش لـەبـەر ڕێزداری مووسایە لەلایەکەوە ، لـەبەر لاساری و گەوجی جوولەکەکانە لە لایـەکی تـرەوە کەواتە ڕێگە لـەم پرسیارانە ئەبەسترێت و پێویستە نەکرێن :بۆچی خوای گەورە یەکەم جـار کوژراوەکەی زیندوو نەکردەوە بێ ئـەوەی مانگاکـە سـەربڕن بـەو هەمووتوانایـەوە خـوا هەیەتی بۆچی ئەو مرۆڤە زینـدوو بوویـەوە بـە لێدانـی پارچەیـەك لـەو مانگایـە بـۆ ئـەبێ مانگایەکی تایبەت بێت نەك هەموو مانگایەك یاشتێ تـر ؟سـوودی لێدانـی ئـەو کـوژراوە بەپارچەیە لەو مانگایە چ شتێ بێ و بۆ ئەبێ وابێ؟ هەموو ئەو پرسـیارانە ئاڕاسـتە نـاکرێ دوای ئەوەی زانیمان کوڕانی ئیسرائیل وەکو کەسی تریان لـەگـەڵ نـەکراوە ئـەو وەڵامانـە یەکێك لـەو کارانە بووە تە هۆی ڕێزیان بەسەر هەموو ئـادەمیزانی سـەردەمی خۆیـان هـەتا ئێرە مانای بڕوا پێکراوی چیرۆکی مانگای سەربڕاوە.

بەڵام هەندێ لەزانایان لـەم سەردەمەدا وەك مامۆستای بەڕێز ئیبن و عەبدە لـەماناکردنی چیرۆکی:{بیری ئەو کاتـە بکەنـەوە موسـا فـەرمووی : خـوا فـەرمانی پێـداون مانگایـەك سەربڕن}هەتا کۆتای چیرۆکەکەو مامۆستا عبدول وەهاب نەجاڕیش لە {قصـص الانبیـاء} ی خۆیا ئەفەرموێ: چیرۆکی { وەبیری ئەو کاتە بکەنەوە مرۆڤێکتان کووشت هەتا کۆتایی چیرۆکەکە .ئەو دوو مامۆستایە ئـەڵێن هەریەکـە لـەو دووچیرۆکانـە چـیرۆکی تایبـەتین و پەیوەنیان بەیەکترەوە نیە نەجار ئەفەرموێ ئەگـەر تەماشـای ئـەو چیرۆکانـە بکـەین خـوای گەورە لـەم چیرۆکەدا ئەیان گێڕێتەوە لەبارەی کوڕانی ئیسـرائیل ئـەوەمان بـۆ پێـك دێـت هەریەکەیان چیرۆکی تایبەتین و پەیوەندیان بەیەکترەوە نیە ،وەك ئەفەرموێ بیری ئـەو کاتـە بکەنەوە کەرزگارم کردن لـە پیاوەکانی فیرعەون } بیری ئەو کاتە بکەنەوە کەدەریاکەم بـۆ پارچە پارچە کردن ، بیری ئەو کاتە بکەنەوە بەخشیم بەموسـا نامەیـە ، بـیری ئـەو کاتـە بکەنـەوە کـە موسـا فـەرمووی بەتاقمـەکانی : سـتەمتان لـەخۆتان کـردووە بەپەرسـتنی

گوێرەکەکە ، بیری ئەو کاتە بکەنەوە بەموساتان ووت بڕواتان پێنایەرین هەتا خوا بە چاو نەبینن بەئاشکرا . بیری ئەو کاتە بکەنەوە ووتمان بچنە نێو ئەو دێیە کەقودسە . بیری ئەو کاتە بکەنەوە کەموسا داوای ئاوی کرد بۆ خزمەکانی . بیری ئەوکاتە بکەنەوە بەمووساتان ووت :ئێمە ئارام ناگرین لە سەر یەك خواردەمەنی . وە بیری ئەو کاتە بکەنەوە کێوی طورم بەرزکردەوە بەسەرتانا.بیری ئەو کاتە بکەنەوە کەمووسا فەرمووی بەتاقمەکانی مانگایەك سەربڕن . بیری ئەو کاتە بکەنەوە مرۆڤێکتان کووشت ناکۆکی لەنێوانتاندا پەیدابوو..فەرموودەی ئەو دووماماۆستا بەڕێزانە کۆتایی هات .

ڕوونکردنەوەی بیرو بۆچوونی ئەو دووماماۆستا بەگوێرەی دارژاندنی چیرۆکەکان وادەگەیەنێ چیرۆکی کوشتنی ئەو مرۆڤە سەربەخۆیەو پەیوەندی بەچیرۆکی مانگاکەوە نیە هەریەکەیان باسێکی تایبەتین .کەواتە مانای چیرۆکی یەکەم بەم جۆرەیە :(کوڕانی ئیسرائیل پیاوێکیان لەخۆیان کووشت و دۆزرایەوە لەنێو بێستانێکدا ،ئەو بێستانەش لەنێوان چەند شارێکدا بوو نەیان ئەزانی چ کەسێ کووشتویەتی سەرگەردان بوون ڕووداوەکەیان بردە لای مووسا ئەویش فەرمووی مانگایەك سەربڕن ،ئەوانیش وەك باسکرا لاساری وچەنە بازی)زۆریان کرد لە ئەنجامدا سەریان بڕی موساش ئەوپیاوانەی نزیکی جێگەی کوژراوەکە بوون کۆی کردنەوە هەموویای سوێندا ، مانگا سەربڕاوەکە لەبەر دەمیان بوو وتیان :ئێمە ئەو کوژراوەمان نەکوشتوە ناشزانین چ کەسێ کووشتویەتی ئەو سوێند دانە لە دەستووری ئاینی ئەواندا وەك سوێند خواردنی ئێمەیە ئەگەر مرۆڤێکی کوژراو لەناوچەیەکدا جێگەی ناوچەی خۆی و خزمانی بوو یا لەنزیك گەڕەکێکەوە بوو ئەو کوژراوە ، نە ئەزانرا چ کەسێ کوشتویەتی بەڵگە بۆ ڕاستی داواکاری خۆێنەکە لەوێدا ئەسەلمێنرا کە لە جێگەیە بێ ، خاوەن خوێنەکە ، (٥٠) پەنجا سوێن ئەخوا خوێنەکە لەخزمانی خاوەنی ئەو جێگەیە دەسەنرێ لای پێشەوا شافیعی ، بەلاّم لای حەنەفیەکان ئەڵێن : لەڕوداوێکی وادا کار بەدەستانی ئەوجێگەیە (٥٠) پەنجا پیاو لەپیا چاکانی ئەو

جێگەیە هەڵئەبژێرن و سوێنیان ئەدەن و ئەڵێن : ئێمە نەمان کوشتوە ونازانین چ کەسێ کوشتویەتی لەئەنجامدا خوێنەکە لەدا نیشتوانی ئەو جێگەیە ئەسێنن ، ئەوە باسکرا مانای چیرۆکی یەکەمە :

مانای چیرۆکی دووەم لای ئەو دوو مامۆستایە بەم جۆرەیە :

مرۆڤێ کوژرا لە ماڵێکا لەگەڕەکێکدا لەجەنگی کۆمەڵێکا ، هەموو کەس کوشتنی ئەو مرۆڤەی لەخۆی دور ئەخستەوە بکوژ نەئەزانرا ، گومانی کوشتنی ئەو مرۆڤە ئەبرایە سەر کۆمەڵێکی دیاری و ژمێردراو ،بکوژیش لەنێو ئەواندا بوو ، خوای گەورە بکوژەکەیانی بۆ دەرخستن بەم جۆرە تاوان باریان هێنا پارچەیە لەو کوژراوەیان لێ دا بەمەرجێ بەخۆیەوەبێ ،ئیتر دەستی بێ یا پێی ئەیان کێشا بەگومان لێکراوەکەدا ، ئەگەر پاك بوایە هیچ شتێکی لێوە نەئەبینرا ، ئەگەر بکوژ بوایە ئەکەوتە لەرزین و ڕەنگ تێك چون و کاری نائاسایی لێوە نەئەبینرا بەو بۆنەوە بکوژیان بۆ دەرئەکەوت . کەسیان بەناڕەوا نەکوژرا عەبدول وەهاب لەسەر ئەو باسە ئەڕواو چەندین نمونەی تری بۆ ئەهێنێتەوە ، لەئەنجامدا ئەڵێ : هەمویان خۆماندو کردن و هەوڵدان و لەوانەیە ڕاست نەبن و پشتیان پێ نەبەسترێ . ئەوپەڕی ڕێزم بۆ ئەو دوو مامۆستایە بەندە پێم وایە ئەو پیرۆکەی سەر برینی مانگاو چیرۆکی کوشتنی مرۆڤەکە یەك چیرۆکن ، وەپێش و پاشە بۆ ئەوەی ئەو دوو تاوانەی کوڕانی ئیسرائیلمان لەکیس نەچێ ، وەك باسکرا ، لەفەرمودەی خوادا پاش و پێش نی‌یە و فەرمودەی خوا لەیەك کاتدا هەموو کارێکی پێ ئەنجام ئەدرێ .

پاش ڕوداوی سەربرینی مانگاکە و دۆزینەوەی بکوژ ، قورئانی پیرۆز ڕونی ئەکاتەوە ئەو هەموو کارە بەکەس نەکراوە نەکە هەستو دڵی هەموو کەسێکی دا ئەخوڕیان و ئەیان ڕواند لەمێشکا باوەڕ بەخوا ، ئەوەتا هەمویان کاریان نەکردە سەر دڵی ڕەقی کوڕانی ئیسرائیل ، لەدوای چاو پێکەتنی ئەوانە هەموو کردەوەی نالەبارو ناڕەوای وایان لێ پەیدا

بوو هەموو شتێکی چاکی لەدڵیانا شۆردەوە ، وەهەمو پەندو تەمێ کردن لەمێشکیانا پەرتەوازەکرد ، وەك خوا ئەفەرموێ .

ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَهِىَ كَٱلْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً ۚ وَإِنَّ مِنَ ٱلْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ ٱلْأَنْهَٰرُ ۚ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ ٱلْمَآءُ ۚ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ



﴿ ثُمَ قَسَت قُلُوبكم مِن بَعدِ ذلكَ ﴾ لەپاشا ئێوە دڵتان نەرمی تێدا نەما و ڕەق هەڵگەڕا لەپاش ئەو شتە بەکەس نەکراوا نەتان چاو پێکەوت لەتوانای ئادەمیزاددا نەبون و من پێم نیشان دان ، لەزیندوو بونەوەی کوژراو ئەو شتانەی ئەبونە هۆی نەرمی دڵان وەبەرەو ڕاستی ڕاتان ئەکێشێ. کەچی ئەو دڵانەی ئێوە لەسەر ڕەقی و ووشکی مانەوە :

﴿ فَهِيَ كَالحِجارة ﴾ دوای ئەو دڵە ئێوە وەك بەرد وایە لەڕەقی‌دا هەرگیز نەرم نابێ ، ئەو ئایەتە ڕو ئەکاتە ئەو کەسانەی سەردەمی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ، چونکە بەکردەوەی باو باپیرانی پێشویان قنیاتن ، وەك ئەمان کردبێتیان وایە یالەگەڵ ئەو کەسانەی سەردەمی موسادا بوون ، هەرکامیان بێ جێگەی خۆیەتی .

﴿ او اشَدُ قَسوَةَ ﴾ وە یائەو دڵەی ئێوە لەبەردیش ڕەق ترە لە ئاسن ، بەئاگر نەرم ئەبێ واش ئەبێ ئەتوێتەوە ، بەرد هەرگیز نەرم نابێ بۆیە خوا ئەفەرموێ .

﴿وانَّ مِنَ الحِجارَةِ لَما یَتَفَجَّرُ مِنهُ الأنهار﴾ وەبەڕاستی لەناو بەردا بەردی واهەیە چەندین کونی زۆرو قلیشی وای تێدایە چەندین ڕوباری لێ هەڵئەقوڵێ .

﴿ وَإنَّ مِنها لَما یَشَّقَّقُ فَیَخرُجُ مِنه الماءُ ﴾ وەبەڕاستی هەندێ بەرد هەن درزی تێدا ئەبێ دوایی لەو بەردە ئاو دیچتە دەرێ ، لەو ڕستانەدا ئاو کراوە بەدوو بەشەوە ئاوی زۆرو ئاوی کەم ، ئاوی زۆر بەڕوبار ناو ئەبرێ هەڵقولاویش بۆ ئاوی زۆر بەکار ئەهێنرێ ، بۆیە خوا ئەفەرموێ چەندین ڕوباری لێ هەڵ ئەقوڵێ ؛ بەلام ئاوی کەم بەکانیاو یابەبیر ناو ئەبرێ و دێتە دەرێ وایش ئەبێ بڕۆن بەسەر زەویدا ، هاتنە دەرەوە بۆ ئاوی کەم بەکار ئەهێنرێ بۆ یە خوا ئەفەرموێ ئاوی لێ دێتە دەرێ .

﴿ وَإنَّ مِنها لَما یَهبِطُ مِن خَشیَةِ اللهِ ﴾ وەبەڕاستی هەیە لەبەردا بەردێ نری وا لەسەر لوتکەی کێو بێ یالەژورەوە ئەکەوێتە خوارەوە لەترسی خوا ؛ بێگومان ترسی خوا کار ئەکاتە سەر بەرد ؛ ئەوەتا خوا ئەفەرموێ ﴿ وَإن مِن شَیءٍ الاّ وَ یُسَبِّحُ بِحَمدِهِ ﴾ وەنیە هیچ شتێ ئەگەر ببێ پاکی خوا دەرئەبڕێ بەسوپاس کردنی خوا ، بەلام ئێوەی بەنو ئیسرائیل ئامۆژگاری کار ناکاتە سەرتان ،

بۆ چاکە مل کەچ نین ؛ ئەو فەرمانەی پێتان بدرێ بەجێی نایەرن ؛ لەگەڵ ئەو هەمو تۆڵەو پاداشت و بەڵگانە وە بەدوای بەکادێن بەچاوی خۆتان دیتان ؛

﴿ وَمااللهُ بِغافِلٍ عَمّا تَعمَلون ﴾ وەخوا بێ ئاگانی یە لەوشتەی ئێوە ئەیکەن ئەورستەیە هەڕەشەیە لەوان بەتوندی و سامناکی ، خوا پرسیاریان لێ ئەکا لەپاشەڕۆژدا و مافی خۆیان وەرئەگرن سزایان ئەدا لەتۆڵەی سوپاس نەکردنیان بۆ چاکەو بێ فەرمانی کردنیان ؛ لەوەوە بۆمان دەرئەکەوێ دڵی جولەکەکان جیاوازن ، هەندێکیان وەك بەرد وان لەبەرد ڕەقترە . خوای گەورە بەو (١٠) دە چیرۆکانەی ڕابوردن بیری کوڕانی ئیسرائیل ئەخاتەوە ئەوپەڕی چاکەیان لەگەڵ کراوە لەگەڵ ئەوەشدا تەمێ خوار نەبوون بۆیە بەورستە ڕابوردووە هەڕەشەیان لێ ئەکا .

ئەو پەندوو ئامۆژگاری‌یانەی لەباسی ئەو (١٠) دە چیرۆکانەوە وەرئەگیرێن بـۆ ئەوەیـە ئێمەی موسوڵمان وەك جولەکەکان نەبین چاکترین کۆمەڵ بین بۆ ئادەمیزادکەهاتبنـە سـەر زەوی وەخۆمان لەوکارە نارەوایانەی جولەکەکان دوور خەینەوە کەئەمانەی خوارەوەن :

١- ئەو چیرۆکانە بەڵگەن لەسەر ئەو دینەی جولەکەکان لەسەری بون ، لەدڵ پیسی‌و دڵ رەقی و لاساری‌و گەوجیان لەگەڵ ڕابەری خۆیـان ، پرسـیاری زۆریـان بـەبێ هـودە ، گـوێ نـەدانیان بەفـەرمودەی پێغەمبـەرەکانیان ، سسـتی کردنیـان لەبـەجێ هێنـانی ئـەو فەرمانانەی پێیان ئەدرا ڕێگەی خوارو خێچ گرتنیان .

٢-ئەو چیرۆکانە بە ڵگەن لەسەر ڕاستی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بۆ ئەو یاسایانەی لای خـواوە ئەی گەیاندن بەئادەمیزاد بەبێ ئەوەی ئەو ڕوداوانەی دیبێ نمونەیەکن بۆ ڕاستی پێغەمبـەروو بۆ ڕاستی موسا .

٣- ئەو چیرۆکانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کۆڵ بدرێ لەپرسـیاری زۆرکردنـی یاسـای ئایین ، یانێ ببێژرێ بۆ ئەبێ ئەم یاسایانە بەم جۆرە بـن ، چونکـە سەرئەکێشـێ بـۆ ئـەوەی فەرمانەکانی خوا قورستر بکرێ لەسەریان ، ئەگەر کوڕانی ئیسـرائیل دەسـت بـەجێ هـەر مانگایەکیان سەر ببڕایە بەسیان بوو، بەڵام پرسیاری زۆریان ئاوای بەسەر هێنان و ڕابورد .

٤- دروست نی‌یە فەرمانێ لای خواوە هات ببێـژرێ بۆچـی ؟ پێویسـتە یەکسـەر مـل کەچی فەرمانەکەی بین ، ئەبوایە نەیان ووتایە بەموسا : تـۆ گاڵتـەمان پـێ ئەکـەی ، ئێمـە ئەڵێین پیاوی کوژراو تۆ ئەڵێیت : مانگایە سەر ببڕن ، هەتا وای لێ هـات تووشـی ئـازاری زۆر بوون .

٥- ئەو چیرۆکانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی هەموو پێغەمبـەران لەسـەر یـەك شـت پێـك هاتووە لەئادەمەوە هەتا پێغەمەری ئیسـلام ، لـەزیندوو بوونـەوەی هـەموو بوونـەوەران و هەڵسانیان لەگۆڕەکانیان ، بەبێ جیاوازی وەك زیندوو بوونەوە کوژراوی نێـوان کوڕانـی ئیسرائیل .

٦- ئەو چیرۆکانە ئەوەمان پیشان ئەدا خوای گەورە نیشانە و بەڵگەی زۆر دێنێتەوە بۆ بەندەکانی خۆی لەچەندین لاوە ، هەتا بەباشی ڕانومایی وەرگرن ، گومڕایانیش بیانویان نەمێنێ .

٧- ئەو چیرۆکانە بۆمانی ئەگێڕێتەوە ئەو گەلەی جولەکە لە دڵ ڕەقی و دڵ پیسیدا وێنەیان نیە باوەڕ بەخوا جێگیر نابێ لەدڵیانا بەچاکی .

٨-ئەو چیرۆکانە ئەوەمان پیشان ئەدەن ئەو جولەکانە (٢) دووجار گیرۆدەی دەستی مانگابوون ، جارێ بەپەرستنی گوێرەکە جارێ تر بەسەربڕینی مانگایە ، ئەو گیان لەبەریش گێل ترینی جانەوەرانە ، جگە بۆ سەربڕین و جوت پێکردن وئاودان و شیردان و شتێ تر نەبێ بەکاری هیچ شتێ نایەن نایشتوانن ئەو شتانە لەخۆی دوور خەنەوە ئیتر چۆنیان ئەپەرست ؟

٩-ئەو چیرۆکانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی ستەمکارو یاخی بوون لەخوا پێویسە بەرگری لێ بکرێن و لەدژیان هەڵسین ، وەك ئەو ستەمەی فیرعەون کردی ، ئەو ستەمەی بکوژی ئەو مرۆڤە کردی ، ئەیویست میراتەکەی بخوا خوای گەورە کردی بەپەند و ڕیسوای کرد و میراتەکەشی بۆ نەبوو .

١٠-ئەو چیرۆکانە بەڵگەن لەسەر توانای خوای گەورە کەبتوانێ بەپارچەیە لەلەشی مانگایە مرۆڤێ زیندوو بکاتەوە ، ئەتوانێ هەموو بونەوەران زیندوو بکاتەوە وە ك مراندنی.

١١- ئەو چیرۆکانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی ئەو گەلەی بەچەوساندنەوە ڕامبوو ، ستەم و ڕوتانەوەیان بۆ بەکار هێنرابێ لەلایەن فەرمان ڕەوایانەوە و ئەوانەی بەدرێژی لەگەڵیان کرا ئەو شتانە ئەبنە میراتی گلاویان و بەشێ لەسروشتیان ،وەك جولەکەکان کە دەقیان گرتبوو بە ستەم و چەوساوەی فیرعەون ، بێ نرخ و ترسنۆك و چاو چنۆك بوبون هەتاموسا داوای لێکردن بچن بۆ قودس کەچی ئەوان ئەو هەمووە ئازارەی موسایان ئەدا ، لێرە دا واچاکە چاوێ فڕە بدەین بۆ سەر کۆمەڵگای ئەمڕۆماندا بەچ جۆرێ داوێن پیسی و بێ

ڕەوشتی کاری کردۆتە سەریان ، گرنگترین کاری کوشندە بۆ پەیداکردنی هەموو ڕەوشتێکی بێز لێ کراوە توشی ئەم گەلەی ئێستامان بو ، وەك فلیمی سینەماو فیدیۆ و پرۆگرامی تەلەفزیۆنی و لادانی پەردەی شانۆ گەری و ڕۆژنامەو گۆڤار ئایا ڕەواو ڕاستە ئەوانە بخرێنە پشت گوێ و وازیان لێ بهێنین ، هەر لەبەر ئەوەی خاوەنی ئەوانە سامانی زۆریان دەست کەوێ لەسەر ژمارەی تێکدانی ڕەوشت وبێ ئابڕوویی ئێمە ، پارەو پولیشیان بدەینێ ..ئەی کۆمەڵی برایان و خوشکانی بەڕێز: چۆن ئەبێ ئەوانە ڕەوابن لای ئێوە ؟ ئایا ڕاستە چاو لەفلیمی بێگانە داو ێن پیسەکان بکەین کەهەمویان دوژمنی ئیسلام ونیشتمانن بەهۆی جولەکەکان وەبەکرێ گیراوەکانیانەوە ئەبرێن بەڕێوە ئێمەیش پەیڕەویان بکەین ئەو فلیمانە بکەین بەبت و خواردەمەنی خۆمان و خێزانمان کەهاندەرو پەیداکەری هەموو کارێکی ناڕەوان .

بۆ نەبێ کاربەدەستانی ئیسلام چاودێری و پشکنینی زۆرو چاك نەخەنە سەر ئەو فلیمانە لەدەرەوە ئەهێنرێن یالەناو خۆ دروست ئەکرێن و بڵاو ئەکرێنەوە بۆ ئەوەی دوور بین لەڕوتی ژنان و بەرەڵایی پیاوان نە بنە هۆی ئەوشتانەی ناوبران شەرمە باس بکرێن و پەیدابن لەنێو نەوەی تازەماندا ؟

ئەی بۆ کاربەدەستانی ئیسلام دانەخەن دەرگای ئەو ڕۆژنامەو گۆڤارانەی شورەیی و بەد ناوی ئادەمیزاد بڵاو ئەکەنەوە ئابڕویان ئەبەن ، وەکو وێنەی ڕووت و قوتی ژنان لەیەکەم لاپەڕەی ئەو ڕۆژنامەو گۆڤارانەدا دایان ئەنێن تەنها بۆ جولانی ئارەزوی خوێنەران و بینەرانی ، ئەوان بەتەمای بازرگانیەکی بێ نرخ ، یان هیچ نەبێ یارمەتی یان نەدرێ ؟

ئەی بۆ کاربەدەستانی ئیسلام بەرگری ناکەن لەسوڕدانی ڕوژ ئاوایی و بێگانەکان کەئەو پەڕی جولێنەری ئارەزواتی گلاوی ئاژەڵێن بەتایبەتی لاوانمان ئەوانە شێر پەنجەی کۆمەڵانن گەورەترین زیان بەخشن هەتا دەوری ئاین پەرستی و نیشتمان پەروەری ببڕن ئەی بۆ فلیمی پۆلیسی دانەخرێن کەئەبنە هۆی فێرکردنی کوشتن و بڕین و دزی و داوێن

پیسی : کەنەوەو منداڵەکانمان ئەبنە دڕوندەو توشی هیستریای تالآن و تاوانیان ئەکەن ؟ئەی بۆ کاربەدەستانی ئیسلام پردێکی پۆلآیی نە بن لەبەردەم بەرگ و مۆدیلی هێنراو یادەست کردی ناو خۆمان ، کەجێگە شورەیی و خراپەکانی ئەو شوێنانەی ژنان ئەبنە هۆی گڕ سەندنی ئارەزوو هەستی لاوانمان کەهیچ یاسایەکی ئاینو مرۆڤایەتی ئەو شتانە بەڕەوا دانانێ، بیر لەکاری سود بەخش بۆ خۆیان و گەلیان نەکەنەوە ، ڕۆژ باش و هەلاویان ووشەی نارەوا بێ کەشەرمە ووتنیان ئایا ئەوانە شارستانی و پێشکەوتنە ؟ ئەوانە نەخۆشین ئەوانە شێر پەنجەی کۆمەلآیەتین ئەوانە ڕوخێنەری پێشکەوتن و شارستانی و مافی ڕەوان کۆمەڵگاکەمان بەرەو نەمان ئەبەن ؟

دوا ڕۆژی بێباوەڕی بەخوا و بەئاین و ستەم کردن لەبونەوەران ئەبێ چۆنبێ ؟

پاشەڕۆژیان ئەبێ چۆن بێ ؟ مرۆڤ لەوانەیە پرسیار بکا لەوکارەساتەی توشی دانیشتوانی سەر زەوی ئەبێ ، بومەلەرزەی وا کەتەڕو ووشك لەناو ئەبا لافاوی واکە سامانی دانیشتوان ئەباو خۆشیان پەرت و بلآو ئەکا ، هەڵکردنی باو گێژەڵوکەی کوێری وا ئەوەی مرۆڤ لەماوەی تەمەنیا دروستی کردووە ئەی ڕوخێنێ لەماوەی کات ژمێرێکدا، جنگ و ئاژاوەی واکاربەدەستانی ستەم کار و چاوچنۆك و ترسنۆك هەڵی ئەگیرسێنن ئەبێتە هۆی نەمانی مرۆڤ و سامانیان بەزۆری ، بەدەیان وسەدان ، بگرە بەملیۆنان هەتیو بێوەژن و شەل وکوێرو کەڕو کۆیلەو هەژار پەیدا ئەکا .جەنگی یەکەم و دووەم و جەنگی عێراق و ئێران و هەرێمەکانی تر تەقینەوەی سەدان کارخانەی کیمیاوی ، گازی ژەهراوی بەهەزاران کوژراوی پەیدا کرد . بەتایبەتی تەقینەوەی کارخانەی گازی شاری ﴿ پوپاڵ ﴾ لەهیندوستان کەبووە هۆی کوشتنی پتر لە (٢٥٠٠) دوو هەزارو پێنج سەد کەس و نەخۆشی پتر لەپەنجا هەزار کەس جگە لەئاژاڵ لەبەرواری : ١٩٨٤/١٢/٤

ئەگەر پرسیار بکرێ هۆی توش بوونی ئادەمیزاد بەو کارەساتانە ئەبێ چ شتێ بێ ؟

قورئانی پیرۆز لەچەندین ئایەتدا وەڵامی داوەتەوە بەتایبەتی لەچیرۆکەکانی موسادا ڕونی کردۆتەوە کەهۆکانیان بێ باوەڕی وستەم و گوناه کردنە . ستەم و بێ باوەڕی بەوجۆرەی خوا ئەیفەرموێ بڕوانە بوون بەخواو هاوکاری کردن بۆ دانانی بێ باوەڕی ڕوو وەرگێڕان لەیا سای خوایی ، دەست درێژی بۆسەر فەرمانەکانی خوای گەورە هاتووە لەقورئانی پیرۆزدا ﴿ فَاَما الّذینَ کَفَروا فأعَذّبهم عَذاباً شَدیداً فی الدنیا وَ الاخِرة ﴾ دوایی ئەوکەسانەی ئەوتۆ بڕوایان نەهێناوە دوایی من سزایان ئەدەم بەسزایەکی سەخت لەجیهانداو لەڕۆژی دوایی‌دا ، بڕوا بەخوا بەدەم نابێ بەڵکو بەڕاستی و بەناوەڕۆکە. ﴿وَتِلكَ القُری اهلَکناهم لَمّا ظَلَموا وَ جعَلنا لِمَهلِکهم مَوعدا ﴾ ئێمە ئەو دێیەمان لەناو بردن کاتێ ستەمیان کرد ئێمە دیاری‌مان کرد بۆ لەناوبردنیان ماوەیەکی دیاری کراو .. ﴿فکُلاً اخَذنا بِذَنبِة فَمنهم مَن ارسَلنا عَلَیهم حاصباً وَمنهم مَن أخَذَتـه الصّیحَةُ وَمِنهم مَن خَسَفنا بِهِمُ الارضَ وَ مِنهم مَن اغرَقنا ﴾ دوایی هەمویانمان گرت و سزاماندان بەهۆی گوناهی خۆیانەوە ، دووایی هەندێ لەو کەسانە کەسێ ئێمە ڕەوانەمان کرد بۆ سەریان بایەکی زۆر سەختی وا بەردی هەڵئەگرت ئەیدا لەوان ، هەندێ لەوان کەسێ هەورە گرمەو دەنگێکی گران گرتی هەندێکیان کەسێ ئێمە بردومانە خوارەوە بەوانەوە زەوی ، هەندێکیان کەسێ ئێمە خنکاندمان ، لەناو چون فیرعەون و ستەم کارانی تر بەهۆی ستەمەوە ، زۆر جاران لەقورئاندا باسیان کراوە ، پاشەڕۆژی هەمو ستەم کارێ بەوێنەی ئەوکەسانە ئەبێ ، دێر بێ یازوو . لەنێو ڕۆشنایی مانای ﴿ ثُمّ قَسَت قُلُبُکم الی آخره ﴾ چەند پرسیارێ ئاراستە ئەکرێ لەگەڵ وەڵامەکانیان :

یەکەم پرسیار : ئایا لەمرۆڤدا هێزێ هەیە مرۆڤ بخاتە کارەوە و دەست بخاتە ئیشی و فەرمانیەوە ، یا ئەو هێزە هەرتەنها ڕوداوەکانی دەرەوەیە ، یالەناویشەوە پاڵ پێوەنەرێکی تر هەیە ؟ بەڕاستی ڕوداوی دەرەوە پاڵ پێوەنەرو سەرچاوەی ناوەیشە کەواتە هێزی ناوەی

مرۆڤ بێ توانایە ، هەر ڕوداوی دەرەوەیە بنچینەی ڕاستەقینە ، یاهەریەکەیان سەربەخۆن ، جارێك ئەمیان مرۆڤ ئەخاتە گەڕ جارێ تر ئەویان ، جارێ تر هەردوانیان ؟

وەلاّمی ئەو پرسیارانە : بەڕاستی مرۆڤ کەبوو بەو مرۆڤە خاوەنی هێزی وگیانێکە ئەگەر ئەوانەی لێ دارنێ وەیاڕوداوی دەرەوەی لێ بشارێتەوە جگە لەشتێکی ڕووت و تەق بەهیچ شتێ تر ناژمێرێ ، یا پەڕێك نەبێ بائەییا بەئاسماندا . کەواتە هێزی ناوەوەی مرۆڤ لەگەڵ ڕوداوەکانی دەرەوەدا ئەکەونە ئیش کردن هەریەکەیان بەوی تریانەوە پاڵ ئەنێ ، بەلاّم کارکردنیان بەجوتە شتێکە ، سەر بەخۆیشیان بۆ ئەو کارەیش شتێکی ترە کەواتە وویست و ئاوات لەگەڵ مرۆڤادروست کراوە بۆیە منالّی بێهۆش و بێ گۆش ڕوداوی دەرەوە نازانێ و داوای زۆر شت ئەکا ، کەواتە ئەو ئاواتەی دەرەوە ووردە ووردە پێ ئەگەن پەرەیان پێ ئەدرێ بەهۆی ڕوداوی دەرەوە بەباش دەرکەوتنیانە ، بەپەیدابونی ئاواتی مرۆڤ ، مرۆڤ ئەتوانێ کار بکاتە سەر ڕوداوی دەرەوە و یەرەو پێشیان ببا بەگوێرەی پێویستی وئارەزوی خۆی با ئەوە بزانین ئارەزوەکانی مرۆڤ سەربە خۆن لەبونیان دا جم وجۆلّی مرۆڤیش لەناوەو لەدەرەوەیش هەلّئەقولّێ ، یانێ لەهەردوو لاوە پەیدا ئەبێ ، ئەو کارە گلاّوانە مرۆڤ ئەیکات بۆیە پێویستە لەڕوداوی گلاّوی دەرەوە مرۆڤ خۆی بپارێزێ ، بەهۆی هێزی ناوەوە .

پرسیاری دووەم : کەبڕیارماندا لەنێو مرۆڤدا هێزێ هەیە ئەی خاتە جم وجۆل بەسەر بەخۆی ، ئایا هەموو مرۆڤ بەشدارن لەو هێزە گیانیەدا بەبێ جیاوازی لەنێوانیاندا .
باهەریەکەیان ئاواتێکی تایبەتی و هێزێکی بێ هاوبەشیان هەیە ؟

وەلاّمی ئەو پرسیارە : مرۆڤ لەهەندێ شتا هاوبەشن ، وەك وویژدان و هۆشی ڕاست و چەوت ، ناشرینی و جوانی لەیەك جوێ ئەکەنەوە .

ئەگەر ئەو کارە هاوبەشەیان نەبن نرخ وبێ نرخ بۆ هیچ شتێ دانانرێ ناتوانین لۆمەی هیچ کەسێ بکەین لەسەر کردنی هیچ کارێ ، ناتوانین چاك و خراپ بەهیچ کەسێ

یسەلمێنین هەروەك باوك و كوڕ لەمیهرەبانی‌دا بۆ یەكتری هاوبەشن ، باهەندێ باوك و كوڕ لەهەندێ تریان زۆرتر میهرەبان بن ، بەلاّم مرۆڤ لەهەندێ شتی تردا لەیەك جیاوازن وەك ئازایی و ترسنۆكی سەخاوەت و ڕژدی دڵ نەرمی‌و دڵ ڕەقی وپستی بەهێز و بێ هێز ، ئاوڕدانەوە بۆلای چاكەو خراپە ئادەمیزاد لەوانە وەك یەك نین یانی مرۆڤ یان ئازایە یان ترسنۆك یاسەخی یە یارژد، چاكە خوایە یان ستەم كار .

پرسیاری سێهەم : ئەو شتانەی پێشو كەباسیان كرا دژی ڕواڵەتی دەركەوتووە ئەبینرێ مرۆڤێ كاری چاك وكاری خراپ ئەكا تۆ بۆئەبێ هەر بەجیز بی لەسەر یەكێكیان وەچاوی خۆت لەئاستی ئەوی تریان ئەنوقێنی ؟

وەلاّمی ئەم پرسیارە بەم جۆرەیە : ئەو چاكەیە لەستەم كارێ ئەبینرێ بەرێكەوتە لەپێشەوە بیری بۆ نەكردوەتەوە یابیریشی بۆ كردبێتەو؟ بۆ ئاواتی گلاّوی خۆیەتی بۆ هەڵخەڵەتاندنی دانیشتوانە ، پڕوپاگەندەیە لەناوەرۆكدا .

لێرەدا باسێكی ترمان هەیە ، بۆ ئەو باسە كەسمان لەگەڵ نی‌یە مەگەر كەسانێ وەك ئێمە بڕوایان بەخوا هەبێ و چاوی لەدوارۆژ بێ ، ئەوباسە ئاینی ئیسلام پێ‌ی ئەڵێ (توفیق) یانی ڕەخساندنی هەموو هۆیەك بۆ كردنی چاكە ئەو تەوفیقە نەبەهێزی ناوخۆی مرۆڤە نەبە ڕوداوی دەرەوە نارەخسێ بەڵكو بەهێزێكی نهێنی وتوانایەكی چاكەی خوایی بێ پایانی نهێنی‌یە ، ئەو هێزە بۆ هەندێ كەس ڕێگەی چاكەیان بۆ سازو پاك ئەكات و ڕویان وەرئەگێڕێ بۆلای ئەو كارانە خوا پێی خۆش بێ بێ ئەوەی خۆیان هەستی پێ بكەن .كۆتایی بەو پرسیار و وەلاّمانە هات.

هەموو خاوەن نامەو پرۆگرامێ ئەوپەڕی خەباتی خۆیان ئەخەنە كار بۆ ئەوەی ئادەمیزاد بڕوایان پێ بكەن بۆیە بانگەواز ئەكەن و بیرو باوەڕەكەیان بەناویانا بلاّو ئەكەنەوە هەتاوەكو دواكوتوو یاریدەدەرو لایەن گریان زۆربێ ، هەموو سزاو ناخۆشی بۆ ئەو مەبەستە ئەچێژن یەكێ لەوكەسانە بەو كارە هەڵسابێ بەبلاّوكردنەوەی ڕاسترین یاسا بۆ هەڵسوڕانی كارو

باری مرۆڤایەتی فروستادەی خوای مەزن وهاوەڵەبەرێزەکانی بووە ، بەبلاو کردنەوەی یاساو دەستوری ئیسلام و جارِ دان بۆیان لەوکات و جێگەیەدا یاریدەرانی پێغەمبەروو جولەکەکان پەیوەندی دار بوون بەیەکەوە لەدراوسێیەتیو هاوشێرەیی و بازرگانی وشتی تردا ، بۆیە جولەکەکانیان بانگ کرد بۆلای ئاینی ئیسلام بەفەرمانی پێغەمبەری مەزن ﴿ﷺ﴾ یاریدەران لەگەڵ جولەکەکاندا بەبەڵگەی ڕون و واتەی سەلمێنراو بەتەمای ئەوە بوون ئەو جولەکانە پیاوەتیان بجوڵێ بەتایەبتی ئەوانەیان خوێنەواروو ڕۆشن بیروو خاوەن نامەن بەتایبەتی ، باسو شێوازی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ لەتەوراتیلانا هەبوو ، لەوەلامدانەوەی بانگەوازی ئیسلام لەسەر بێ باوەڕی خۆیان بەجیز بوون و ڕاستییان نەسەلماند ، بۆیە خوای گەورە ڕوو ئەکاتە پێغەمبەر و هاوەڵانی ئەفەرموێ :

أَفَتَطْمَعُونَ أَن يُؤْمِنُوا لَكُمْ وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَسْمَعُونَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُ مِن بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٧٥﴾

﴿ افَتَطْمَعُون ان يؤمنوا لَكم ﴾ ئایا دوایی ئێوە بەتەمای ئەوەن کەجولەکەکان باوەڕ بهێنن لەبر ئێوە وەلامتان بدەنەوە ، ئەو جولەکانە کەمێکیان نەبێ بێ نرخن وتەمێ خوار نابن و مل بۆ ڕاستی دانانەوێنن ، تەماو هیوا بۆ باوەڕ هێنانیان نیە ، باوەڕ هێنان هەرچەندە بۆ خوابێ ، بەلام بۆ ئەوەی بزانرێ بەبەڵگەوە موسوڵمانان جولەکەکانیان بانگ کرد بۆ باوەڕ هێنان ...ئەو ڕوکردنەی خوای گەورە بۆ پێغەمبەر بێ بەتەنها یابۆ پێغەمبەروو هاوەڵەکانی بێ ، داوا لێ کراوان جولەکەکانی سەردەمی پیچغەمبەر بن ، یامالومەکان ، یان ئەوانەی سەردەمی موسابن هیچ شتێ لەبانگەوازو مەبەستەکە ناگۆڕێ . فەرماندان

بەپێغەمبەروو هەموو موسولمانان داوالێکراوانیش ، جولەکەی هەر سەردەمیٚ بن نەوەکانیان پاشماوەی پێشووەکانیانن لەگۆڕینی تەوراتدا .

﴿ وَقَد كانَ فَريقٌ مِنهم يَسمَعونَ كَلامَ اللهِ ﴾ وەبەڕاستی تاقمیٚ لەپێشەواکانی جولەکەکانی سەردەمی موسا ، یاسەردەمی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرمودەی خوایان بیست و خوێندنیانەوە وەك تەورات بیٚ بەئەوپەڕی بەلگەو کاری بەکەس نەکراو جگە لەوانیش .

﴿ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُ مِن بَعدِ ما عَقَلُوه ﴾ لەپاشا فەرمودەکەی خوایان گۆڕی لەدوای ئەوەی تێگەیشتن وفێر بوون گۆڕیان بەجۆریٚ خۆیان بیان وویستایە وەك باسی پیچغەمبەریان گۆڕی .

﴿ وَهم يَعلَمون ﴾ ئەوان ئەیان زانی بەو گۆڕانە سزا و گوناهیان توش ئەبیٚ درۆو بوختان ئەکەن کەواتە لەجێگەیە ئەوانەی سەردەمی موسا فەرمودەی خوا یان گۆڕی بیٚ ئەمانەی سەردەمی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ چۆنی ناکۆڕن .

ئەو ئایەتە هەرچەندە دەربارەی هەرەشەی گۆڕینی فەرمودەی خوایە لەلایەن جولەکەکانەوە هاتۆتە خوارەوە بەلاّم هەموو کەسیٚ ئەگرێتەوە لەهەموو کات و جێگەیە ، ئەوانیش ئەگرێتەوە بەگۆڕینی یاسای ئیسلام لەوە لاّمدانەوەی پرسیاری ئاینی دا ، ئەوانەی ببنە هوی بلاّو بونەوەی گومڕایی ، خراپەکەی هەر بۆ خویان نابیٚ بەلکو سەر ئەکێشیٚ بۆ نەوەکانی دوا ڕۆژمان ئەبنە هۆی هەلگری گوناهی ئەو کەسانەی دوا ڕۆژ ، نەوە لەدوای نەوە .

وَإِذَا لَقُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَا بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ قَالُوٓا۟ أَتُحَدِّثُونَهُم بِمَا فَتَحَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ لِيُحَآجُّوكُم بِهِۦ عِندَ رَبِّكُمْ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٧٦﴾ أَوَلَا يَعْلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٧٧﴾

هەندێ لەجولەکەکان دوورِویی و درۆیان ئەکرد لەگەڵ موسولمانان بۆیە خوا ئەفەرموێ ﴿ وَاذا لَقُوا الّذينَ امَنوا ﴾ وەهەر کاتیچ جولەکەکان بگەینایە بە و کەسانەی بڕوایان بەخوا و بەپێغەمبەر هێناوبو ، ئەو ئایەتە هاتۆتە خوارەوە دەربارەی ئەو جولەکانە دوورِوی‌و درۆیان ئەکرد بۆ ڕون کردنەوەی دوو ڕویی و درۆکانیان .

﴿قالو آمنا﴾ ئەیان ووت ئێمە بڕوامان بەو شتانە هێناوە ئێوە باوەڕتان پێهێناون،وە شایەتی ئەدەین موحەممەد ڕاست دەکات لە فەرموودەکانیا ئێمە شێوازو ڕەنگی ئەومان دیوە لە تەوراتدا کەئەو کەسەیە موژدەی پێدراوە ، ئێوەیش هەمووتان ڕاست ئەکەن .

﴿وإذا خَلا بَعضُهم إلى بَعضٍ﴾ وە هەرکاتێ بەنهێنی هەندێ لەو جوولەکە دووڕوانە بڕۆشتنایەوە بۆلای هەندێ تریان جگە لە خۆیان کەسی تریان لانەبوایە جولەکەکان ئەکەوتنە گفتوگۆ کردن لەگەڵ موسولمانانا ، هەندێکیان بێدەنگ ئەبوون هەندێکی تریان ئەیان ووت ئێمە وەك ئێوە باوەڕمان هێناوە دوای ئەو دوو کۆمەڵەی جوولەکەکان ئەکەوتنە گلەیی‌و بناشت لەنێو یەکتریدا بەم جۆرەیان ئەوت :

﴿قالوا أتُحَدِثونَهُم بما فتح الله عليكم﴾ ئەوانەی بێدەنگ بوون ئەیانووت بەوکەسانەی تریان بەسەر زەنشتەوە ئایا بۆ ئێوە گفتو گۆ ئەکەن لەگەڵ مووسولمانانا و بۆیان

ئەگێڕنەوە شتێ خوا بۆئێوەی ڕوون کردۆتەوە و فەرمانی پێدراوە بەسەرتانا لە تەوراتدا لـــە ڕەنگ و شێوازو ناوی موحەمەد ،جارێ تر کاری بەو جـۆرە مەکـەن ، بۆیـان ئەگێڕنـەوە ئەوسـزادانەی خـوا دای بەسـەرتانا کـەخوا ئێـوەی کـردوە بـە مـەیمون و بەبـەراز ،هـەتا مووسولمانان بلێن :ئێمە لە ئێوە بەرێزترین وە ئەو سزایانە بکەن بەبەلگە لەسەرمان .

﴿لیحاجوکم به عند ربکم﴾ هەتا موسولمانان بیکەن بەبەلگە بۆ خۆیان و بۆرتان بـدەن بەو شتەی ئێوە پێتان وتون لەخزمەت پەروەردەکەری خۆتان ،ئێوەی پێ بکەن بـە پـەندو نەتوانن وەلامیان بدەنەوە ،دوژمنایەتیان بکەن بەو شتانە ئێوە دەیلێن لەلای خواو لە پاشـە ڕۆژدا پێتان بلێن (باوەڕتان نەئەهێنا وە کەچی ئەتانزانی ئاینی ئیسلام راستە .

﴿ أفـلا تعقلـون ﴾ ئایـا ئێـوە دوای بـۆ ورد نەبوونـەوە لـــەو هەلەیـەی کردتـان و سەرئەکێشێ بۆ بلاوبوونەوەی نهێنیـەکان ،ئـەبێ بەبەلگـە بەسـەرتانەوە چونکـە گالتـەتان بەئاینی ئیسلام و پەیڕەویتان نەئەکرد .

﴿ أولا يَعلَمُونَ أنَّ اللهَ يَعْلَمُ مايُسِرُّونَ وما يُعْلِنُونَ﴾ ئایا ئەو جولەکانـە نـازانن بەڕاسـتی خوا ئەزانێ بەشتێ ئەوان بیشارنەوە بەشێ ئەوان ئاشـکرای بکـەن لـە کـردارو گوفتـار و گومڕاییان ،ئەزانێ بەوەی مالومەکان فێرتـان ئەکـەن خـوای گـەورە هیـچ شـتێکی لێ ون نابێت فێلێ و فڕەکانیان بەهەرجۆرێ بشـارنەوە خـوای گـەورە پێغەمبـەری خـۆی ئاگـادار ئەکات فێلی ئەوانیش ئەبێت بەتۆزو با ئەبیات جوولەکـەکان دوو تـاقم بـوون تاقمێکیـان نەخوێنەوارو نەزان هیچ شتێکیان لەو نامەیە بۆیان هـاتبوو نـەیان ئـەزانی ،جگـە لـەهیواو ئاواتی پڕوپووچ ئاگاداری هیچ نەبوون وایان بیستبوو لەمالوومەکانیانـەوە جولەکـە نـەبێ کەسی تر ناچێتە بەهەشت،گەلی هـەلبژاردەی خـوان چـەند ڕۆژێکـی کـەم نـەبێت ناچنـە دۆزەخ،هەرگوناهێك بکەن خوا لێیان خۆش ئەبێ.

تاقمێ تریان زۆرزان و خۆپەرست و دەست بڕبوون ،نەخوێنەواری و نەزانی ئەوتاقمەی یەکەمیان بەهەل ئەزانی ،درۆیان بەناوی تەوراتەوە بۆ ئـەکردن ،دەسـت نووسـی خۆیانیـان

بەناوی تەوراتەوە بلاو ئەکردەوە ،فەرموودەی خوایان ئەگۆری ئەوەی بیان ویستایە ئـەیان کرد ، ئەوەی نەیان ویستایە پەنهانیان ئەدا، ئەو شـتانەیان ئـەکرد هـەموویان بـۆ سـوودی خۆیان ،وەك خوا ئەفەرموێ :

وَمِنْهُمْ أُمِّيُّونَ لَا يَعْلَمُونَ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّآ أَمَانِىَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٧٨﴾ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ يَكْتُبُونَ ٱلْكِتَٰبَ بِأَيْدِيهِمْ ثُمَّ يَقُولُونَ هَٰذَا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ لِيَشْتَرُوا۟ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا فَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتْ أَيْدِيهِمْ وَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا يَكْسِبُونَ



﴿ ومنـهم امیـون لا یعلمـون الکتـاب ﴾ وە هـەندێك هـەبوون لـــە جوولەکــەکان نەخوێندەواربوون و تەوراتیان نەئەزانی و نەیان خوێندبوەوە ،هەتا پێغەمبــەر (ﷺ) بناسـن و باوەڕی پێ بهێنن،ئەوشتەی نەیان بیستایە لـەمالومەکانەوە نەیان ئەزانی .

﴿إلا أماني ﴾ مەگەر ئەوەی ئەوان ئەیانزانی ئەودرۆیانە بو بەبێ بەلگەوە وەریان گرتبـو لە مالومە فێڵ بازەکانیانەوە کەتەوراتیان گۆڕیبوو ئەو درۆیانە وەك ئەمانە : بڕوایان وابــوو هەر جوولـەکە ئەچێتە بەهەشت ،چەند رۆژێکی کەم نەبێ ناچنە نێـو ئـاگری دۆزەخ ،هـەر گوناهێك بکــەن خـوا سـزایان نـادات ،بـاوك و باپـیرە پێغەمبـەراکانیان لای خـوا بۆیـان ئەپارێنەوە جگە لـەتەورات نابێ بڕوایان بە هیچ نامەیە تر هەبێ ،ڕانومایی لــە پـەیڕەوکردنی ئەواندایەو بەس ،ئـەوان کـوڕی خـوان و خۆشەویسـتی خـوان ، عوزەیـر کـوڕی خوایـە

،هەرشتێ بکەن بەهەرکەسێ جگە لە جوولەکە ڕەوایەو درووستە لایان ،چەندین شتی تری ناڕوا.

﴿وإن هم إلاّ یظنون﴾ وە بۆ ئەو جوولەکانە لە درۆو دەلەسەیاندا بۆیان نیە مەگەر گوومان ئەبەن بەو پڕو پوچانە بەبێ بەلگە ،کۆمەلێکن ئەوپەری کۆششیان گومان و چاولێکردنی مالومەکانیانە ،بەبێ ئەوەی هیچ شتێ تر بزانن و لە هیچ شتێ بگەن .

﴿فویل للذین یکتبون الکتاب بأیدیهم ﴾ دووایی ڕیسوای و خەفەت بۆ کەسانێکی ئەوتۆیە نامە ئەنووسن بەدەستی خۆیان وئەلێن :ئەوە تەوراتە بۆ ئەوەی بەرتیل وەرگرن.

﴿ ثمّ یقولون هذا من عند اللّٰه﴾ لەپاشان ئەلێن ئەوەی ئێمە نوسیومانە لەلایەن خواوە بۆمان هاتووە بۆ ئەوەی جولەکە نەزانەکانی پێراکێشن .ئەگێڕنەوە کاتێك پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ هاتە مەدینە مالومەکان و سەرۆکەکانی جولەکە لەپلە و کاری خۆیان ئەترسان ،دەستیان دایە ڕەخساندی فێڵ بۆ بەرگری کردن لە جوولەکە ژێر دەستەکانیان ، هەتا بڕوا بە پێغەمبەر نەهێنن بۆیە ڕەنگ و شێوازی پێغەمبەریان کەلە تەورات دا نوسرابوو گۆڕیان ،لەجیاتی ئەوە بلێن : محمد ﴿ﷺ﴾ جوان و دەم وچاو جوان و چاو ڕەش و میانە بالایە ،نوسیان بالادرێژو چاوشین و مو ڕاکشاوە .

﴿ لیشتروا به ثمناً قلیلاً﴾ بۆ ئەوەی وەربگرن بەو گۆڕینەی تەورات نرخێکی کەم لەنەخوێنەوارو ژێردەستەکانیان ،وەك پێکهێنانی سامان و بەردەوامی دەستەلاتیان بەسەر جوولەکەکان دا، بەرتیل وەرگرتنی سەرۆك و مالومەکانیان بەهۆی ئەوشنەی بەدەستی خۆیان نووسیان و تەوراتیان پێ گۆڕی ئەو بەرتیلانە با بەرچاوی زۆربن بەلام قەدەغەو بێ پیتن ،تۆلەو سزایان زۆرترە .

﴿ فویلٌ لهم مما کتبت أیدیهم ﴾ دوایی ڕیسوای و خەفەت بۆ ئەو مالومانەیە لەبەر شتێ نوسیویانەتەوە بەدەستی خۆیان و تەوراتیان پێ گۆڕی .

﴿وویلٌ لهم مما یکسبون﴾ وە ڕیسوای و خەفەت لە پاشەڕۆژو ئێستادا بۆ ئەو مالومانەیەچونکە سامانی زۆر بەفڕو فێلّ و بەرتیل پەیدا ئەکەن و کۆ ئەکەنەوە بەگوناە کردنیان و کرێ وەرگرتنیان لەسەر فێرکردنیان بیروباوەڕی پوچ بەجوولەکەکان .

خوای گەورە (٣)جار ووشەی (ویل)ی دووپات کردوەتەوە بۆڕوون کردنەوەی (٣)سێ تاوانیان :

یەکەم:–گۆڕینی شێوازو باسی پێغەمبەران (ص).دووەم:–بوختان و درۆ بەناوی فەرموودەی خواوە .سێهەم:–بەرتیل وەرگرتنیان بۆ گۆڕینی تەورات هەتا بزانرێ بوختان بەناوی خواو تەوراتەوە گەورەترین گوناهە ،سەختترین سزایان بۆ دانراوە .

ئەمەیشمان لەبیر بێت ئەوئایەتە هەرچەندە دەربارەی جوولەکەکان هاتۆتە خوارەوە بەلاّم ئەو هەڕەشانە هەموو زانایە دەگرێتەوە وەکە بە ڕوالّەت بەرگی زانایان دەپۆشن ،بۆ ئەوەی بۆی بلوێت دانیشتوانی بێ بڕوتێنێتەوە بەناوی ئاینەوە فڕیشی بە ئاینەوە نیە و بگرە ئەبێ بەکۆسپ لەڕێگەی ئایندا .گرنگترین شتێ پێویست بێ بزانین ئەمەیە ئەو کەسەی مانای قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ بکات نابێ پشت ببەستێ بەگۆترەکاری بۆ ماناکردنیان لەخۆیەوە بەلّکو پێوسیتە لەسەری بەگوێرەی توانا بەر لە هەموو شتێ بزانێ بنچینەو دەستوری ماناکان لەسەر چ شتێ دانراوە وە چاو دێری ئەو دەستورە بکات لە ڕوونکردنەوەی ویستی خواو پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ بۆ خۆ پەرستن لەدرۆو دەلەسە نەوەك توشی خەشمیان بێ بەبێ هۆی پێویست .کەواتە ئەوکەسەی بیەوێت مانای قورئان بکات پێویستە خوێنەوارو نووسەر بێت ،مانای یەکە یەکەی ووشەکانی قورئان بزانێت زانستی هەبێت بە سەرف و نەحو مەعان و بەیان و فیقە و بنچینەکانیان ،بەپێی پێویست زانستی ژمێرەو گەردوون ناسی و ڕووەك و پزیشکی بزانێت ، هۆی هاتنە خوارەوەی هەموو ئایەتێ بزانێ.

بەوبۆنەوە ئەمەیش بزانین :مرۆڤ پلـەی زانیاریەکـەی هەرچـەندە بـەرز بێـت پێویسـتە لەسەری یەك سەر مانای ئایەتێکی کرد نەڵێ ئەوە ویستی خوایـە و لـە (لـوح المحفـوظ)دا نوسراوە .کەواتە هەرفتوایەکی دەرکرد بەڕەوا بێت یان بـە قەدەغـەبێت بـۆ هەرشـتێ یـان فەرمانێکی لەدادگادا دەرکرد لەسەر داوایەك .یان مانای ئایەتێکی کـرد پێویسـتە وادانـێ ئەوانە هەموویان کۆشش و بیرکردنەوەیەکی ڕوتن شایانی ڕاسق و چـەوتین ،بەپێچەوانـەوە ئەگەر بەلایەوە وابێت ئەوی وتویەتی فـەرموودەی خـواو پێغەمبـەرن ،بەڵگـەی بێگومـانی بەدەستەوە نەبێ وێنەی ئەوەیش بەوێنەی ئەوەیە بوختان و درۆی داوەتە پاڵ خـوای گـەورە ،ئیتر بازانا ترین کەسبێت لەو سەر دەمەدا ، یانێ زانا ئەبێت بەڵگەی ڕاسـت و بێگومـانی هەبێ لەکاتی فتواو فەرمان دەرکردنیا ،ئەوکاتـە ئـەتوانێ بڵـێ :لەوانەیـە راسـتبن ،ئـەگینا بەکۆشش و بەرهەمی خۆی دانێ هەمووشتێ هەواڵەی زانیـاری خـوای بکـات، جگـە لـە پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ هەموو کەس جێگەی هەڵەیە.

وَقَالُوا لَن تَمَسَّنَا النَّارُ إِلَّا أَيَّامًا مَّعْدُودَةً ۚ قُلْ أَتَّخَذْتُمْ عِندَ اللَّهِ عَهْدًا فَلَن يُخْلِفَ اللَّهُ عَهْدَهُ ۖ أَمْ تَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨٠﴾ بَلَىٰ مَن كَسَبَ سَيِّئَةً وَأَحَاطَتْ بِهِ خَطِيئَتُهُ فَأُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿٨١﴾ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ ۖ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿٨٢﴾

﴿ قالوا لن تمسنا النار الا اياماً معدودة﴾ وە جولەکەکان ئەیان ووت : ئیمە هەست بە ئاگرناکەین توشی ئیمە نابیٚ‌مەگەر چەند رۆژێکی هەڵبژێراو د یاری کراو. جولەکەکان گومانیان وایە کوڕی خوان : هەڵبژێرادەو پوختەی ئادەمیزادین لای خوا ،هەموو ئادەمیزاد بێجگە لەخۆیان کوڕی شەیتانن گەلی وازلیٚ هێنراوی خوان،هەتاهەتایە لەنێو ئاگردان خوا بەرەقی لەگەڵ جولەکەدا کارناکاو ناجولێتەوە .بەڵکو سزایەکی کەمیان دەدات بۆماوەیەکی کەم و کورت ،لەدوایدا لێیان ئەبوریٚ واتە خوا وەك باوك ئەیان لاوێنێتەوە ،خوای گەورە ژمارەی ڕۆژەکانی ڕوون نەکردۆتەوە ئێمەش پێویستە بێدەنگ بین .بەلاّم کاتیٚ پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ چوتە مەدینە موسولّمانان ئەوەیان لەجولەکەکانەوە دەبیست ،ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە بۆ ئابڕوبردنیان ،بەهۆی ئەو بوختانەوە ئەیکەن بەناوی خواوە ، جوولەکەکان بەدرۆی خۆیان ئەلّێن تەمەنی جیهان ئەبیٚ حەوت هەزار ساڵ بێت حەوت رۆژ ئێمە ئەخرێینە ئاگر هەزار ساڵ بەرۆژیٚ ، یان چل ڕۆژ بەئەندازەی ڕۆژانی پەرستنی گوێرەکەکە ، ئەوانە هەموویان جێگەی باوەڕنین بەلای مرۆڤی ژیرەوە ، چوونکە تەمەنی جیعان زۆر زۆر ترە لەو ماوەیە .

﴿ قل أتخذتم عند الله عهداً﴾ محمد تۆ بلیٚ بەو جوولەکانەبۆ ئەوەی سەر شۆڕیان بکەی و هەڕەشەیان لیٚ بکەی‌ئایا ئێوە پەیمانێی تەواوتان وەرگرتووە لەخزمەت خواو بەپەیمانی ڕاست کەئێوە ناچنە نێو ئاگرمەگەر چەند ڕۆژێکی کەم نەبیٚ.

﴿فلن يخلف الله عَهْدهُ ﴾دوای خوا ناگۆڕیٚ پەیمانی خۆی بەڕاستی ئەو گومانەتان ئەوپەڕی بێشەرمیە لەچ لایەکەوە ئەو پەیمان و بەلّێنەتان وەرگرتووە.

﴿أم تقولون على الله مالا تعلمون ﴾ یا ئێوە دەیلێین ئەو شتەی ئێوە نایزانن،کەئێوە دەلّێن چەند ڕۆژێکی کەم نەبیٚ ناچینە نێو ئاگری دۆزەخ ،ئەوانە گومان و گۆترە بازین ،ئەوە وائەگەیەنێت ئێوە گالّتە بکەن بەگوناە کردن و لاتان سووك بیٚ ، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ئەفەرمویٚ بەڕاسقی مرۆڤی باوەڕدار گوناهی خۆی وا ئەبینیٚ بەردێکەو ئەترسیٚ بکەویٚ

بەسەریا بەڕاستی بێ باوەڕان گوناهی خۆیان وا ئەبینن مێشێکەو ئەڕوا بەسەر لوتیانا فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) یەکسەر ئەو جولەکانەیش ئەگرێتەوە وە ئەڵێن کوڕی خواین ئەوکەسەی بڕوای بەخۆی ببێ و هەست بەگوناهەکانی خۆی نەکات ئامۆژگاری وەرنەگرێت چاوەڕوانی ڕانوومایی نەبێت هەستی چاکەی لێ ناکرێت مرۆڤی ژێر تەماشای خۆی ناکات بەلەخۆ بای بوون بەگومانی پڕوپووچ بەڵکو هەموو کاتێ بیر لەگوناهو خراپەی خۆی دەکاتەوە سەرزەنشتی خۆی ئەکا بیر لەوە ئەکاتەوە ئەوخراپانەی لەسەر پەتی چۆن ڕزگاری ببێت لەدەستیان ،بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) ئەڵێ ئەو کەسەی بزانێ خراپەی کردووە وەك چاکەی کردبێ وایە .

﴿بلی من کسب سیئته﴾ بەڵێ ئەوەی ئێوە ئەیڵێن چەند ڕۆژ لە نێو ئاگردا ئەبین ڕاست نیە،هەرکەسێ خراپەی کردبێ ،بەبوختان دانان و هاوبەش دانان بۆ خوا و پەشیمان نەبێتەوە کردەوەی وەك کردەوەی ئێوەبێت.

﴿وأحاطت بە خطیئتە﴾ وەدەوری داوە لەهەر چوار لاوە تاوان و گوناهەکەی ،بەجۆرێ ڕێگەی ڕزگار بوونی لێ گیرابێت بە گوناه کردن ، هەروەها گوناه کۆبکاتەوە لەسەر خۆی ،دڵی هەموو کاتێ بەرەو گوناه ڕای ئەکێشێ،هەر بەگوناه دڵ خۆش بێت باوەڕ بەئاینی ئیسلام نەهێنێ .

﴿ فأولئك أصحاب النار هم فیها خالدون﴾ئەو کەسە خراپە کەرانە پەشیمان نەبنەوە ،دانیشتووی ئاگری دۆزەخن و هاو ڕێگەی ئاگرن ،ئەو کەسانە لەنێو ئاگردا بەردەوامن و دەرچونیان بۆنیە ،ئەبێ جوولەکەکان لەچ لایەکەوە بۆیان هاتووە چەند ڕۆژێ لەنێو ئاگری دۆزەخدان ، ئەو ئایەتە هەرچەندە دەربارەی جوولەکەکان هاتۆتە خوارەوە بەلام هەموو کەسێ ئەگرێتەوە کەوێنەی ئەوان بێت ،بەئاواتی پڕوپوچ ڕۆژ بباتە سەر بڕوایان بەخواو بەپێغەمبەری خوا(ﷺ)و بەناوەرۆکی هەمووقورئان نەبێ و بلێن :ئێمە نەوەی پێغەمبەرین یان پیاو چاکین .بەلام ئەوکەسانە گوناهی زۆر گەورەیان کردبێ و بمرن و

پەشیمان نەبنەوە بەلای هەندێ لەزانایانەوە هەتاهەتایەلەدۆزەخدان . وەئـەو بـیرەی ئـەوان لای ئێمە جێگەی باوەڕمان نی‌یە .

ئەوەی جێگەی باوەڕی زۆرترین لەهاوڕێکانی پێغەمبـەر و دواکـەوتوی پـاش ئـەوان و سـەرجەمی سـوێنەکان و دوازە ئیمامیـەکان خـاوەنی گونـاهی گـەورەو زۆر بەمـەرجێ بەباوەڕەوە مردبێ لەدۆزەخدا بەبەردەوامی نامێنێتەوە جێگـەی بـەزەیی ومیـهرەبانی خوایـە ئارەزۆ بفەرموێ لێی ئەبورێ ئارەزوی هەبێ ئەیخاتە نێو ئاگر سزای خۆی وەرئەگرێ ئـەی هێنێتە دەرەوە لەدۆزەخ و ئەیـخاتە بەهەشت ، ئێمە ناتوانین ئەو کەسەی خوا لێی ئـەبورێ و ئەو کەسەی سزای ئەدا ماوەی سزاکەی بۆ دیاری بکەین ، هەواڵەی زانیاری خوایە .

﴿ وَالذینَ آمَنوا ﴾ وەکەسانێکی ئەو تۆ باوەڕیان هێناوە بەخواو بەپێغەمبەر و بـەقورئانی پیرۆز بەهەموو دڵیانەوە بەنیازی پاکەوە بەزمان شایەتمانیان هێنابێ وەباوەڕیان هێنـابێ بـەو شتانە ئێوەی جولەکە بڕواتان پێ ی نەهێناوە وەك موسوڵمانان .

﴿ وَعَمِلوا الصالِحات ﴾ وەکردەوە چاکەکانیان کردبـێ وەك نوێـژو ڕۆژو زەکـات و حەج وەکۆشش بۆڕێگەی ئاین وازیان لەهـەموو گونـاهێ هێنـابێ وەك کوشـتنی نـاڕەواو دزی و ئارەق خواردن و سوو وەرگرتن و بوختان و داوێن پیسی ، هەتا دێ .

﴿ اولئك اَصحابُ الجَنَة هُم فیها خالِدون﴾ ئەو کەسانە دانیشتوی بەهەشتن وەدەرنـاچن لەناو بەهەشت و نامرن ، ئەو گومانەی جولەکەکان ئەی‌بەن کەجولەکەکان کوڕی خوان و گەلی هەڵبژێر دراوی خوان ، لەو سەرچاوەیەوە هەڵئەقوڵێ ئـاین و ڕەوشـت بەلایانـەوە کارێکی بازرگانی و جیهانی و سودی تایبەتی یە ، جگە لەوانە بەلایانەوە قوڕیات و تـۆزی بابردون ئەوەیش وەنەبێ هەر جولەکەکان وابـن بەتەنـها بـەڵکو زوربـەی ئـادەمیزاد وەك ئەوان وان بەلام جولەکەکان پتر لەهەموو کەسێ کینەو ڕقی تایبەتیان بـۆ ئـادەمیزاد هەیـە بەمەرجێ لەخۆیان نەبن ئاواتی هەرە گرنگیان ئەوەیە هەموو دانیشتوانی زەوی لـەناو ببـەن جگە لەخۆیان .

وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ لَا تَعْبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَانًا وَذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَقُولُوا۟ لِلنَّاسِ حُسْنًا وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ثُمَّ تَوَلَّيْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا مِّنكُمْ وَأَنتُم مُّعْرِضُونَ ﴿٨٣﴾

دەست پێکردنە لەژمارەی هەندێ تر لەکارە نالەبارەکانی جولەکە پێشووەکان ، هەتا بزانین نەوەکانیشیان هەروەك ئەوان وان ، بگرە خراپ ترن بێگومان مار هەرماری لێ ئەبێ لەمەو بەر باسی ئەو پەیمانە کرا لەئایەتی (٦٣) شەست و سێدا .

﴿ وَإذ اَخَذنا میثاقَ بَنیِ اِسرائیلَ﴾ موحەممەدو باوەڕ داران بیری ئەوکاتە بکەنەوە ئێمە وەرمان گرت پەیمانی کوڕانی ئیسرائیل ، هەندێ لەزانایان ئەڵێن خوای گەورە بەو ئایەتە ڕو ئەکاتە جولەکەکانی کاتی پێغەمبەر و ئەفەرموێ . ئێوە بیری ئەو پەیمانە بکەنەوە ئێمە وەرمان گرت لە باوك وباپیرەکانتان لەژێر کێوی توردا بەسەر تانەوە ڕامان وەستانبوو ، هەرچۆنێ بێ مەبەستە ناگۆڕێ ،

﴿ لاتَعبُدُونَ الاّ اللهَ ﴾ ئیجوە مەپەرستن هیچ شتێ مەگەر خوا ، پەرستن هەر بۆ خوا بکەن بەتەنها هەر خوایە شایانی پەرستن بێ .

﴿وَبالوالدَینِ احساناً ﴾ وەچاکە لەگەڵ باوك و دایکتان بکەن لەهەڵسان و دانیشتن و ژیان بردنە سەر لەگەڵیاندا ، وەڕێزیان لێ بگرن و ملیان بۆ کەچ بکەن خراپە کردن لەگەڵیانا لەگوناهە گەورەکانە .

﴿ وَذِی القُربی ﴾ وەچاکە بکەن لەگەڵ خزمانی نزیك تان ئامۆشۆیان بکەن ، بەچاکی ڕەفتار بکەن لەگەڵیانا .

﴿ وَالیَتامی﴾ وەچاکە لەگەڵ هەتیوانی بێ دایك وباوك بکەن نزیکی خۆیان و دارایی‌یان مەکەون بەچاکە نەبێ ئیتر ئەو هەتیوانە نێر بن یامێ ، میهرەبان و خۆش کردەوەو خۆش وویژ بن لەگەڵیانا ، ئەوپەڕی چاکەیان لەگەڵ بکەن .

﴿ وَالمَساکِینِ ﴾ وەچاکە لەگەڵ هەژاران بکەن یانێ ئەو کەسانەی بێ نەواو پەك کەوتەن ، مافی ڕەوای خۆیانیان بدەنێ وەدەست گیرۆیی یان بکەن ، پلەی هەژاران دوای پلەی هەتیوانە لەدەست گرتنیان ، هەژار لەوانە یە جوجۆڵێ بۆخۆی بکا ، بەلام هەتیو هیچ شتێکی بۆ ناکرێ .

﴿ وَقُلُوا لِلناسِ حُسنا ﴾ وەئێوە گفتو گۆ بکەن و بڵێن بە ئادەمیزاد چاکە کردن و گفتو گۆی شیرین و نەرم ، بەفیز و ڕق وڕوی گرژەوە وەمەدوێن لەگەڵ هەموو کەسێ ، ئەو ڕستە بەرزە ئەوەمان ڕا غوبی ئەکا هەرکاتێ لەهەر مرۆڤێکەوە کارێ یاگوفتارێ لەوانەوە ڕوی دا ، پێویستە لەسەرمان گومانی خراپەیان بۆ نەبەین ، بەپاکیان دانێین بۆ وێنە پیاوێکمان لەگەڵ ژنێ چاو پێکەوت نەمان زانی ژنێتی یان بێگانەیە یاگوێمان لەگوفتاری مرۆڤێ بوو نەمان زانی چاکە ئەڵێ یان خراپە ئێمە ئەبێ وادانێین ئەوانە لەخراپەوە دورن ... ناوەڕۆکی ئەو ڕستەیە بەسەرچاوەیەکی مرۆڤایەتی ڕۆون دائەنرێ کەڕێزی مرۆڤی تێدا بپارێزرێ کەو اتە ئاینی ئیسلام تەنها پەرستن باوەڕی ڕووت نی‌یە بەڵکو ئەوپەڕی گرنگی ئەدا بەسەرچاوەی مرۆڤایەتی نەخشەیەکی بەرهەمدارمان بۆ ئەو مەبەستە بۆ ئەکێشێ ... بەداخەوە ئەو کەسانەی ئاینیان بە شەیتان فرۆشتوە ئەو بیرو باوەڕە ئەکەن بەدەست کەلای دەستیان و لەو مەبەستە خاوێنە لا ئەدەن بەزۆرترین ناوی دەست کردوو تەڵەکەو فڕو فێڵ لەخەڵکی ئەکەن هەر یەکەیان بەناوێکەوە پولو پارەی پێ وەرئەگرن ، کۆشك و تەلاری

پێ دروست ئەکەن وەك پاپاکان بەهەشتیان پێ ئەفرۆشن چاکەکردن لەگەڵ ئادەمیزاد لەکوێ ؟

فێڵ وتالآن و دزی ودەست برین بەشێوازو بەرگی ئاینەوە قومارو سودو قازانجی زۆری نارەوا ، ترساندنی هاونیشتمانانو ئازار دانی دراوسێو واز هێنان لەخزم داوێن پیسی وئاژاوە رەخسان و لا قرتی کردن بەمافی مرۆڤایەتی ، لە خۆبایی بوون وفیزی ووشك و دڵی رەق و مشت نوقان لەئاستی هەژاران لەکوێ ؟ ئەو رستە پیرۆزە ئەوکەسانە بەدرۆ ئەخاتەوە داوای مافی مرۆڤ ئەکەن .

﴿ وَاَقِیموا الصّلاة ﴾ وەئێوە راوەستێنن نوێژەکانتان بەو جۆرەی یاسا دیاری کردووە موسا فەرمانی پێدابون بەکورنوشی تەواوەوە بەترس و لەرزەو بەدڵی هوشیارەوە نوێژ بۆ خوا بکەن .

﴿ وَاتوا الزّکاة ﴾ وەئێوە زەکات بدەن بەهەژاران بەو جۆرەی لەتەوراتدا فەرمان تان پێ دراوە ، زانایان ئەڵێن : دارایییەکانیان دا ئەنا ئەگەر ئاگر بهاتایەو بیدایە بەسەریانا مانای وابوو ئەو زەکاتە خوا وەری گرتووە ئەگەر نەهاتایە مانای خواوەری نەگرتن بو بەپێچەوانەی دەستوری ئیسلام مانای وەرگرتنی زەکات مانای وایە بدرێ بەهەژاران .

﴿ ثُمَّ تَوَلَّیتم الاّ قَلیلاً مِنکُم ﴾ لەدوایدا ئێوە پشتان کردە ئەو پەیمانە بەو جۆرەی فەرمانتان پێ درابوو نەتان کرد ، وازتان لێ هێنا مەگەر کەمێکتان نەبێ لەپێشەوەکانی کاتی موساو کەمێ ترتان لەسەردەمی پێغەمبەردا وەك عەبدوڵای کوری سەلام کەبەو پەیمانە هەڵسان .

﴿ وَاَنتم مُعرضُون ﴾ وئێوە تاقمێکن واز ئەهێنن لەهەموو پەیمانێ ، نەخواتان پەرستووە نەچاکەتان کرد لەگەڵ باوك ودایك و خزمان و هەتیوان هەژاران و نوێژ تان نەکردوو زەکاتەکانتان نەدا بەهەژاران ، لەجێگەی ئەو کەسانەی سەردەمی موسادا وابن ئەمانەی ئێستا نەوەی ئەوان چاوەرێی چاکەیان لێ ناکرێ باوەر ناهێنن و بیر لەپەیمان ناکەنەوە .

باسی جولەکەکان و گیرو گرفتیان کۆتایی نەهاتووە ئەوەی لەمەو دوا باسی لێوە ئەکرێ لەقورئانی پیرۆزدا زۆرترە لەوەی لەمەوبەر باسی کراوە ، ئەوەی بەکورتی وبەپوختەیی لەئایەتە بەرزەکانی قورئانەوە بۆمان دەرکەوێ چوستی خۆیان دوپات ئەکردەوە بۆ بلاو کردنەوەی ئاشوب و گێرە شێوێنی ، هەرکاتێ داوایان لێ بکرایە بۆ ڕانوومایی بون و ڕێك و پێکی ، ئەوان پتر درێژەیان ئەدا بە یاخی بوون و خراپە کردن ، وەکو سروشتیان دروست کرابێ لەگوناە ، تەورات فەرمانی پێ ئەدان بە خوا پەرستن ئەوان گوێرەکەیان ئەپەرست ، موسا ئەیفەرموو ئەو تەوراتە لای خواوە هاتووە ئەوان ئەیان ووت خوامان پیشان دە ، موسا ئەیفەرموو بیر لەچاکەکانی خوا بکەنەوە و داوای لێ بوردنی لێ بکەن ئەوان گاڵتەو لاقرتیان پێ ئەکرد .

ئەو شتانە کردەوە یانبێ لەگەڵ موسای پێغەمبەریان ، کوڕانی ئیسرائیل ئەبێ لەگەڵ جگەی موسا چۆن بن ؟

فیرعەون وبەختەنەسر و ڕۆمانیەکان زۆریان لێ کوشاتن ، پاشا (ئەدوارد) ی ئینگلیزی دەری کردن لەبەریتانیا ، هیتلەر زۆری لێ کوشتن بەر لەوانیش قەیسەری ڕوسیا نزیکەی (١٠) دە هەزار کە سی کوشتن ، لەجیاتی ئەوەی ئەوانەیان لەبیر نەچێ و تۆڵەی خۆیان بکەنەوە بەیاریدەی ئەو دوژمنانەی خۆیان پەلاماری مسوڵمانانی فەلەستینیان دا بەبێ تاوان ، بە(١٠) یان قەسابخانەیان بۆ دانان .

لەجێگەی خۆیانیان دەرکردن تەفرو تونایان کردن بۆ دەرەوەی نیشتمانیان وەك ئەو موسوڵمانانە بەختەنەسر بن تۆڵەی خۆیانی لێ بکەنەوە یاهیتلەرو ئەدواردین بەوەیشەوەنەوەستاون دووبارە پەلاماری لوبنایان دایەوە قەسابخانەی تریان لە (لەسەبرەو لەشەتیلەدانایەوە بۆ دەرکراوەکانی فەلەستین بەهەزاران بێ تاوانیان کوشت ).

بەهەرچۆنێ ئەو پەیمانە خوا لێ ی وەرگرتن پێویستە یەکتری نەکوژن و خۆیان لەهەرێمی خۆیان دەرنەکەن هەموو پەیمانەکان لەتەوراتدا نوسراون بۆیە ناتوانن بلێن :

وانـی یـە کـەچی جولـەکـەکان بەپێچەوانـەی فـەرمانی تـەورات دەسـتیان دایـە کوشـتن ودەرکردنی یەکتری ، خوا ئەفەرمویٚ :

وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ لَا تَسْفِكُونَ دِمَآءَكُمْ وَلَا تُخْرِجُونَ أَنفُسَكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ ثُمَّ أَقْرَرْتُمْ وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ ﴿٨٤﴾ ثُمَّ أَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ تَقْتُلُونَ أَنفُسَكُمْ وَتُخْرِجُونَ فَرِيقًا مِّنكُم مِّن دِيَٰرِهِمْ تَظَٰهَرُونَ عَلَيْهِم بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَإِن يَأْتُوكُمْ أُسَٰرَىٰ تُفَٰدُوهُمْ وَهُوَ مُحَرَّمٌ عَلَيْكُمْ إِخْرَاجُهُمْ ۚ أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ ٱلْكِتَٰبِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ ۚ فَمَا جَزَآءُ مَن يَفْعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمْ إِلَّا خِزْىٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰٓ أَشَدِّ ٱلْعَذَابِ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٨٥﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُا۟ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا بِٱلْءَاخِرَةِ ۖ فَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٨٦﴾

﴿ وَإِذ اخَذنا مِثاقَكُم لاتَسفِكونَ دِمائَكم ﴾ وەئێوە بیری ئەو کاتە بکەنەوە ئێمە وەرمان گرت پەیمانی ئێوە خوێنی خۆتان ئەی ڕێژن و خۆتان نەکوژن ، خـوای گـەورە بـەو ئایەتـە لـەگەڵ جولـەکەکانی سەردەمی موسایەتی کەباوك باپیری ئەمانەی ســەردەمی پێغەمبـەرن ، بەکردەوەی پێشوەکانیان قنیاتن ، یان لـەگـەڵ ئەوانـەی سـەردەمی پێغەمبـەرێتی بەفـەرمانی تەورات هەڵنەساون واتە خزمی خۆتان مەکوژن کوشتنی خزمەکانتان وەك ئەوە وایە خۆتان کوشتبێ بێگانە هان مەدەن و پشتیوانیان مەکەن بۆ کوشتنی یەکتری .

﴿ وَلاتُخرِجونَ انفُسَکم مِن دیارکم ﴾ وە ئێوە خۆتان دەرمەکەن لەنیشـتمانی خۆتـان بەوزۆرو بەنارەوا یابەتوانج وجنێودان بەیەکتری ناچاریان بکەن جێگەی خۆیان بەجێ بهێنن ئێوە لەیەك نەتەوەن وەیەك ئاینتان هەیە هەرکەسێ دەربکەن وەك خۆتــان دەرکردبـێ وایـە خۆتان ئەبنە هۆی دەرکردنتان لەجێگەی هەتاهەتایتان کە بەهەشتە لەپاشەڕۆژدا .

﴿ ثُمَّ اَقرَرتُم ﴾ لـەپاشان ئێـوە بڕیـاری ئـەوەتان دابـوو ئـەو پەیمانـەتان لێ وەرگـیراوە بەزمانی خۆتان کەیەك نەکوژن نەوە لەدوای نەوەتان .

﴿ وَانتُم تَشهَدُون ﴾ وە ئێوە شایەتی ئەدەن لـەسەر خۆتان کەئەو پەیمانە لەپێشوە کانتان وەرگیراوە پێوەش نـەوەی ئـەوانن وەك ئـەوە وایـە ئێـوە ئاگـاداری ئـەو خوێـن ڕشـتن و دەرکردنـەبن ، کەواتـە هەرچـەندە لـەگـەڵ پێشـووەکانیەتی بـەڵام ئەوانـــەی ســـەردەمی پێغەمبەریش ئەگرێتەوە .

﴿ ثُمَ انتُم هؤلاءِ ﴾ لەپاشا ئێوە ئەو کەسانەن ئەو پەیمانەتان لێ وەرگیرا وەبەڵێنتان دابوە وە ئاگاداریش بوون کەچی زۆر دارەکانتان لاوازەکانتان ئەکوژن وە دەریـان ئەکـەن وەك ئێوە ئەوانە بن ئەو پەیمانەتان دابێ ، وەك خوا ئەفەرموێ :

﴿ تَقتُلونَ انفُسَکم ﴾ ئێوە خۆتان ئەکوژن یانێ هـەندێکتان ئەوانـەی ترتـان ئـەکوژن ، وەك ئەوە وایە خۆتان بکوژن چونکە ئێوە یەك ڕەگەزنو یەك ئاینتان هەیە .

﴿وتخرجون فريقاً منكم من ديارهِم﴾ وە ئێوە دەر ئەکەن کۆمەڵێك لە خۆتان لەنیشتمانی خۆیان بەناڕەوا.

﴿ تظاهرون عليهم بالاثم والعدوان﴾ ئێوە یارمەتی بێگانەکان ئەدەن لەسەر زیان گەیاندن بەو تاقمەو لەسەر دەرکردنیان بەگوناە و بەدەست درێژی کردنە سەریان ،لەکوشتن و دەرکردنیان لەئارامگای خۆیان ،ئەو ئایەتە پیرۆزە بۆمانی ڕوون دەکاتەوە پارچە پارچەن و دوژمنی یەکترن هەریەکەیان لەدژی ئەوی تریان پاڵیان داوە بەهۆزێك لەعەرەبەکانەوە .

پوختەی ئەم ڕووداوە بەم جۆرەیە:لەمەدینەدا دووهۆزی عەرەب هەبوون {ئەوس و خەزرەج}هەردوولایان لەبنچینەدا کوڕی یەك باوك بوون واتە ئەوس و خەزرەج برابوون ،ئەو دوو هۆزە پێش ئیسلام دوژمنایەتی کەوتبووە نێوانیان ئەو دوهۆزە بت پەرست بوون بڕوایان بەپاشەڕۆژ و پرسیار و دۆزەخ نەبوو.

لەهەمان کاتا جوولەکەکانیش سێ هۆز بوون :بەنی قورەیزە و بەنی نضیر و بەنی قەینا ع ئەو سێ هۆزانەش دوژمنی یەکتری بوون لەبنچینەدا کوڕی یەك باوك و خاوەنی یەك ئاین بوون ئەو سێ هۆزەی جولەکەکان وهۆزەکانی ئەوس و خەزرەجی عەرەب دانیشتووی مەدینە بوون هۆزی بەنی قەینا ع هاوسوێندی ئەوسی عەرەب بوون .پشتیان ئەگرتن لەدژی هۆزی بەنی قورەیزەو بەنی نظیر ،هەروەك بەنی قورەیزەو بەنی نظیر پشتی هۆزی خەزرەجیان ئەگرت لەدژی بەنی قەینا ع و هۆزی ئەوس .کەواتە هەرهۆزێ لەجولەکەکان یاریدەدەرو پشتیوان و هاوسوێنی یەکێ لەهۆزەکانی عەرەب بوون لەدژی هۆزێکی تری خۆیان .هەرکاتێ جەنگ هەڵگیرسایە جولەکە برای جوولەکەی خۆی ئەکوشت و لەجێگەی خۆی دەری ئەکرد کەچی ئەوەندە گەوج بوون ئەگەر هۆزێکی عەرەب جوولەکەکانیان بەدیل بگرتایە بە پارە لەهۆزە هاوسوێنەکەی خۆیان ئەکڕیەوە بەرەلایان ئەکردن کەچی ئەو کەسانە هەر ئەوانە بوون کەلەگەڵ عەرەبەکان ئەیان

کووشـتن؟ ئـەی بـۆ بـەرەڵایان ئـەکردن ؟ئـەو دووکردەوانـە دژی یـەکترین کوشـــتن و دەرکردنیان ڕەوایە بەڵام بەدیل گرتنیان قەدەغەیە،ئەیان ووت :تـەورات فـەرمانی پێداویـن هەرکاتێ جوولەکە بەدیل کران بەرەڵایان بکەین ،بۆیە خوای گەورە بەدرۆیان ئەخاتـەوە و ئەفەرموێ:تەورات فەرمانی پێداون یەك نەکوژن و یەکتری دەرنەکەن.

بەوانەی ڕابردوون مانای فەرموودەی خوامان بۆڕوون ئەبێتەوە کەئەفەرموێ:

﴿وإن یاتوکم أساری تفادوهم﴾ وەئەگەر ئەو جوولەکەی برایانەتان بهاتنایە بۆلای ئێوە بەدیل کراوی ئێوە ئەوانتان بەرەڵا ئەکرد بەپارەو پول .ئەتان ووت تەورات فەرمانی پێداوین لەدیلی ڕزگاریان بکەین .

﴿وهو محرم علیکم اخراجهم﴾ وەکارو ئیش ئەوەیە قەدەغەیە لەســەر ئێوە دەرکردنــی جولەکەی برای خۆتان ،بۆ ئەبێ بـەدیل گرتنیـان بەتەنـها قەدەغـەبێ لای ئێـوە ؟کوشـتنو دەرکردنیان ڕەوا بێت لای ئێوە بێگومان لای خوا هەموویان قەدەغەن .

﴿ أفتؤمنون ببعض الکتاب ﴾ ئایا دوای بۆ ئێوە بـاوەڕ ئـەهێنن بەهـەندێ لـەناوەرۆکی تەورات وەك ڕزگارکردنی دیلەکان بەکڕینیان لەهۆزە عەرەبە هاوسوێنتان.

﴿ وتکفرون ببعض﴾ وەئێوە باوەڕ نایـەنن بەهـەندێ لەیاسـای تـەورات ،وەك قەدەغـە نەکردنی کوشتن و یاریدەدانی بێگانە و باوەڕنەهێنان بـە محمـد ئەوانـە هـەمویان قەدەغـەن وەهەروەها بەدیل گرتنیان و دەرکردنیشیان قەدەغەن ئەوکارانەی ئێوە گاڵتە کردنە بەئایین.

﴿ فما جزاء من یفعل ذلك منکم ﴾ دوای سزای کەسێ ئەوشتە بکات لەئێوەچ شتێکە کەباوەڕی بەهەندێ لەتەورات هەبێو و باوەڕی بەهەندێ تر نەبێ لەتەورات .

﴿إلا خزيٌ فی الحیاة الدُّنیا﴾ مەگەر سەرشـۆڕی و ڕسـوای لـەژیانی جیـهاندا بـەهۆی کوشتنی بەنی قورەیزەو دەرکردنی بەنی نەزیر بۆ (ئەزروعات و ئەریحا) لەشام کەبرای هـاو پشتی خۆتانن.

﴿ويوم القيامة يردّون الى أشد العذاب﴾ وەلە ڕۆژی هەڵسان لەگۆڕەکان بۆپاداشت و تۆڵە ئەوکەسانە دەگێڕنەوە بۆلای سەخترین عەزاب لە دۆزەخدا بەهۆی ئەو کارانەیانەوە .

﴿وماالله بغافلٍ عما تعملون﴾ وەخوا بێ ئاگا نیە لەشتێ ئێوە ئەی کەن وەك ئەوەی بڕواتان بەهەندێ یاسای تەورات هەیە لەڕزگارکردنی دیلەکان و بەڕلاکردنیان بەپارە بڕواتان بەهەندێکی نیە لەکوشتن و دەرکردنی خزمەکانتان .

﴿ أولئك الذين اشتروا الحياة الدنيا بالاخرة ﴾ ئەوکەسانە ئەو کارە نارەوایانە ئەکەن کەسانێکی ئەوتۆن کڕیویانە ژیان و گوزەرانی دنیا بەخۆشی پاشە ڕۆژهەربۆ ئەوە هاوسوێنەکانیان خۆشنود بکەن .

﴿ فلا يخفف عنهم العذاب ﴾ دوای سوك ناکرێ لەوانو کەم ناکرێتەوە سزای دۆزەخ سزای ئەمڕۆ پاشەڕۆژ هەتا هەتایە نەك بەگوێرەی گومانی ئەوان چەند ڕۆژێك نەبێت لەدۆزەخ دا نامێننەوە .

﴿ ولا هم ينصرون﴾ وەئەوان یاریدەیان نادرێ وەکەس نیە سزایان لەسەر هەڵگرێ و یان بۆیان بپارێتەوە لەدژی ئەوەی ئەیان ووت :باوك و باپیرە پێغەمبەرەکانمان بۆمان ئەپاڕێنەوە لای خوای پەروەردگار .

بەکورتی هەربیر و باوەڕێك سەرچاوەکەی لەقورئانی پیرۆزەوە هەڵنەقوڵێ کەفەرمانی داوە هەموو ئادەمیزاد یارمەتی یەکتری بدەن بۆ بەختیاری هەموویان پێویستە باوەڕی پێ بهێنرێت .بەڵام بیرو باوەڕی داگیرکەرانو ئیمپریالیزم و سەهیۆنی دەڵێن ئێمە ئەمانەوێ هەرخۆمان بژین ئیتر بالەناوچوونی ئادەمیزادی تر بێت .بەیارمەتی خوای گەورەی دادپەروەری خاوەنی زەوی و ئاسمان بەهەڵمەتەوە پەلاماریان دەدات سزاو تۆڵەو نەگبەتی ئەڕژێنێ بەسەریانا بەهۆی بلاو بوونەوەی یاسای پیرۆزی ئیسلام .

لەو ئایەتە بەرزو بەنرخانەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کەجوولەکەکان لەسەردەمی پێغەمبەر و لەکاتی موساوە وئێستاو لەمەو دوایش لەسەر دووپەت یاری دەکەن ،

خۆیانیان کردووە بەدووبەشەوە هەربەشێکیان پاڵیان داوە بەلایەکی بێگانەوە بۆ ئەوەی کلپەی ئاگری جەنگ بەرز بێتەوە هەر بۆئەوەی سوودی خۆیان بپارێزن و مسۆگەرتری بکەن ئەو پاڵ پشتەیان لەنێوان دوو دوژمنی بیانەدا بەمیرات لەباوك و باپیریانەوە وەریان گرتووە بەچاوی خۆمان دیمان و بەگوێ بیستمان لەمەو بەر پروپاگەندەیان بۆ شیوعیەکان ئەکرد و پشتیوانیان بوون بۆڕوخاندنی دام ودەزگای قەیسەری ڕووسیای سەرمایەدار ،هەرئەوانیش بوون لەدژی شیوعیەکان و ڕوسیا خۆیانیان فڕێداوەتە لای سەرمایەدارانی ڕۆژئاوا بەتایبەتی ئەمریکا .کەواتە هەموو ئاوات و ئامانجیان ئەوەیە دانیشتوانی سەرزەوی بکەن بەدووپارچەوە و هانیان بدەن لەدژی یەکتری ،بۆ هەڵگیرساندنی جەنگو ئاژاوەو دووبەرەکی ،هەتا بتوانن ڕامیاریە دۆزەخیەکەی خۆیان بسەپێنن بەسەریانا بۆ سەرکەوتنی خۆیان و مژینی خوێنی گەلانی بێ تاوان ،هەرلایەکیان سەرکەوت ئەوان لەگەڵیدان ،هەتا خراپەکەیان ئەزانرێ دووایی ڕوو وەرئەگێڕن بۆ ئەولاکەی تریان لەدژی دۆستە پێشوەکیان .ئەوجۆرە نەخشانە بۆمان ساز ئەکات جولەکەکان بڕوایان بەخواو بەمرۆڤایەتی جگە لەخۆیان نیە ،هیچ پەیمانێکی مرۆڤایەتی نابەستن ،کوشتن و تاڵانکردن و ڕەگەز پەرستی ودووڕووی و ئاژاوە نانەوە لەنێو گەلاندا و ڕووخاندنی مزگەوت و دروست کردنی ئارەق خانە و جێگەی قومارکردن و بەرەڵایی ژنان و داوێن پیسی و فێرکردنی سوڕدان و نەهێشتنی شەرم و بێ میهرەبانی منداڵان بۆ مرۆڤایەتی و سووتانی قورئان ئەوانەو شتی تری زۆر خراپ پیشەی جولەکەکان و شاگردەکانیانن و هەرگیز ناسرەون لە خراپەکردندا .

جولەکەکان ئەیانووت :بۆیە ئێمە واز لەئاینی ئیسلام دێنین و ناچینە ناوی ،ئێمە بەشی تەواوی خۆمانمان هەیە لەئامۆژگاری پێغەمبەکانمان بیکەین بەدەستوورو یاسا ئیتر پێویستمان بەیاسای تر نیە قورئانی پیرۆز ئابروویان ئەبا هەڵوێستیان لەگەڵ پێغەمبەرانی خۆیاندا و ئامۆژگاریەکانیان ڕون ئەکاتەوە پێیان ئەسەلمێنێ کە هەر کاتێ توشی ڕاستی و کاری ڕەوا

ببو نایە ڕویان وەرئەگێرا و دووای ئارەزواتی گلاوی خۆیان ئەکەوتن یەك لە دووای یەك پێغەمبەرانیان بۆ ئەهات بڕوایان پێ نەئەکردن وە ئازارو بێ شەرمیان لە گەلدا دەکردن ، ئەوەتە خوای گەورە هەندێ تر لە تاوانەکانیان ڕون ئەکاتەوە و ئەفەرموێ:

وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَقَفَّيْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ بِٱلرُّسُلِ ۖ وَءَاتَيْنَا عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَيَّدْنَٰهُ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ ۗ أَفَكُلَّمَا جَآءَكُمْ رَسُولٌۢ بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُكُمُ ٱسْتَكْبَرْتُمْ فَفَرِيقًا كَذَّبْتُمْ وَفَرِيقًا تَقْتُلُونَ ﴿٨٧﴾ وَقَالُوا۟ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ ۚ بَل لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَقَلِيلًا مَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٨٨﴾

﴿ولقد آتینا الموسی الکتاب﴾ وەبەڕاستی ئێمە بەخشیومانە بەموسا ئەونامەیە کەتەوراتە هەمووی بەیەك جار هاتووە بۆلای موسا ،بەپێچەوانەی قورئان کەلەماوەی بیست و سێ سالّدا هاتۆتە خوارەوە بەگوێرەی ڕوداوی پێویستی ڕۆژانە بەهۆی مانای ئەو ئایەتە پیرۆزەوە چاوێك فڕێ ئەدەین بۆلای موسولّمانانی ئەمڕۆ چۆن ئاواتی پڕو پووچ و بۆگەن سواریان بووەو شێتی کردوون و ئەقلّی تێکداون .لەدەمی دوژمنانەوەو لەدەمی پیرەژنەوە هەندێ شت ئەگێڕنەوەو بڕوایان پێ ئەکەن ،ئەلّێن مرۆڤ بڕوای بەخوا هەبێ هەمووشتی بۆ ئەکا جیهان ئەوەندەی تێدا بەسە نیە ،خوا لەم ڕۆژەداو لەپاشەڕۆژدا هەموو شتێك بۆ مووسولّمانان دەکات پیرە ئائینیەکانمان و زاناکانمان بۆمان ئەپارێنەوە لای خوا ،هەروەك جوولەکەکان ئەیان ووت باوك و باپیر و پێغەمبەرەکانمان بۆمان ئەپارێنەوە ،موسولّمانانی ئەمڕۆش خۆیانیان لەبیر چۆتەوە کەپێغەمبەر﴿ﷺ﴾ و پێشوەکانمان بەچ جۆرێ نەئەوەستان

بۆ بەدەستهێنانی بەختیاری ئەمڕۆ و پاشە ڕۆژ ،قورئان ئەخوێنن لەناوەرۆکەکەی ناگەن ، مێژو تەماشا ئەکەن پێی تەمێ نابن ،جگە لەتوێکلێی زانیاری و زانستی فێری مەبەستەکەی نەبوون ،وازیان لەدۆزینەوەی پیت و فەڕی ئاسمان هێناوە ، هەرئەڵێن خوامان بەسە ئەو ووتە نابێت مووسڵمانانی ڕاست بیلێن .خوای گەورە پێی ناخۆشە بۆیە پێمان ئەفەرموێ لەقورئانی پیرۆزدا :ئەی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ تۆبلێ بەئادەمیزاد :ئێوە کاربکەن و پاداشتی کارەکانتان وەرئەگرن و ئەیبینن (سورەتی تەوبە)ئایەتی (١٠٥).بەو جۆرە نین خوا فەرمویەتی بۆیە دوژمنانی ئیسلام پێشمان کەوتون لەفێربوونی زانین و زانیاری ،ئەوکەسانەی ئێمەیان داگیر کردو سامانیان بردین .ئێمەش ئاینمان لەدەست دەرچوو .بەکورتی ئێمەی مووسوڵمان پێویستە لەخەوهەڵسین ،یاسای پیرۆزی ئاین بگێڕینەوە بۆلای دۆخی جارانی ،ماف و ئایینی زەوت کراومان وەرگرینەوە ئەڵێن پاش باران کەپەنەك .خوا ئەفەرموێ :بۆ مرۆڤ نیە جگە لەوەی خۆی بگەڕێ بەشوێنی و بیکات .لەخۆیەوە هیچ شتێکیان بۆ نایە .سورەتی نجم ئایەتی (٣٩).

﴿وقفینا من بعده بالرسل﴾ وەئێمە هێنامان بەدوای موسادا چەندین نێراوی تر یەك لەدوای یەك بێژراوە هیچ کاتێك نەبروە لەنێوان موساو عیسی دا پێغەمبەرێکی خاوەن نامە یان پێغەمبەرێکی تر نەبووبێ مەگەر نێرراوە بۆلای کوڕانی ئیسرائیل کە ئەوپێغەمبەرانە فەرمانیان پێداون بەچاکە کردنو بەنەکردنی خراپە ، وەئەو پێغەمبەرانە بریتی بوون لە :یوشەع ،ئەشمەویل ،داود ،سولەیمان، شەعیاء ،ئەرمیاء ،عوزەیر ،حەزقیل ،ئەلیەسع،یونس ،زەکەریا،یەحیاء ،چەندین پێغەمبەرانی تر ئەو پێغەمبەرانە هەتا ڕەوانە کردنی عیسی هەموویان یەك دەستوریان هەبووە ،خوای گەورە ڕەوانەی ئەکردن بۆ تازەکردنەوەی یاساو دەستووری تەورات و بۆ زیندو کردنەوەی هەندێ لەودەستورانە لەبیریان نەمابوو لەدەستوری پێشوودا هەروەك زانایانی ئیسلام هاتوون و چوون و دێن و ئەڕۆن بۆ تازەکردنەوەی یاسای قورئان ، بۆیە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ئەفەرموێت :زانایانی ئوومەتی من وەك

پێغەمبەرانی بەنو ئیسرائیلی وان ..بەڵام دوای ئەو پێغەمبەرانەی بەنو ئیسرائیلی خوای گەورە عیسای بەدەستورێکی تازەوە ڕەوانە کرد بۆسەر کوڕانی ئیسرائیل .خوا ئەفەرموێ:

﴿واتینا عیسی ابن مریم البینات ﴾ وەئێمە بەخشیمان بەعیسی ی کوڕی مەریەم چەندین نیشانەی ڕوون و ئاشکراو کاری بەکەس نەکراو لەسەر ڕاستی عیساو پێغەمبەرایەتیەکەی ،وەك زیندووکردنەوەی مردووان ،چاککردنەوەی کوێرو بەڵەکاوی،گێڕانەوەی ڕووداوی لەبەر چاو نەبو ،عیسا بەزمانی سورەیانی یەشوع .یانی (پیرۆز و موفەڕەك .وە مەریەم یانی خزمتگوزار).

﴿وأیدناه بروح القدس ﴾ وە ئێمە عیسامان بەهێز کرد بەهۆی گیانێکی پاکەوە کەفریشتەی پەیام هێنەرەو ناوی جیبریلە ئەو یارمەتی و بەهێز کردنە تەنها بۆعیسا ناو براوە هەرچەندە فریشتەی پەیام بۆلای هەموو پێغەمبەران چووە ،لەبەر ئەوەی جیبریل موژدەی بە مەریەم دا بەبوونی عیسا ،بەفوی ئەوخوا دروستی کردووە جبریل بو عیسای بەخێو کردو لەگەڵی بو لەمنالیەوە هەتا لەگەڵی چوو بۆ ئاسمان هەندێ لەزانیان دەڵێن :کەبەڵگەیەکی دیاری کراو نەبێت لەسەر مەبەست لە(روح القدس) ئەڵێن :ئەتوانین بڵێین ئێمە عیسامان بەهێز کرد بەهۆی ئەوگیانە پاکەوە کرابوو بەبەریا ، خوا گیانێکی بەهێز و پوختەی وای پێ بەخشی شایستەی فروستادەی خوابێ و بتوانێ سکالای بەندەکانی خوا بگەیەنێ بەخواو ڕایان کێشێ بۆلای ڕێگەی ڕاست و ڕانموییی .هەرچەندە ئەومانایە دەچێتە مێشکەوە بەڵام هەرخوایە هەمووشتێك بزانێت ، جولەکەکان ئەوەندە لاساربوون بڕوایان بەو پێغەمبەرانە ئەکردو ئازاریاندان هەریەکەیان بەجۆرێ وەك خوای گەورە دەفەرموێ :

﴿ أفکلما جاءکم رسول بما لاتهوی أنفسکم استکبرتم﴾ ئایا دووای هەمووکاتێ هاتووە بۆلای ئێوە نێرراوێ بەشتێکەوە ئارەزووی لەو شتە نەبووبێ دڵی ئێوە ،ئێوە لەخۆتان بایی ئەبوون و فیزتان زل ئەبو،وەڵامتان نەئەدایەوە و گاڵتەتان پێ ئەکردن خوای گەورە بەو ڕستانە ڕوونی ئەکاتەوە :هەمووجوولەکەیە بەبێ جیاوازی یەك نەتەوەن و یەك ئاینیشیان

هەیە ،،هەرکەسێکیان ستەمی لەیەکێکیان کرد ئەوانی تریان بەوستەمە ڕازی بـن هاوبەشـن هەموویان لەوستەمەدا .

﴿ ففریقاً کذبتم ﴾ دووای ئێوە تاقمێ لەو فرۆستادانەتان بەدرۆ ئەخستەوە ،وەك عیسا و محمد (ﷺ) کەنەتان توانی بیان کوژن ،هەرچەندە هەوڵی زۆرتان دا بۆکوشتنیان و بۆتـان نەکرا ،بەتایبەتی جادووتان کرد لەمحمد و گۆشتی ژەهراویتان بەکارهێنا بۆ لەناوبردنی هەر بۆئەوەی سەرۆکایەتیەکەتان بپارێزن بەسەر زۆربەی ڕەشو ڕووتـی نەتەوەکـەتان ،سـامانیان بەناڕەوا بخۆن ،بیان خەڵەتێنن بەوەی ئێوە ڕاستن و پێغەمبەرەکان درۆزنن ،بەهۆی گۆڕینـی تەوراتە دەستکردەکەتان .

﴿وفریقاً تقتلون﴾ وتاقمێ ترتان لەو فروسـاتادانەی خواتـان کوشـت ،وەك زەکـەریاو یەحیاو هەندێ تریان ،خوای گەورە دەنگ وباسی کوڕانی ئیسرائیلی مان بۆ ئەگێڕێتـەوەو ئەمان ترسێنێ نەوەك ئێمەتووشـی ئـەو کـردەوە گلاّوانـەی ئـەوان ببـین ،جێگەداریەکـەی سـەرزەویمان لێ بسـێنێتەوە هـەرکاتێ ئێمـەی موسـوڵمان وەك ئـەوانمان لێـهات تووشـی ئەوکارانە بووین وەك ئەوانمان لێ هـات ، پـەیڕەو و پرۆگرامـی خۆمـان فـڕێ دا ، هـەواو هەوەسی خۆمانمان کرد بە فەرمان ڕەوای خۆمان ،هـەندێ لـەڕانومایی کـەرانی خۆمانمـان کوشت و هەندێ ترمان بەدرۆخستەوە ،گوێڕایەڵی زانایانمـان نـەبووین و توانـج و قسـەی ناڕەوامان ئاڕاستە کردن .خوای گەورە ڕسوامان دەکـات بەوشـتانەی ئـابڕووی کوڕانـی ئیسرائیلی پێبرد،پارچە پارچەو بێ هێز ئەبین ،کلۆڵ و لاواز ئەبین ،هەر بەوجۆرە ئەبین هەتا وەلاّمی خواو پێغەمبەری خواو زانایانمان دەدەینەوە بەختیاری ئاینمان بـۆ ناگەڕێتـەوە هـەتا دەستی ڕانومایی کەرانمان نەگرین بەڕێزەوە ،ئەگەر یەو جۆرە بکەین بەرەو پێش ئـەڕۆین و جێگەی خۆمان ئەگرینەوە دەستورەکەی قورئان باڵی دادگەری خۆی بەسـەر ئـادەمیزاد دا ئەکێشێ ،ئەگەر وانەبین تووشی نەمانی ئەمڕۆو تۆڵەی دوارۆژ ئەبین .بەڵام سوپاس بۆ خـوا ئەمڕۆ وائەبینرێ لەنەوەی موسوڵمانانەوە چاکیان هەڵکردووە بەخوێنی خۆیـان کەبـەرزی

یاسای ئیسلام بگێڕنەوە بۆ دۆخی جارانی خۆی ،بەفێربوونی زانین و زانیاری‌و ڕێزی زانایان و ڕانومایی کەرانیان و پێشەوا ئاینیە کانیانەوە ، جوولەکەکان بڕوایان بەڕانوومای کەرانیان نەبوو ئەیان ووت :

﴿وقالوا قلوبنا غلف﴾ وە جولەکەکان ئەیان ووت بە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾دڵی ئێمە چەندین پەردەی بەسەرەوەیە .ئەوانەی تۆ بەئێمەی ئەڵێیت نایزانین ،هەڕەشەو ترساندی تۆ بۆئێمە سوودی نیە هەندێ لەزانایان مانای ئەوڕستەیان بەم جۆرە کردووە :دڵانی ئێمە کیسەی زانیاریە پێویستمان بە هەڕەشەو گوڕەشەی تۆنیە ،ئێمەی زانایان بمانزانیایە ئەوەی تۆ ئەیلێیت سوود بەخشە وەرمان ئەگرت .قورئانی پیرۆز دەم کوتیان ئەکاو ئەفەرموێ :

﴿بل لعنهم الله بکفرهم﴾ بەڵکو خوا دووری خستەوە تەوە لەمیهرەبانی خۆی ،هەرگیز لێان نابوڕێ بەو بۆنەیەوە بڕوایان بەخواو پێغەمبەر نەئەهێنا ،درۆ ئەکەن و دڵیان نەپەردەی بەسەرەوەیە ،نەکیسەی زانیاریە ،هەرخۆیان لاسارو نەزانن.

﴿فقلیلامایؤمنون﴾ دوایی کەمێ لەوجوولەکانە بڕوا ئەهێنن بەمحمد پێغەمبەر﴿ﷺ﴾وەك عبدالله کوڕی سلام و هاوڕێکانی بەدووجۆری تر مانای ئەو ڕستەیە کراوە یەکەم:ئەوجولەکانە بڕوا بەکەمێ لەفەرمانەکانی خوائەهێنن بڕوا بەخوا دێنن ،بڕوا بە پێغەمبەر نایەنن.دووەم: کەمێکیان باوەڕناهێنن یانی نەزۆریان بڕوا ئەهێنن نەکەمێکیان .

ئەو دوو ئایەتە وەك هەڕەشە وایە بۆ ئەوکەسانەی باوەڕیان بەپێغەمبەر﴿ﷺ﴾ نەهێناوە و گوێ لەڕاستی ناگرن .هەرەشەیشە بۆ هەموو کەسێ بەئاسانی بجولێتەوە لەگەڵ ستەم کاران لەڕوویاندا نەوەستێ بەئامۆژگاری‌کردنیان و گەڕانەوەیان بۆلای دادپەروەری ، بۆ ئەوەی پلەی بەرز بۆ خۆیان دابین کەن وسامانی دانیشتوان بخۆن یارمەتی ستەمکاران ئەدەن ، پێشەوای ڕاست و ئاین پەروەر جگە لەچاکە بۆ دانیشتوان هیچ شتێ تری ناوێ بەگوێرەی یاسای ئیسلام لەکوشتن و بڕین و ستەم ئەیان پارێزێ لەبەر فەرموودەی خوا لەکەس ناترسێ و کەسیش ناترسێنێ ،هەمووکەسێ لەقازانج و زیاندا وەك خۆی تەماشا

دەکات ،هەموو ئاواتی ڕەزامەندی خوایە بۆ خوا خۆی ئەکات بە قوربانی ،ئەرێژێ بەسەر دانیشتواندا دادپەروەری وجگە لەڕاسق و خزمەتی گەل و نیشتیمان مەبەستی تری نیە .بەلام مرۆڤی پروپوچ ئەیەوێت دانیشتوانی لێ ڕازی بن ،گوێی لەخواو گەل و خزم نیە ،بازاڕی خۆی و قازانجی لەکاردا بێت بەسە بۆ ئەو ، جولەکەکان لەمەدینەدا بەر لەهاتنی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ئەپارانەوە لەخوا سەریان بخات بەسەر ئەوس و خەزرەج دا بەهۆی هاتنی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ وەئەیان ووت ڕۆژێ دێت ئەوپێغەمبەرەی لەتەورات دا ڕەنگ و شێوازی نوسراوە دێتو سەر ئەکەوێ بەسەر عەرەب دا بت پەرستان لەناو ئەبا ، کاتێ ئەو پێغەمبەرە هات جوولەکەکان بینیان کە عەرەبە و جولەکەنیە پشتیان تێکرد ،ڕەگەز پەرستی و دەمارگرتنی ، خۆیانیان بەدرۆ خستەوە .

بۆیە هەندێ لەهۆزەکانی ئەوس و خەزرەج ووتیان :ئەی کۆمەلی جوولەکە ئێوە ئێمەتان ئەترسان بەمحمد ﴿ﷺ﴾ ئەتان ووت ئێوە بت پەرستن ،ڕەنگ و شێوازی ئەوتان بۆ ئێمە ئەگێڕایەوە ،ئێستا ئێمە باوەڕمان پێهێنا ،جوولەکەکان وەلامیان نەدانەوە ئەو پیاوە شتێکی وەهای نەهێناوە ئێمە نەیزانین .ئەو کەسەنیە ئێمە ئەمان ووت :خوای گەورە بەم ئایەتانە نەفرەتیان لێ ئەکات و ئەفەرموێ:

وَلَمَّا جَآءَهُمْ كِتَٰبٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ وَكَانُوا۟ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُوا۟ كَفَرُوا۟ بِهِۦ ۚ فَلَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾

بِئْسَمَا ٱشْتَرَوْا۟ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ أَن يَكْفُرُوا۟ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بَغْيًا أَن يُنَزِّلَ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ

فَبَآءُو بِغَضَبٍ عَلَىٰ غَضَبٍۚ وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٩٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُوا۟ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُوا۟ نُؤْمِنُ بِمَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا وَيَكْفُرُونَ بِمَا وَرَآءَهُۥ وَهُوَ ٱلْحَقُّ مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَهُمْۗ قُلْ فَلِمَ تَقْتُلُونَ أَنۢبِيَآءَ ٱللَّهِ مِن قَبْلُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٩١﴾

﴿ولما جائهم كتاب من عند الله﴾ وەکاتێ هات بۆلایان ئەو نامەیە کەقورئانــە لەلایـەن خواوە بڕوایان پێنەهێنا ،ئەویش لاساری و خراپەیەکی تری جوولەکەکانە.

﴿مصّدق لِما معهم﴾ بەڕاستی گێڕا شتێ لـەگەڵ ئەواندا بوو ،لەتەوراتدا باسـی کرابـوو فەرمانیان پێدرابوو باوەڕ بە محمد ﴿ﷺ﴾ بێنن ،بەڕاسـتی دابنێـن ئەوشـتەی بۆیـان هـاتووە لەگەڵ قورئاندا یەکن و سەرچاوەیان یەکە .

﴿وکانو من قبـل یستفتحون علـی الذیـن کفـروا﴾ وە جوولـەکـەکان لـەپێش هـاتنی پێغەمبەرەوە داوای سەرکەوتنیان ئـەکرد لـەخوا بەسـەر ئەوانـەدا بڕوایـان بەخوانیـە ،وەك هۆزەکانی ئەوس و خەزرەج .کاتێ بکەوتنایەتە جەنگەوە لەگەڵ ئەوانەدا ئەپاڕانەوە لــەخوا ،ئەی خوایە تۆ سەرمان خەی بەسەریان لەبەر خاتری ئەو پێغەمبەرەی لەمەو پـاش ئـەینێری ،ئەیان ووت نزیکە هاتنی ئەو پێغەمبەرە ،هەتا بسەلمێنرێ ئەوڕاستیانە ئێمە ئەیلێین ، ئەو کاتە ئێمەئێوە لەناو ئەبەین وەك هۆزەکانی عاد و سەمود کەوەك ئێوە بت پەرست بوون .

﴿فلّما جاءهم ماعرفوا کفروا بە﴾ دوایی کاتیٚ هات بۆلای جوولەکەکان شتیٚ زانیبویان لەتەورات و زانیان بەهۆی قورئانەوە لەناسینی پێغەمبەر ،ئەوان باوەڕیان بەو شتە نەئەهێنا ئەبوایە باوەڕیان پیٚ بهێنایە ،چونکە ئەیان ووت و خۆیانیان پێوە هەڵ ئەکێشا بەبت پەرستان ئێمە ئێوە ئەکوژین لەکاتی هاتنی ئەو پێغەمبەرەدا ،کەچی ئەو پێغەمبەرە هات و ناسیان و باوەڕیان پێنەهێنا ،بەپێچەوانەی ئەوانەوە بت پەرستەکان ناسیان و باوەڕیان پێهێنا و یاریدەیان دا ،جوولەکەکان لەناو چوون بەهۆی بت پەرستە پێشوەکان بەپێشەوایەتی محمد دروودی خوای لێبێت ئەوشتەی ئەوان ئەیان ویست بیکەن بەرامبەر ئەوس و خەزرەج ئەمان کردیان بەرامبەر بەوان لەکوشتن و دەرکردنیان.

ئەو جوولەکانە باوەڕیان بەپێغەمبەر نەئەهێنا لەبەر هیچ بیانویەك نەبوو ،جگە لەڕەگەز پەرستی لەکۆتایدا تووشیان بوو بەو شتانەوە تووشیان بوو بەلەناوچوون و دەرکران ،کەواتە هەمووکەسیٚ بڕوای بەراستی نەبێت لەبەر ڕەگەزپەرستی و دەمارگیری پڕ بەپێستی خۆی هەروەك جوولەکەکان وایە وتووشی ئەوان دێت ئەوەی تووشی جوولەکەکان هات.

﴿ فلعنة الله علی الکافرین﴾ دوایی خەشم و بیٚ میهرەبانی خوا لەسەر بیٚ باوەڕان بێت کەپێغەمبەریان بەڕاستی ناسیبوو باوەڕیان پێنەکرد ،ئەوکەسانە وێنەی چوار پێن پتر لەوەی ئادەمیزاد بن ،یاخوا ڕسوابن چۆن پەشیمان بوونەوە لەوەی ووتیان لەناسینی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾.

﴿بئسما اشتروا بە أنفسهم أن یکفروا بما أنزل الله﴾ خراپ شتیٚ بۆ خۆیان پیٚ فرۆشت کەباوەڕ نایەرن بە شتیٚ خوا ناردویٚتیە خوارەوە کە قورئان و ئاینی ئیسلامە ،نەوەك سەرۆکایەتیان لەناو بچێت ، یانیٚ ئەو جوولەکانە خۆیانیان فرۆشت بەشەیتان خۆیانیان لەناو برد بە پەسترین نرخ ئەو شتەی لەناوی بردن هەر ڕەگەز پەرستی بوو بۆیە خوای گەورە ئەفەرمویٚ:

﴿ بغياً أن ينزل الله من فضله على من يشاءُ من عباده﴾ هەر لەبەر پـێ ناخۆشـبونیان و لادانیان لەیاسا کەخوا بنێرێتە خوارەوە بەگەورەیی و ڕێزی خۆی قورئان بـۆ سـەر کەسـێ ئـارەزووی هـەبێت لـە بـەندەکانی خـۆی ، ئـەو جوولەکانـە باوەڕیـان نـەهێنا بـە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾،چونکە ئاواتیان وابوو پەیام و ڕێزی پێغەمبەرایەتی هەربۆخۆیان بێت بەتەنـها ،هیچ شتێکیان نەلەخواوە وەنەلە کەسـی تـرەوە وەرنەئـەگرت ،ڕێـك نەکەوتایـە لـەگـەڵ هەوەس و سوودی تایبەتی ئەوان .

﴿فباءوا بغضب على غضب﴾ دوایی ئەو جوولەکانە گەڕانەوە بەخەشم لەسـەر خەشـم بۆلای پەروەردگاری خۆیان،وە شایەنی ئەو دووتۆڵەیەن :یەکێکیان لەسەر بـێ باوەڕیـان ، یەکێ تریان لەسەر ڕەگەز پەرستی ، خەشمێ لەسـەر پەرستنی گوێرەکـە کـە،ئـەوی تریـان لەسەر باوەڕنەهێنان بەپێغەمبەر ،تۆڵەیـە لـەسـەر باوەڕنـەهێنانیان بـەئینجیل ،ئـەوەی تریـان لەسەر باوەڕنەهێنانیان بەقورئان ،خەشمێ لەسەر باوەڕنـەکردنیان بەعیسـاو ،ئـەوەی تریـان لەسەر بێ باوەڕیان بەمحمد.

﴿وللكافرين عذاب مهين﴾ وەبۆ بێ باوەڕان هەیە سزایەکی ڕسواکەریان و ئابڕووبـەریان بەبەردەوامی لەناو دۆزەخدا ئەمێننەوە، لەبەر ئـەوەی بڕوایـان بـە قورئـان نـەهێنا و پێیـان ناخۆشبوو ،بەتەمای ئەوەبوون پـەیامی خـوا بـۆلای ئـەوان بێتـە خـوارەوە ،وایـان ئـەزانی هەرئەوان بەڕێزترن لەهەموو کەسێ ،گاڵتەیان بەقورئان ئەکرد ،خۆیانیان بەگـەورە ئـەزانی بەڵام ئەو سزایە ڕیسوایان ئەکات ، خوا ئەفەرموێ:

﴿وإذا قيل لهم آمنوا بما أنزل الله﴾ وەکاتـێ ببێژایـە بەجوولەکـەکان ئێـوە بـاوەڕ بێنـن بەشتێ خوانارددوویەتیە خواەوە لەقورئان و ئەو نامانە هاتووە بۆ پێغەمبەرانی تر ،واتـە ئێـوە باوەڕبهێنن بەپەیامی خوا بەو بۆنەیەوە پەیامی خوایە ،تەماشا مەکەن چ کەسـێ هێناویـەتی و لەچ گەلێکە ،فروستادە هەر فروستادەیە ، بۆ گەیاندنی فەرمانی خوا بەبێ جیاوازی .بـەڵام ئەو مەرجەی ئێوە داتان ناوە کەباوەڕتان بەو پەیامە هەیە بۆ گەلی ئیسرایل هاتبێ و بەس ،بۆ

کەسیٚ تر هاتبیٚ بڕوای پیٚ ناکەن ،ئەو مەرجەتان ئەوەئەگەیەنیٚ لە بنچینەدا باوەڕتان بـەهیچ پەیامیٚ نەبووەو نابیٚ، ئەتانەویٚ بیٚ فەرمانی خۆتان بسەپێنن بەسەر خـوادا و دووای ویسـتی ئێوە بکەویٚ ، مانای وایـە خـوا کزۆڵـە لەئاسـتی ئێـوەدا ،بـەلاَم ئێـوە هـەرگیز ملـی بـۆ دانانەوێنن.

﴿قالوا نؤمن بما أنزل علینا﴾ جولەکـەکان ئـەیان ووت : ئێمـە بـاوەڕ ئـەهێنین بەشـتیٚ هاتۆتە خوارەوە بۆسەر ئێمە ، ئێمە بەردەوامین لـەسەر بڕوا بەتەورات ، ئەوە ئەمە ئەگەیەنیٚ بەڕونی و ئاشکرای نەئێستاو نەلـەمەو دوایش بڕوا بەجگەی ئەو پەیامەی بۆ خۆیان نـەهاتبیٚ ناهێنن ، وەك ئینجیل و قورئان ئیتر بابەهەزاران بەڵگەیان بۆ بهێنرێتەوە .

﴿ وَیَکفُرونَ بِما وَراءَ ه ﴾ وەباوەڕ ناهێنن بەجگەی شتیٚ هاتبێتە خـوارەوە بـۆ سـەریان وەك ئینجیل و قورئان ، بۆیە خوای گەورە ئەفەرمویٚ و ئاگاداریان ئەکا بەو شتەی خۆیـان ئەیزانن لـەتەوراتا هاتۆتە خوارەوە بۆسەریان وە ئەفەرمویٚ :

﴿ وَهوَ الحَقُّ مُصَدِقاً لِما مَعَهُم ﴾ وەقورئان ڕاسـتە ، بەڕاسـت گـێڕە بـە شـتیٚ لەگـەڵ ئەواندایە کەبەڵگەی پێویستە لـەسەر ئەوەی باوەڕ بەپێغەمبەر بهێنن .

﴿ قُل فَلِـمَ تَقتُلُـونَ انبیـاءَ اللهِ مِـن قَبـلُ ﴾ موحەممـەد تـۆ بلـیٚ بـەوان لەبـەر چ شـتیٚ پێغەمبەرەکانی خوا ئەکوژن ، کەواتە ئێوە درۆ ئەکەن لەو گومانو داواکارییـەی خۆتانـا کەبڕواتان بەو پەیامە هەیە بێتە خوارەوە بۆسەر گەلی ئیسرا ئیل ، بەڵکو ئێوە بڕواتان بەهیچ پەیامیٚ نییە بگرە بەوەیش بۆ خۆتان هاتوە بەڵگەیش ئەو هەموو پێغەمبەرانەیە لەخۆتانن ، بۆ خۆتان نێرراون پێویست بوو بڕوایان پـیٚ بکـەن کـەچی هـەندێکیانتان کوشـت ، وەك زەکەریاو یەحیا وە هەندێکیانتان بەدرۆ خستەوە ، وەك عیسـا ، ئەوانـە هـەمویان بەڵگـەن لـەسەر درۆزنیان ، گفتو گۆ و کردارتان دژی یـەکترن و خۆتـان بـەدرۆ ئەخەنـەوە ، ئـەو ئایەتانە هەرچەندە لـەگەڵ ئەوانـەی پێشـوانیانە ، بـەلاَم ئەمانـەی سـەردەمی پێغەمبـەریش

ئەگرێتەوە ، لەبەر ئەوەی بەکردەوەی پێشووەکانیان ڕازین کەواتـە وەك ئـەمان کردبێتیـان وایە.

﴿إِن كُنتُم مُّؤمِنِين﴾ ئەگەر ئێوە بڕواتان هەیـە هـاتووە بۆسـەر خۆتـان وەك تـەورات فەرمانتان پێ ئەدا پێغەمبەرەکانتان مەکوژن بۆچی ئەتان کوشتن هـەندێ لـەزانایان ئـەڵێن : ووشەی (ان) بۆ نەفی‌یە یانی ئێوە بڕوادار نەبوون ، خوا هەموو شتێ ئەزانێ .

ئەو کردەوە پیسانەی جولەکەکان کەپێتان خۆشە هەر خۆیان کاری خۆیان هەڵسوڕێنن باڵەسەر خراپەیش بن لەگەڵ فەرمانی خوایشا ڕێك ئەکەوێ هەر ئەوان بەوجۆرە نین بەڵکو زۆر کەس و زۆر ڕەگەز هەن ، کە ئەمەیان پێ چاکترە لەسەر ڕەوشـتی خـراپ و ڕژێمـی نارەوا یاسا دەست کردوو ستەم کاری و داوێن پیسی و گێرە شێوێن و گومرایـی بـڕۆن هەتا بتوانن بەرگری ئەوکەسە بکەن کەبەهۆی کەسـێکەوە یاهۆزێکـەوە ئەیـەوێ ئـەوان و هەزاران کەسی تری وەك ئەوان ڕانومایی وەرگرن بـۆلای ڕێگـەی ڕاسـت و ڕەواو ئـاین پەروەری‌و بەختیاری .

وَلَقَدْ جَآءَكُم مُّوسَىٰ بِٱلْبَيِّنَٰتِ ثُمَّ ٱتَّخَذْتُمُ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَنتُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿٩٢﴾ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُوا۟ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱسْمَعُوا۟ قَالُوا۟ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا وَأُشْرِبُوا۟ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْعِجْلَ بِكُفْرِهِمْ قُلْ

بِئْسَمَا يَأْمُرُكُم بِهِۦٓ إِيمَٰنُكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٩٣﴾ قُلْ إِن كَانَتْ لَكُمُ ٱلدَّارُ ٱلْءَاخِرَةُ عِندَ ٱللَّهِ خَالِصَةً مِّن دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُا۟ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٩٤﴾ وَلَن يَتَمَنَّوْهُ أَبَدًۢا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٩٥﴾ وَلَتَجِدَنَّهُمْ أَحْرَصَ ٱلنَّاسِ عَلَىٰ حَيَوٰةٍ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ ۚ يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ وَمَا هُوَ بِمُزَحْزِحِهِۦ مِنَ ٱلْعَذَابِ أَن يُعَمَّرَ ۗ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾

﴿ وَلَقَد جاءَ كم مُوسى بِالبَيِّناتِ ﴾ وەبەڕاستی هات بۆلای ئێوەی بەنی ئیسرائیل موسا بەچەندین کاری بەکەس نەکراو ئاشکرا کە بەڵگەبوون لەسەر ڕاستی موسا وەك دار دەستەکەی کەئەبوو بەمارێك ، ئەوەی جادوو کە ران کەبەکاریان ئەهێنا هەمویانی هەڵئەلوشی ، وەك دەستە سپی‌یە تیشك دەرەکەی بەبێ نەخۆشی لەباخەڵی ئەی هێنایە دەرێ و ڕوناکی بلاو ئەکردەوە ، پچڕانی دەریا کاتێ فیرعون کەوتبووە دواتان ، هاتنە دەروەی ئاو لەبەردی ڕەق و ووشك ، هاتنی لاڤاوو کوللەو گرانی و ئەسپێ و بۆق و خوێن ، ئەوانە هەموو بۆ ئازاردانتان و تەمێ کردنتان ، ئا مۆژگاری کارتان تێ ناکاو تەمێ ناخۆن .

﴿ ثُمَّ اتَّخَذتُمُ العِجلَ من بَعدِهِ ﴾ لەپاش ئەو هەموو بەڵگە ڕونانە ئێوە وەرتان گررت گوێرەکەیە بۆ پەرستراوی خۆتان لەدوای چونی موسا بۆ کێوی تور ، وازتان لەپەرستنی خوا هێنا .

﴿ وَانتُم ظالِمُون﴾ وەئێوە ستەمتان لەخۆتان کرد و بێ باوەڕ بوون گوێرەکەتان پەرست واتان ئەزانی کەسێ توانای بەسەر ئەو کارە بەکەس نەکراوانەدا نییە جگە لەو خوایە توانای لەزۆری هەموو توانایەکەوەیە .

﴿ واذ اخَذنا مِثاقَکم ﴾ وەبیری ئەوکاتە بکەنەوە ئێمە وەرمان گرت پەیمانی ئێوە مانای ئەو ئایەتەو ئایەتی پێشو لەباسی مانا کردنی ئایەتی (٥١) پەنجا ویەك و ئایەتی (٦٣) شەست و سێ دا باسی کراوە بەڵام لێرەدا دوپات کراوەتەوە هەتا بەچاکتر داپین بکرێ لەسەریان و تەمێ خوار بن و بیانو یان نەمێنێ .

﴿ وَرَفَعنا فَوقَکم الطّورَ ﴾ وەئێمە بەرزمان کردبۆوە بەژورتانەوە کێوی تور هەڕەشەمان لێ کردن ئەگەر ئێوە باوەڕ بەتەورات نەکەن ئەو کێوە ئەخەین بەسەرتانا ، پێمان وتن : ﴿خُذوا ماآتَیناکم بِقُوة واسمَعوا﴾ ئێوە وەربگرن شتێ ئێمە بەئێوە مان بەخشیوە کەناوەرۆکی تەوراتە بەهەموو هێزتانەوە و ببیستن و کاری پێ بکەنو وەلامی خوا بدەنەوە .

﴿ قالوا سَمِعنا وَعَصَینا ﴾ جولەکەکان وتیان : گفتو گۆیەکمان بیست و ئێمە بێ فەرمانی تۆ ئەکەین وەبەجێ ی نایەرین بەناچاری بەزمان ئەیلێن : بیستمان هەتا ئەو کێوە نەکەوێ بە سەرمانا ، بەڵام لەدڵمانەوە وەری ناگرین .

﴿ وَاشرِبوا فی قُلوبِهم العِجلَ بِکُفرِهم ﴾ وەدەرخواردیان درابوو خۆشەویستی گوێرەکەکە لەنێو دڵیانا و پەرستنی داپین بو لەنێودڵیانا بەهۆی بێ باوەڕیانە خوای گەورە خۆشەویستی گوێرەکەکەی بەخواردنەوە داناوە نەك بەخواردن چونکە ئاو بەهەموو ڕەگ و مێشکدا و بەناوەوەو بەدەرەوەی لەشی مرۆڤ دا ئەڕوا ، بەڵام خواردن جگە لەشوێنی تایبەتیدا نەبێ ناڕوا .

﴿ قُل بِئسَما يَامرکم به إمانُکُم ﴾ موحەممەد تۆ بلێ بەوان خراپ شتێکە باوەڕ هێنانی ئێوە فەرمانتان ئەدا بەوشتە کەئەیلێن : ئێمە ئەی بیستین و بێ فەرمانیت ئەکەین ، بەووتەی خۆتان و هەڵوێستان تەورات فەرمانی داوە باوەڕ بەتەورات بکەن ئایا لەتەوراتدا هەیە پەرستنی گوێرەکە و کوشتنی پێغەمبەران و بەدرۆ خستنەوەیان ؟ چۆن فەرمانتان پێ ئەدا ؟

﴿ اِن کُنتُم مؤمِنِین ﴾ ئەگەر ئێوە باوەڕتان بەتەورات هەیە چۆن تەورات فەرمان ئەدا ئەو هەموو کارە خراپانە بکەن ، ئێوە هەر باوەڕدار نەبون بەتەورات .

خوای گەورە بەهەڕەشەوە ئەو ئایەتانە دوپاد ئەکاتەوە بۆ ڕانومایی کردنی موسوڵمان کەهەربەهۆش و گۆشی خۆیان بیر بکەنەوە و وورد بینەوە بەچاوی دوژمن تەماشای هیچ شتێ نەکە ن وەك جولەکەکان نەبن کەبەهۆش و گۆشی میسری یەکان لەگوێرەکە وورد ئەبونەوە کەئەیان ووت : پێویستە گوێرەکە ڕێزی بگیرێ هەتا جوتمان بۆبکاو کشتو کاڵمان بۆ بڕەخسێنێ ، جولەکەکان گوێرەکەیان پەرست و چاویان لەمیسری یەکان کرد و گومڕابوون .

ئێمەی موسوڵمان ئەگەر پشت بەخوا نەبەستین و قورئان نەکەین بەیاساو پێغەمبەر نەکەین بە پێشەوای خۆمان گومڕاو لاواز ئەبین ، بێ بڕخ وبێ هێز ئەبین ئەوکاتە چاوەڕوانی دوژمنانی خۆمان ئەبین چەك و ئاگرمان بدەنێ و خۆێن و ناموسمان لێ وەربگرن کردەوەی خرا پ ترو زۆرتر لەگوێرەکە پەرستن ئەکەین . جولەکەکان گوێرەکەیان ئەپەرست بەس نەبوو جوتیان پێ ئەکرد ئێمە دوژمنانی خۆمان ئەپەرستین و جوتمان پێ ئەکەن وەردویشمان پێ دووگاسنە ئەکەنەوە بەچەکو ئاگرەکەیان برای موسوڵمانو هاونیشتمانی خۆمانمان پێ ئەکوژن ، ئە لێن : ماڵتان ئاوابێ وسوپاستان ئەکەین ، ئێوە دۆستی ئێمەن . جولەکەکان ئەڵێن : ئێمە کوڕی خواو خۆشەویستی خواین چەند ڕۆژێکی کەم نەبێ ئاگر نامان سوتێنێ بەماوەی چل ڕۆژ گوێرەکە پەرستنیان ، ئەڵێن : هەرئێمە دۆستی خواین هەر جولەکە ئەچنە بەهەشت بڕوایان وابوو باوك و باپیرەکانیان و

پێغەمبەرەکانیان لەسزای خوا ڕزگاریان ئەکا خوای گەورە وویستی ڕیسوایان بکا و خراپەیان دەربخات بۆیە فەرمانیدا بەپێغەمبەر بڵێ :

﴿ قُل اِن کانت لَکُم الدّارَ الاخِرَة عندَاللّٰهِ خالِصَةً مِن دونِ النّاس ﴾ موحەممەد تۆ بڵێ : ئەگەر ئەو جیهانەی دوایی وبەهەشت هەر بۆ ئێوەیە بەتایبە تی و بەپوختە کراوی لەجگە ئادەمیزادی تر ، گەیشتن بەو بەهەشتە سوك و ئاسان نیە کەواتە هەردولامان لەخوا بپاڕێینەوە ئەو لایانەمان درۆزنین لەناومان ببا ، ژیانو ڕابواردنی ئەم جیهانە کەمەو بێ نرخە وەك خوا ئەفەرموێ :

﴿ فَتَمَنّوا المَوتَ ان کنتُم صادِقِن ﴾ دوایی ئێوە ئاوات بخوازن بمرن ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن ئێوە کوڕو خۆشەویستی خوان ، ئێوە بەهەشتین و کەمێ ئاگر ئەتان سوتێنێ و سزاتان ئەدرێ ئەو کەسەی بڕوای وابێ بەهەشتی یە مردن لای خۆشەویست ترە لەژیانی جیهانی پڕ لە گیرو گرفت و ناخۆشی و دەردو خەفەت ، ئەو کەسەی بڕوای وابێ کەبەمردن ڕزگاری ئەبێ لەوانە ئەچێتە بەهەشتی پایە دارو داوای مردن ئەکا .

﴿ وَلَن یَتَمَنَّوه اَبَداً بِما قَدَّمَت ایدیهِم ﴾ وەئەو کەسانە ئاواتی مردن ناخوازن هەرگیز ئەترسن و ئەلەرزن لەمردن بەهۆی شتێ پێشیان خستووە بەتوانای خۆیان لەکردەوەی خراپ و پێغەمبەرەکانی خۆیانیان بەدرۆ خستۆ تەوە ستەمکاریان کردووەو تەوراتیان گۆڕی ، وە ئەوڕستەیە پێمان ئەگەیەنێ داوای مردن ناکەن و نەیشیان کرد ئەو ڕوداوە بەو ڕاستی یە کەس ناتوانێ بیلێ جگەی قورئان .

﴿ وَاللّٰهُ عَلِمٌ بِالظالِمین ﴾ وەخوا ئەزانێ بەکردەوەی ستەم کاران و درۆزنان ئەو شتانەی کردویانە و لەمەودوایش ئەیکەن ئەیزانێ . بە کورتی نەیان توانی داوای مردن بکەن .خۆیان ئەیان زانی درۆزنن و ئەترسان داواکەیان گیر ا ببێو بمرن ، بێ بەشی هەردوو جیهان ببن وسزای پاشەڕۆژیش سەخت ترە .

ئەو ئایەتانە لەگەڵ جولەکەکانی سەردەمی پێغەمبەرێتی کە چەنەبازی و دەمە دەمەیان لەگەڵیا ئەکرد ، بڕوایان پێ نەئەکرد ، کەواتە زمانی ئەو کەسانە ئەبڕێ ئەڵێن : جولەکەی ئێستا داوای مردن ئەکەن و لەناویش ناچن هەتا بەو گفتو گۆ پڕو پوچانە گومان لەدڵی باوەڕدارانیدا پەیدا ببێ .

﴿ وَ لَتَجِدَنَّهم اَحرَصَ النَّاسِ عَلی حَیاة ﴾ سوێندم بەخوا موحەممەد تۆ بەڕاستی جولەکانت دەست ئەکەوێ بەدرێژایی ساڵ تەما کارترینی ئادەمیزادن لەسەر ژیانی جیهان و ڕابوردوانی جیهان .

هەرگیز داوای مردن ناکەن و کوژراوی دەستی سامان و سود وەرگرتن و ژیانی جیهانین .

﴿ وَمِنَ الَّذینَ اَشرَکوا ﴾ وەتۆ دەستت ئەکەوێ ئارەزویان پتر ترە لەسەر ژیانی جیهان لەکەسانێکی ئەوتۆ هاوبەش بۆ خودا دائەنێن لەبت پەرستان کەجگە لەزیندەگانی ئەمڕۆ بڕوایان بەدوا ڕۆژ نی‌یە ئەو ڕستەیە بت پەرستانی عەرەب و ئاگر پەرستەکانو ئەوانیش ئەگرێتەوە ئەڵێن ، عیسا کوڕی خوایە عوزەیر کوڕی خوایە ئەو کەسانە هەمویان هەرچەندە ووشەی (النَّاس) لەڕستەی پێشەودا ئەیان گرێتەوە بەڵام بۆ جارێ تربەتایبە تی خوا باسیان ئەفەرموێ هەتا بۆمان ڕوون ببێتەوە هەرچەندە بت پەرستان لەهەموو بێ باوەڕان خراپ ترن چونکە هاوبەشی بۆ خوا دائەنێن ، جولەکەکان لەوانیش خراپترن وەئارەزویان بۆ ژیانی جیهان پتر ترە .

﴿ یود أحدهم لویعمر ألف سنة ﴾ ئاوات دەخوازن هەریەکە لەجوولەکەکان و لە هاوبەش دەرە بت پەرستەکان تەمەنیان پێ ببەخشرێت هەزار ساڵ ،ئەو وێنە لێدانە لەوەوە هاتوە ئاگر پەرستەکان و هاوبەشدانەران لەعەرەبەکان بچونایە بۆلای پاشاکانیان یا بەیەکتری بگەشتنایە ئەیان ووت :تەمەنتان هەزار ساڵ بێ و لەهەزار جەژنا بن ،بەو ووشانە

ڕۆژباشیان لەیەکتری ئەکرد .بەو بۆنەوە واچاکە ئێمەی موسوڵمان لەهیچ جەژن و لەهیچ ڕووداوێکدا ئەورستانە بەکار نەیەنین لەگەڵ یەکتری دا .

﴿وما هو بمزحزحه من العذاب أن يعمر﴾ وە ئەو تەمەنە درێژە هەزارساڵیە دوور ناخاتەوە و ڕزگاری ناکات لە سزای ئاگری دۆزەخ کە ئەو تەمەنەی پێ ببەخشرێت ،بێگومان پاشەڕۆژی ئەوکەسە هەر مردنە ،بەڵام با ئاگاداری ئەمەیش بین ئەو کەسانەی تەمەن درێژیان پێخۆشە هەتا چاکە بکەن لەگەڵ ئادەمیزادا ئەو کەسانە بەختیارن و ئاواتیان پەسەندە ،بۆیە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ دەفەرموێت خۆشی بۆ ئەوکەسەیە کە تەمەنیان درێژ و کردەوەیان چاك بێت .ئەو کەسانەی هاوبەش بۆ خوا دادەنێن ،وەبەتەمای زیندوو بوونەوە نین و بەتەمای پاداشتی پاشەڕۆژ نین ،بۆیە تەمەن درێژیان لاگرنگە جولەکەکان بیانزانیایە چ دەردی سەری و سزایان تووش دەبێت لەدواڕۆژ دا زانیاری خۆیانیان بەفیرۆ نەئەدا وە ئەیانزانی بروا بەپاشە ڕۆژ بەهرەی بەنرخەو ئەڕژێ بەسەر دڵیانا هێمنی و ئارامی ، ئەیانزانی بروا بەپاشەڕۆژ چرکەی دڵ و نەخۆشی مێشك پەرتەوازە دەکات .

﴿والله بصيرٌ بما يعملون﴾ وە خوا ئاگادارە بەشتێ ئەو کەسانە ئەیکەن و ئەیان بینێ ، وەهیچ شتێکی لێون نابێت ،پاداشت و تۆڵەی هەموو کردەوەکانیان ئەداتەوە لەپاشە ڕۆژدا ئەتوانین بلێین :ڕستەی ﴿ومن الذين أشركوا﴾ هەتا کۆتایی ئایەتەکە پەیوەندی بەپێشەوە نیەو سەربەخۆیە ،یانی وەتاقمێ لەکەسانێکی ئەو تۆ هەن هاوبەشیان بۆ خوا داناوە باوەڕ بەتۆ ناکەن لەبەر لەخۆبایی بونیان و فیز لێیان ،ئەیشزانن لەدواڕۆژدا تووشی سزای هەتا هەتایی ئەبن بڕواشیان بەڕاستی تۆ هەیە، ئەوتاقمانە زۆریان پێ خۆشە تەمەنیان درێژ بێت هەتا ئەگاتە هەزار ساڵ ،ئەو کەسانە سامانی جیهانیشیان بازۆریش بێت دووریان ناخاتەوە لە مردن و سزای پاشە ڕۆژ ، بێگومان دەبێت هەر بمرن و بەسزای خۆیان بگەن .

وەك لەمەو بەر بەکورتی باسمان کرد خوای گەورە فەرمانی داوە بەپێغەمبەری خۆی بەشیرین ترین گفتو گۆ لەگەڵ دوژمنانی خۆی بدوێ ،بەجۆری کاربکاتە سەر عەقڵ و

بیریان ، ئەمەش بزانین هەموو گفتوگۆی قورئان لەو بابەتەیە ،بێ باوەڕان بانگ ئەکات و ئەفەرموێ :بیر لە خۆتان و زەوی و ئاسمان بکەنەوە چۆن درووست کراون،بەو کەسانە ئەفەرموێ کە ئەڵێن عیسا کوڕی خوایە چۆن خۆی و دایکی خواردەمەنی ئەخۆن ؟ڕوو ئەکاتە جوولەکەکان و ئەفەرموێ بیری ئەوە بکەنەوە کە تەوراتم بۆ ناردن ڕانومایی و ڕووناکی بۆ ئێوە تێدایە ،چۆنم ڕزگار کردن لە چەوسانەوەی فیرعەون ؟هەتا دێ ، هەڕەشەیان لێدەکات بۆ گوێرە کەکەتان پەرست ؟ کێوی تورم بەسەرتانەوە ڕاوەستان تا بڕوا بەتەورات بکەن ،ئێوە چۆن ئەبێ کوڕی خواو خۆشەویستی خوابن چۆن ئەبێ بەهەشت بەتایبەت هەر بۆ ئێوە بێت .فەرمانی پێ ئەدان و ئەی فەرموو ئەگەر ڕاست ئەکەن لەگفتو گۆی خۆتانا داوای مردن بکەن ئەو کەسەی بڕوای وابێ بەهەشت هەر بۆئەوە داوای مردن دەکات لەخوا،هەتا لەدەست جیهانی پڕ ئاشوب ڕزگار ببێت و بچێتە بەهەشت ،ئەگەر لەو فەموودانەی خوای گەورە ورد بینەوە دەبینین خوای گەورە ئەوپەڕی میهربانی بەکار هێناوە لەگەڵ بەندەکانی خۆی جارێ بەنەرمی ئامۆژگاریان ئەکات و جارێ تر بەتووندی ئێمە ، بێگومانین کەجوولەکەکان باوەڕیان بەپێغەمبەر نەهێنا بەڕواڵەت ، ئەیان ووت ئێمە بڕوا بەپەیامێ نابەین بۆ ئێمەنەهاتبێ ، بەتەنها لەبەر ڕەگەز پەرستیان نەبوو بەڵکو لەناوەرۆکدا لەبەر سوودی تایبەتی و مانەوەی سەرۆکایەتیان بوو ،چونکە ئەوان لەسەر دەست بڕین و سود خواردن و بەرەلایی ئەژیان .پێغەمبەر﴿ ﷺ﴾ ، ئەوانەی غەدەغەکردبوون ئیتر چۆن ئەبێت باوەڕی پێ بهێنن ،بەڵگەش لەسەر ئەوانە ئەومەیە: پێغەمبەرەکانی خۆیانیان ئەکووشت هەرلەبەر سوودی تایبەتی خۆیان ،هەرکەسێ بەوجۆرە بێت گفتوگۆی شیرین کاری تێ ناکا ،بائەوەشمان لەبیر بێت هەربەتەنها ئەوان وانین،بەڵکو هەرکەسێ ئاواتی وابێ سوودی تایبەتی خۆی بپارێزێ بالەناوچوونی دانیشتوانی تر بێ ، وێنەیان وەك جولەکەکان وایە لەهەموو کات و جێگەیەکدا.

قُلْ

مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُۥ نَزَّلَهُۥ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿٩٧﴾ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّلَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَىٰلَ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَدُوٌّ لِّلْكَٰفِرِينَ ﴿٩٨﴾ وَلَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ۖ وَمَا يَكْفُرُ بِهَآ إِلَّا ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٩٩﴾ أَوَكُلَّمَا عَٰهَدُوا۟ عَهْدًا نَّبَذَهُۥ فَرِيقٌ مِّنْهُم ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠٠﴾

هەموو زانایان کەمانای قورئانی پیرۆزیان کردووە فەرموویانە :هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئەو ئایەتانە ئەمەیە : جوولـەکـەکان بەسـەرۆکایەتی عبـدالله کـوری سـوریا کەیەکێکـە لـە مالومە گەورەکانیان پرسیاریان کرد لە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ئەو فریشتەیە پەیامت بـۆ دێنێـت چ کەسێکە؟ وەبیستبویان پەیام هاوەر جبرەئیلـە بـەڵام بـۆ چەنـە بـازی ئـەوەیان بـەرپا کـرد پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرمووی ئەو فریشتەیە جبرەئیلە ووتیان: دوژمنی ئێمەیە چونکە بـەگرانی و بەجەنگەوە دێتە خوارێ میکائیل بەئاشتی یەوە دێتە خوار ئەگەر میکائیل پەیامی بهێنایە بۆتۆ بڕوامان پێ دەهێنای ئەوان خۆیانیان گێل و شێت کـردووە کینـەو ڕقـی گلاویـان ڕایـانی

ئەكێشا بۆلای ئەو شێتیە ئەگینا بۆ ئەبێت جبریل دوژمنیان بێ ئەو فریشتەیە ،خۆ ئـادەمیزاد نیە هەتا دوژمنیان بێت ،هیچ شتێ بەدەست جیبرەئیل نیەو بەندەی خوایە بێ فـەرمانی خـوا ناكات هەرشتێ خوا بیفەرموێ ئەوشتە بەجێ دێنێ ،بۆیە خوای گەورە بەفورستادەی خـۆی ڕاگەیاند بەجوولەكەكان بلێ ئەو كەسەی دوژمنـی جیبرەئیلـە بـا بمـرێ بـەچاوی گێـل و كینەی خۆیەوە جبرەئیل قورئان ئەخاتە دلّی تۆ لەبەری ئەكەیت و لێی تێ ئەگەی فـەرمانی خوا بۆتۆ ئاسان ئەكات ئەو قورانە بەڕاست ئەگێڕێ ئەو پەیامانـە هاتوونەتـە خـوارەوە بـۆ پێغەمبەرە پێشووەكان ڕانومای كەرە بۆ گوومڕایان و مـوژدە دەرە بـە بەهەشـت لـەڕۆژی دوایدا بۆیە خوا ئەفەرموێ:

﴿ قل من كان عدواً لجبريل ﴾ محمد تۆ بلێ ئەوكەسەی دوژمنی جبریلە بالـەڕقا بمـرێ هیچ بەلگەیەكی بەدەستەوە نیە ئەو كەسە دوژمنی ئەوبێ بێ باوەڕە .

﴿فإنه نزله على قلبك﴾ دوای بەڕاستی جبرەئیل قورئانی بەسرووشت هێنـاوە بـۆ سـەر دلّی تۆ پارستوویەتی بۆتۆ ، دلّی تۆی والێ كردووە قورئان ببێ بەڕەوشتی تۆ هەتا لەبـەری بكەی وە هۆگری بیت.

﴿ باذن الله ﴾ بەهۆی دەستور و فـەرمانی خـواو ئاسـان كردنـی ، بـەو ڕسـتەیە خـوا هەڕەشە لە جوولەكەكان دەكات لـەسەر دوژمنایەتیان بۆ جـبرەئیبل ، ئـەیكات بـە بەلگـە بەسەریانەوە هەتا بەلگەیان نەمێنێت چوونكە جبرەئیل بەفەرمانی خوا قورئـانی هێنـاوە نـەك لەلایەن خۆیەوە .

﴿ مصدقاً لِما بين يديه﴾ ئەو قورئان ڕاسـت گـێڕە بـۆ شـتێ لـەپێش خۆیـەوە هاتۆتـە خوارەوە ڕێك و پێكە لەگەلّ ئەونامانە هاتوونەتە خوارەوە بـۆ پێغەمبـەرانی تـر یـەكێ لـەو نامانە تەوراتە.

﴿وهدى وبشرى للمؤمنين﴾ وە ڕانومای كەرە جبرەئیل بۆلای ئاینی ڕاست مـوژدە دەە بۆ باوەڕداران وەڕایان ئەكێشێ بۆلای ڕێگەی ڕاست و سەركەوتن مرۆڤی ژیر چـۆن واز

لەوانە دێنێ ، فریشتەیە بەو جۆرە بێت دوژمنایەتی ناکرێ بەڵکو ئەبێ خۆشتان بوێ و سوپاسی کردەوەی بکەن بۆ هاوردنە خوارەوەی ئەو قورئانە کەسوودی هەردوو جیهانی تێدایە .

جوولەکەکان لەمەو بەر بەروالەت ئاژاوەیان ئەنایەوە ، ڕوویان پێئەکرد بۆلای پێغەمبەر بەتەنها ئەیان ووت پەیام پێویستە بۆ یەکێ لەجوولەکەکان بێت نەك بۆ گەلی عەرەب کاتێ خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی دەم کووتیان کردن بەبەڵگەی بێ وەلام ، هیچ یان بۆ نەمایەوەو ، ڕووی ئاژاوەکەیان وەرچەرخان بۆلای جبرەئیل نەك پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بەلام لەناوەرۆکدا وەك باسمان کرد ئاژاوەکەیان نە لەبەر پێغەمبەرو نەلەبەر جبرەئیل ، نەلەبەر عەرەبایەتی و نەلەبەر جوولەکایەتی بوو بەڵکو هەر لەبەر سوودی تایبەتی خۆیان بوو ،چوونکە کار وباریان بلاوکردنەوەی داوێن پیسی و ئارەق فرۆشتن و سود خواردن و شاردنەوەی خواردەمەنی پێویست بۆ دانیشتوان ئەوانەیش قەدەغە کرابوون بۆیە دەستیان کرد بەدرو ڕووی درۆو دەلەسەی پرو پوچ ، خۆیانیان ئەشاردەوە بەو فرو فێلانە.

﴿من کان عدواً لله ﴾ هەرکەسێ دوژمنی خوابێ فەرمانەکانی بەجێ نایەنێ بەو جۆرەی خوا فەرموویەتی گوێڕایەڵی قەدەغە کراوەکان نەبێت و لەپەرستنی خوا دەرچێت .

﴿وملائکته﴾ وەدوژمنی فریشتەکانی خوایش بێ وەبەدرۆ یان بخاتەوە بەو جۆرەی خوا فەرموویەتی کەبێ فەرمانی خوا ناکەن و گوناهیان نەکردووەو نایشی کەن .

﴿ورسله﴾ وە دوژمنی نێردراوەکانی خوا بێت بەدرۆیان بخاتەوە بەدەستی ئەنقەست وەئازاریان بدات .

﴿ وجبریل ومیکال ﴾وە دوژمنی جبرەئیل و میکائیل بن ، جوولەکەکان بەگوێرەی سروشتی خۆیان هەروەك جیاوازیان دروست ئەکرد لەنێو پێغەمبەراندا جیاوازیشیان لەنێو فریشتەکان دروست ئەکرد ئەیان ووت ئێمە دۆستی میکائیل ین بەلام دوژمنی جبرەئیلین .
خوای گەورە بۆیە باسی جبرئیل و میکائیلی بەجیاوازی باس کردووە هەرچەندە

فریشتەکان ئەمانیشی ئەگرتەوە هەتا بۆمانی ڕوون بکاتەوە دوژمنایەتی هەرکامیان بکرێت دوژمنایەتی ئەوی تریشیانە بەبێ جیاوازی دوژمنایەتی جبرەئیل دوژمنایەتی خواو فریشتەکان و فروستادەکان و میکائیلە.

﴿ فإن الله عدوّ للكافِرين﴾ دووایی بەڕاستی خوا دوژمنی بێ باوەڕانەو سزایان ئەدا ئەو کەسانەی دوژمنی جبرەئیل بن یەکێکە لەبێ باوەڕان.

کاتێ عبدالله ی کوڕی سوریا بەپێغەمبەر(ﷺ) ی ووت :ئەی محمد تۆ شتێکی وەهات نەهێناوە ئێمە بیزانین ،ئایەتێکی ڕونت بۆ نەهاتووە هەتا ئێمە دوات بکەوین ئەم ئایەتانە هاتنە خوارەوە،فەرمووی :

﴿ ولقد أنزلنا إليك آياتٍ بيِّناتٍ﴾ وە بەڕاستی ئێمە ناردومانەتە خوارەوە بۆلای تۆ چەندین ئایات و بەلگەی ڕوون و ئاشکراو بێگومان ، مانای دەرکەوتویان هەیە ،یاساو دەستوری ئیسلامیان تێدایە ،بەدرێژی لەهەموو ڕویەکەوە بۆ هەموو کات و جێگەیەك کاری ڕەواو نارەوای پێ ئەزانرێ .

﴿وما يكفر بها الا الفاسقون ﴾ وە بێ باوەڕنابێ بەو ئایەتانە مەگە کەسانێ لەسنوور لایان دابێ ،ئەوی تۆ هێناوتە گومان وەرناگرێ ، لەڕووی ئەو هەموو بەلگە ڕوونانە جولەکەکان لەباوەڕ دەرچوون بە باوەڕنەهێنانیان بەپێغەمبەر(ﷺ) جێگەی سەر سوڕمانە ئەو جولەکانە لەڕووی هیچ شتێکا دانامێنن و شەرم لەهیچ شتێ ناکەن ،گوێیان لەهیچ پەیمانێ نیە ،ئەو پەیمانە ئەمڕۆ بیدەن بەتۆ بەیانی تێکی ئەدەن وەك خوا فەرمویەتی :

﴿أو كلما عاهدوا عهدا﴾ ئایا ئێوە بێباوەڕ نەبوون بەو بەلگە ڕوونانە ، هەمووکاتێ ئەوان بەستبێتیان پەیمانێ کەیارمەتی دوژمنانی ئاین نەدەن پەشیمان ئەبوونەوە وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿ نبذهُ فريقٌ منهم ﴾ تێکیان دا بوو تاقمێ لەوان ئەو پەیمانە ، پەیمانەکان بریتی بوون لەیارمەتی نەدانی بت پەرستان باوەڕ بە پێغەمبەر هێنان (ﷺ) پێغەمبەرەکانی خۆیان

نەکوژن . باوەڕیان پێبـهێنن . لـەخوا بترسـن ، دوایـی یـاریدەی بـت پەرستانیان ئـەدا ، پێغەمبەریان بەدرۆ دەخستەوە ،پێغەمبـەرەکانی خۆیانیـان کووشـت و بـەدرۆیان خسـتەوە ،ویستیان عیساو پێغەمبەر بکوژن ، گوێرەکەیان پەرست .

﴿ بل أكثرهم لايؤمنون﴾ بەڵکو زۆربەیان باوەڕناهێنن بەتەورات ،هیچ ئاینێکیان نـەبوو ، تێکدانی پەیمانیان بەگوناه نەئەزانی ، بڕوایان بەخوا نـەهێناو گوێرەکـەیان پەرست ،ئـەو کارانـەی ئـەوان جێگـەی سەرسـوڕمان نیـە ،چونکـە خوڕەوشتیانە لەهـەموو کـات و جێگەیە،شەرمیش ناکەن و تەمێ خوار نابن .

بەکورتی تاوانبار ئەتوانێ بەگوێرەی گلاوی خۆی بلێ :من لەسـەر ڕەوام ، خراپـەکار ئەتوانێ داوای چاکە بکات بۆخۆی ،بڕو بیانوو بۆ خراپـەو تاوانـەکانیان بسـازێنن ،بـەپڕو پاگەندە بەرگی ڕەوایان بکەنە بەریان ، بەڵام زۆری پێناچـێ ڕسـوا ئـەبن ،بەڵگـەی ڕوون مێشکی خراپیان ئەپژێنێ ،جێگەی هەڵهاتنیان بۆنامێنێ ،هەروەك جوولەکەکان خوا ئابڕوی بردن بەهۆی درۆی خۆیان و داواکاری پروپوچیـان ،بـەهۆی ناردنـە خـوارەوەی پـەیام و دوژمنایەتی جبرئیل ، لـەم سـەردەمەی ئێمـەدا ئـەبینین کاربەدەستانی ڕووی زەوی داوای ژیانێکی ئاشتی خوازانە ئەکەن ،بژین بەیەکەوە بەبێ جەنگ و ئاژاوە ،ئەیانەوێ گیرو گرفتی نێوان خۆیان و دوژمنەکانیان بەکۆبوونەوەو گرتنی کۆڕو گفتوگۆ کردن .بەڵام لەئـەنجامی تاقی کردنەوەیان لەلایەن مرۆڤانی ژیرەوە فێریان کردووین ووت ووێژی جـوان و شـیرین سوودی نیە لەگەڵ ئەو کەسانەدا سوودی تایبەتی خۆیان بوێ و جیاوازیـان لەگـەڵ جگـە لەخۆیان مەبەست بێ بڕواناکرێ سوود پەرستان لەسوودی خۆیان دابـەزن بـەبێ تـرس و بەبێ زۆر.

ژیانی ئاشتی خوازانە پێویستی بەعەقڵێ کراوە هەیەو بە ڕەوشتی بەرز هەیە ، ئەوانـە لای مـادە پەرسـتان و خوێـن مـژان و داگـیر کـەران دەسـت ناکـەوێ ،چ بەڵگەیـەك هەیـە چاوچنۆکان و زۆر خۆران قنیات بکات ؟ئەبێژرێ هەردوو لایەنی ڕۆژ ئـاواو ڕۆژ هـەڵات

داوای ژیانێکی هێمن و ئاشتیانە ئەکەن بۆخۆیان و لەناو خۆیاندا .کەچی لەهەمان کاتدا خۆیان پڕچەك ئەکەن بەهەموو جۆرە چەکێ ،لەترسی یەکتری خۆیان بەهێز ئەکەن ، بەلای دانیشتوانەوە کەمترین ژیانی ئاشتیانە ئەمەیە پێك بێن بەکردەوە نەك باواتە وتیە ،هەریەکەیان بەبەڵگەی ڕاستەوە بەرەو ئەوی تریان بڕۆن پێیان وابێ هەموو گەلێ خاوەنی مافی خۆیەتی خۆی بۆخۆی کاری خۆی هەڵسوڕێنێ ،هیچ گەلێ دەست درێژی بۆگەلێ تر نەکات و مافی زەوت نەکات ،ئەبێ چ کەسێ بێ بەو کارانە هەڵسێ ؟بەڕاستی ووتووێژی ئاشتی پەروەری و سەلماندنی مافی یەکتری پێك نایە بەتەواوی بگرە بەکەمو کوڕیش ، هەتا هەموو لایە بڕوا بەماف و ڕاستی نەهێنن ،جێگەی بڕوا نیە رانومای بۆلای چاکەو بەهیوای چاکە بی لەکەسێکەوە بڕوای بەجگە لەمافی خۆی نەبێ ،گرنگ نەبێ لای جگە لە سوودی خۆی ،کەواتە ئەبێ بزانرێ بێجگە لەباوەڕو ترسی خوا و بڕوا بەپاشە ڕۆژ و هەست کردن بەسزا و پاداشتی چاکەو خراپە شتێ تر ناتوانێ ببێتە هۆی ژیانێکی ئاشتی خوازانە لەسەر ڕووی ئەم زەویە ،بەبێ لایەن گری بۆ هیچ لایە ئەگەر کەمێ وورد بینەوە بەئاسانی بۆمان ڕوون ئەبێتەوە جگە بەیاسای قورئان ئەو مەبەستانە نایەتە دی.

وَلَمَّا جَآءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ نَبَذَ فَرِيقٌ مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ كِتَـٰبَ ٱللَّهِ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ كَأَنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٠١﴾

﴿ولما جائهم رسول من عندالله﴾وەکاتێ هات بۆلای جوولەکەکان نێرراوێ لەلایەن خواوە کە محمد ﴿ﷺ﴾ بۆ هەمووئادەمیزاد و جوولەکەکانی سەردەمی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ .

﴿مصدّقٌ لما معهم﴾ فروستادەیە بەڕاست گێڕ بوبێ بۆ شتێ کەلەگەڵ ئەوان دابوو کەتەوراتە لەهەموو ڕوویەکەوە لەوەی خوایە کەموژدەدەرە بەهاتنی پێغەمبەر(ﷺ) بەهەموو شێوازیەوە .

﴿ نبذ فریق من الذین أتوا الکتاب کتاب الله وراءَ ظهورهم﴾ فڕەیان دا تاقمێ لەکەسانێکی ئەوتۆ درابوو بەوان نامەیە کەتەوراتە ، نامەی خوا کەقورئانە خبرەیان ئەدا بە ئەودیوی پشتیانەوە و کاریان پێ نەئەکرد .

﴿ کأنهم لایعلمون﴾ وەك ئەوەی ئەوان بەڕاستی ئەونامەیە بەنامەی خودای نەزانن و خۆیانیان گێل ئەکرد. کەچی زۆر بەباشی ئەیانزانی لەلایەن خواوە هاتووە وە محمد نێرراوی خوایە ، ئەو باسانەی پێشوو ڕابوورن وەنەبێ هەر جوولەکەکان وابن ، بەڵکو گاورەکانیش هەروەکو ئەوان وان،هەردوولایان نامەکانی خوایان گۆڕی ، ئەو شتانەی پەیوەندیان بەهاتنی موژدەدانی هاتنی پێغەمبەرەوە بووبێ گۆڕاوە بگرە هەرمێژەر بەسەرێ فەرموودەی خوا بگۆڕێ بۆ مەبەستی ناڕەوای خۆیان ،ئیتر رامیاری بێت یان ئابووری و بەرگری و ڕۆشنبیری هەروەك جوولەکەکان و گاورەکان وایە ؛ لەپاشە ڕۆژدا بەرپرسیارن، بەسزاو تۆڵەی خۆیان ئەگەن .

وَٱتَّبَعُوا۟ مَا تَتْلُوا۟ ٱلشَّيَٰطِينُ عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَٰنَ ۖ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَٰنُ وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُوا۟ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَٰرُوتَ وَمَٰرُوتَ ۚ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ ۖ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ ۚ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ ۚ وَلَقَدْ عَلِمُوا۟ لَمَنِ ٱشْتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍ ۚ وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْا۟ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٢﴾

زۆر بەی زانایان لەگەڵ ڕێزم بۆیاندا ئەو ئایەتەیان بەجۆرێ مانا کردووە ناچێتە مێشکەوە بەگوێرەی دەستوری ئیسلام ، هەندێ لەوزانایانە ناوەرۆکی مانای ئەو ئایاتەیان بەستووە بەوەوە کە خەو پێدا کەوتنێکی میغناتیسی و کاری کردۆتە سەر مێشك و هەندێ شت ئەگێڕێتەوە بۆ دانیشتوان .هەندێ تریان لەماناکردنی ئەو ئایەتە دوا گفتو گۆی جوولەکەکان کەوتوون .ئەوانە هەموویان تینویەتی دڵی مرۆڤ ناشکێنن ،بەڵکو لەڕێزی

فریشتەکان کەم ئەکاتەوە لەو پڕو پوچانەوە وەرگیراوە پێی ئەوتریٚ ئیسرائیلیات جولەکەکان دروستیان کردوون و ڕازاندویانەتەوە و بلاویان کردۆتەوە ،گوایە ئەلێن فریشتەکان لەناو خۆیاندا کەوتنە وتوویژ و باسی ئادەمیزادیان ئەکرد و ئەیان ووت :بۆچی ئادەمیزاد خواپەرستی زۆر ناکەن و گوناهی زۆرئەکەن ؟خوای گەورە ئەفەرمویٚ ئەو سروشتەی ئادەمیزادی لێدروست کراوە ئەگەر لەئێوەیشدا بێت ئەوشتانەی ئەوان ئەیکەن ئێوەش ئەیکەن .فریشتەکان وتیان :ئێمە هەرگیز بیٚ فەرمانی تۆ ناکەین ،خوای گەورە فەرموی کەواتە دوو فریشتە لەنێو خۆتانا هەلبژێرن ئەیان نێرمە خوارەوە بۆسەر زەوی ،فریشتەکان لەنێو چاکانی خۆیاندا دوو فریشتەیان هەلبژارد کەناویان (هاروت و ماروت) بون خواناردنی بۆسەر زەوی لەبابل کەشارێکە لەعیراق دا نیشتەجێی کردن بەکورتی دەستیان دایە داوێن پیسی و عارەق خواردنەوە کوشتنی ناڕەوا بەو بۆنەوە خوای گەورە خەشمی لێگرتن ئەوانیش داوای لێبووردنیان لەخوا کرد لەنێو بیرێکدا سەربەرەو خوار هەلی واسیون هەتا ڕۆژی دوای ئەوفریشتانە پێیان سپێردراوە جادوو بەئادەمیزاد فێربکەن هەرکەسیٚ بچوبایە بۆلایان بۆفێربونی جادوو پێیان ئەوت هەتا بیٚ باوەڕنەبی بەخوا جادووت پیٚ فێرناکەین هەرکەسیٚ بیٚباوەڕی دەربڕیایە جادوویان فێر ئەکرد ئەیان ووت ئێمە بەلای خواین ئێوەمان پیٚ تاقی دەکاتەوە جادوو فێرمەبن و کاری پیٚ مەکەن و بیٚباوەڕ مەبن هەتا وەك ئێمەتان لێنەیەت ئەو چیرۆکە ڕاست نیە هەرچەندە زووربەی زانیان باسیان کردووە چونکە فریشتەکان بەوجۆرەی خوا ڕوونی کردۆتەوە بۆمان بیٚ فەرمانی خوا ناکەن ئیتر خوای گەورە بەو هەموو میهرەبانیەوە چۆن فریشتە ئەنێریٚ ئادەمیزاد فێری جادوو بکەن و لەخوا پەرستی لایان بدەن .

جوولەکەکان دژی پێغەمبەر(ﷺ) هەلسان و تەوراتیان کرد بەبەلگەی ڕاستی خۆیان کاتیٚ دەرکەوت قورئان و تەورات وەك یەك وان لەزۆرترین فرمانیاندا یەك سەرچاوەیان

هەیە هیــچ شــتێکیان بـۆ نەمایـەوە بۆیـە ئاژاوەیـە تریـان ســازکرد هــەڵیان بەسـت ڕووی ئاژاوەکەیان ئەم جارە وەرگێڕا بۆلای سولـەیمان پێغەمبەر .

زانایان بەسێ جۆر مانای ئەو ئایەتەیان کردووە :

١-﴿واتبعوا ماتتلوا الشياطين على ملك سليمان ﴾جوولـەکەکان فڕێیان دایە دوای پشتیان ئەونامەیە دوای شتێکیش کەوتبوون شەیتانەکانی ئادەمیزاد و جنۆکە ئـەیان خوێنـد بەسـەر دانیشتوانا بۆ بێ باوەڕ کردنیان لـەکاتی پاشایەتی سولـەیماندا هەرلـەبەر ئەوە بـەدرۆ بخەنـەوە پێغەمبەر کەئەیفەرموو سولـەیمان یەکێکە لـەفروستادەکانی خوا بۆیە هەندێ لــە مالومـەکان ئەیانووت زۆر سەیرە محمد گومانی وایە سولـەیمان پێغەمبەرە کەچی پێغەمبـەر نـەبوە بـەڵکو جادوگەر بووە بەوبۆنەوە باڵندەو باو جنۆکەو جڕوجانەوەر هۆگری بووبوون زمانی ئەوانی ئەزانی ئەی خستنە کار بەهۆی جادوەوە کــەزۆر بەباشـی ئـەیزانی جـادوویش بێباوەڕییـە بەخوا کەواتە جادو گەری بێباوەڕییەسولـەیمان یەکێکە لــەو بـێ باوەڕانـە خـوای گـەورە بەدرۆی خستنەوە و فەرمووی :

﴿ وما كفـر سـليمان ﴾ وەبـێ باوەڕنـەبووە بـەخوا سـولـەیمان بـەهۆی جادوگەریـەوە ،پێغەمبەرە پاك و خاوێنە لـەجادوگەری دورە کەواتە ئێوە درۆزنن و بوختان دەکەن .

﴿ولكن الشياطين كفروا ﴾ وەبەلآم شەیتانەکان بێبـاوەڕبوون کەجولـەکـەکان لــەوانن بەهۆی فێربوونی جــادوو فـێرکردنی بەدانیشــتوان ، هــەندێکیان وازیـان لـەتـەورات هێنـا دەستیان دایە فێربوونی جادوو نوسینەوەیی و ڕێکخستنی و فێرکردنی بەدانیشتوان .

﴿يعلّمون الناس السحر﴾ وەفێری ئەکەن بـەئادەمیزاد جـادوو هـەروەك خۆیـان فـێری بوبون وەئەیان ویست گومڕایان بکەن

﴿وما أنزل على الملكين ببابل هاروت وماروت ﴾ وە نەنێراوەتە خــوارەوە بۆســەر ئـەو دوو فریشتانە جادوو لـەبابل دا کەناویان هارووت و مارووتە بەهیچ جۆرە جادوێ .

﴿وما یعلمان من أحد﴾ ئەو فریشتانە فێریش ناکەن بەهیچ کەسێ چونکە جادوویان بۆنەهاتووە بێ فەرمانی خوایش ناکەن هەتا ئادەمیزاد فێری جادوو بکەن و ئامۆژگاریان بکەن وجادوویان لێ قەدەغە بکەن .

﴿ حتیٰیقولا إنما نحن فتنةٌ فلا تکفر ﴾ هەتا بڵێن بەو کەسە ئێمە تاقی کردنەوەی خواین بۆ ئادەمیزاد و بەلاین بۆیان کەواتە ئامۆژگاریتان ئەکین فێری جادوو مەبن دوایی تۆبێ باوەڕبێ بەخوا .

﴿ فیتعلمون منهما مایفرقون به بین المرء وزوجه﴾ دواتریش ئادەمیزاد فێربن لەو دوو فریشتانەو شتێ ئەوان جوێ بکەنەوە و بەو شتە نێوان مێرد و ژنەکەی ،وەك هەندێ لە درۆزن و بێباوەران نوشتەی خۆشەویستی ئەنوسن کەژنی مێردار جگە لەمێردەکەی خۆشبوێ بەکوردی پێی ئەڵێن چەورو شیرینی وەئەوانە نەنێراوەتە خوارەوە بۆ ئەو فریشتانە.

﴿وماهم بضارین به من أحد الاّ بإذن الله﴾ وەئەو ئادەمیزادانە زیان لەهیچ کەسێ نادەن بەهۆی جادووەوە مەگەر بەدەستور و فەرمانی خوا .

﴿ویتعلمون مایضرهم ولاینفعهم﴾ وەئادەمیزاد فێرئەبن شتێ زیان لەوان نادات وەسودیان پێناگەیەنێ فێربوونی ئەوشتە ئەمڕۆ و دوارۆژیش .

ئەو چیرۆکە جولەکەکان دروستیان کردووەو لەئەفسانەی خۆیانە ،بەبێ ئەوەی ماف و بنچینەی هەبێ ،بۆیە خوای گەورە بەخەشمەوە بەدرۆیان ئەخاتەوە و ئەفەرموێ :نەهاتۆتە خوارەوە بۆسەر ئەو دوفریشتەیە هیچ شتێك کەواتە ئەو چیرۆکە هەمووی درۆیە دەست هەڵبەستی جولەکەکانە جگە لەپرو پوچ شتی تر نیە وەك إمام فخری رازی ئاماژەی بۆ فەرمووە بەبیرو بۆچونی بەندە ماناکردنی ئەو ئایەتە بەوجۆرەی باسکرا لەڕاستی یەوە نزیکە خواش هەموو شتێ ئەزانێ .

زانای بەناوبانگ ئیبن و عەباس و ڕەبیعەو فەزلی کوڕی حەسەن و محمد ی کوڕی جەریری طبري و عبد الله ی کوڕی محمد ی نەسەفی و ئیسماعیلی کوڕی کەسیرو طنطاوی بەوجۆرە مانای ئەو ئایەتانەیان کردووە لەتەفسیرەکانی خۆیاندا خوایان لێ ڕازی بێت .

٢-بەم جۆرەی خوارەوە هەندێ لەزانایانی تر مانای ئەو ئایەتەیان کردووە وەلایان وایە فریشتەکان جادویان بەئادەمیزاد فێر کردووە ئەمەش دەقی ماناکردنەکەیانە {وە جولەکەکان دوای شتێ کوتون کەشەیتانەکان لەکاتی پاشایەتی سولەیمان دا کاریان پێ ئەکرد ئەیان ووت سولەیمان بێ باوەڕ بووە کاری خۆی بەهۆی جادووەوە بەڕێوە بردوە} خوای گەورە فەرمووی ( وە سولەیمان بێباوەڕنەبوە و بەلام شەیتانەکان بێباوەربوون و ئادەمیزادیان فێری جادوو ئەکردو فێری شتێکیان کردبوون هاتۆتە خوارەوەبۆ سەر ئەو دوو فریشتانەی بابل بوون ناویان هاروت و marووت بون ئەوفریشتانە جادوویان فێری هیچ کەسێ نەئەکرد هەتا نەیان ووتایە ئێمەتاقی کردنەوەی ئادەمیزادین دوای تۆ بێ باوەڕ مەبە بەخوا بەفێربوونی جادوو دوای ئێوە فێری شتێ بن بەهۆی ئەوشتە جیابکەنەوە نێوان مێردو ژنەکەی و ئەو جادوگەرانە زیان لەکەس نادەن مەگەر بەدەستوری خوا فێری شتێ ئەبن زیان بەوان ئەگەیەنێت سوودیان پێناگەیەنێ ).

﴿ولقد علموا لمن اشتراه ﴾ وەسوێندم بەخوا بەڕاستی جولەکەکان ئەیانزانی ئەوکەسەی جادوو بۆخۆی هەڵبژێرێ و نامەی خوا بگۆڕێتەوە بەجادووی شەیتانەکان کە قەدەغە کراوە لای خوا .

﴿ماله في الاخرة من خلاق﴾ بۆ ئەو کەسەنیە لەپاشەڕۆژدا هیچ بەشێ لەچاکە و ناچێتە بەهەشتەوە چونکە ئەوکاتەی جادووی بۆخۆی هەڵبژارد نرخی بۆخۆی نەهێشت .

بۆئاگاداری :وەنەبێ هەرجوولەکەکان بێ بەش بن لەبەهەشت بەتەنها بەڵکو ئەوکەسانەش دوای پروپوچی وێنەی نوسراوەکانی ﴿ شمس المعارف الكبرى ﴾بکەون و فاڵ

بگرنەوە و دەست بخوێننەوە وەك جوولەکەکان وان بێبەش ئـەبن لەچاکـەی دوارۆژ ئـەو دەست برە درۆزنانە ئەگەر بڕوایان بەخۆیان هەیە بۆ فالێ یان نووشتەیە یاجادویە بۆخۆیـان ناکەن گەرماو تۆزی هاوین و سەرماو سۆڵەی زستان هـەڵیان نـەقرچێنێ پـارەو پـوول لـە دانیشتوان وەرنەگرن و نەیان خەڵتێنن بائەمەیشمان لەبیر بێت ئەوکەســانەی بڕوایـان بـەو شتانە هەیە زۆر بەیان نەخوێندەوارو منالّ و ژنو ساویلکەو بێباوەڕەکانن .

﴿ولبئس ماشروا به أنفسهم لو كانوا يعلمون ﴾ وە خراپ شتێکە ئەو کەسانە خۆیانیـان فرۆشتووە بەو شتە .

ئەگەر ئەوان بزانن بەخراپی ئەوشتە و ئەو کارانەکردویانە،وەك پشتیان کردۆتە تەورات و ، فێربوونی کردنی جادوو هەر مرۆڤێ بەزانینی خۆی کار نـەکا وەك ئـەوان وایـە بگـرە ئەوان لەچاویانا نەزان ترن . ئەگەر بمانەوێت لەســەر مانـای ئـەو ئایەتـە بڕۆیـن و باسـی ئەفسانەو ئەو پرو پوچانە بکەین جولەکەکان دروستیان کردوون، کات ومـاوەی زۆرمـان پێویستە .بەڵام بەکورتی جگە لەومانایانە ئێمەنوسیومانە دەستکردن و جێگەی باوەڕنین .

٣-چاکترین ماناو لێکۆڵینەوە بۆئەو ئایەتە کرابێت ،و بچێتـە مێشـکەوە ڕێـك و پێـك بێت لـەگەڵ مانای ئیسلام دا ،زمانی دوژمنانی ئاینی پی ببڕێ ،جێگەی واتـەو ویتـە نـەبێت بەپێی بیرو بۆچونی بەندە ئەم مانایە مامۆستا {جواد مغنیە لەتەفسیرەکەیدا لـەنامـەی (النـواة فی الحیاة) دانراوی مامۆستای بەرز (العبیدی) مفتی موسڵ ئەفەرموێت (هەرچەندە لـەمانای ئەوئایەتە وورد ئەبوومەوە ماناکـەیم نەئـەزانی ،مانـاکردنی هیـچ زانایـەك تینویـەتی دڵـمی نەئەشکاند ،بەو جۆرە مانایانە هەریەکەیان دژی ئەوی تریان بوو ،بەجۆرێ مانایان کردبـوو ئەفسانەو پڕو پوچـی جولەکـەکانیان تێکـەڵاو یاسـای بـەرزو پـیرۆزی ئیسـلام کردبـوو، مەبەستی ئایەتەکەم نەئـەزانی بۆیـە وام بینـی خزمـەتی قورئـانی خـوا گرنگـترین پێویسـتی سەرشانم بێت . کەواتە مەبەستی ئایەتکە بـەم مانایـە ی خـوارەوە ڕوون ئەکەمـەوە :کاتـێ دەستەڵاتی سولـەیمان پێغەمبەرو پاشایی سولەیمان پەرەیسەند پاشـای بـابل چـاوی بڕیبـووە

سوریاو فلسطین کەداگیریان بکات کەچی لەجیاتی داگیرکردنیان ترسی زۆری لەسولەیمان پەیدا کرد چاری نەما دوو پیاوی زۆر زاناو بلیمەتی بۆ (بیت المقدس) نارد هەتا بەو زانیاریەی خۆیان ئاژاوەو درۆو دەلەسە بلاو، بکەنەوە بەجۆرێکی ژیرانە هەتا ناکۆکی بلاو بکەنەوە لەنێو جوولەکەکاندا پاشایەتی سولەیمان لەق و لۆق بکەن و لەنرخی سولەیمان کەم بکەنەوە ئەو دوو زانایە چوون بۆ قودس بوون بەجولەکە بەڕواڵەت بەفێڵ و فڕ دەستیان دایە پەرستنی خوا وازیان لەڕابواردنی جیهان هێنا بەناوی ئاینەوە خەڵکێکی زۆر لێیان کۆبوونەوە لەنەزان و نەخوێندەواران و نابەڵەدان لە یاسای ئاین کەبەساویلکەیی دوایان کەوتن ئەوانیش ئاواتیان هاتە دی دەستیان کرد بەبلاو کردنەوەی بیرو باوەڕی خراپ ، خستیانە دڵی دانیشتوان ئاژاوە نانەوە بۆسولەیمان ئەیان ووت سوولەیمان باوەڕی بەخوانیەو جادوگەرە ئەودوو زانایە بەڕواڵەت وەك فریشتە وابوون بەلام لەناوەڕۆك دا وەك شەیتان بوون ئەو شتانەی ئەوان ئەیان کرد وەك جادوو وابوو بۆ خەڵتاندنی ئادەمیزاد زۆر جاران بیستومانە بەمرۆڤی چاك ئەبێژرێ فریشتەیە بەمرۆڤی خراپ ئەڵێن شەیتانە }.

هەروەها مامۆستای پایە بەرزو بەڕێز العبیدی لەسەر فەرموودەکەی ئەڕوات هەتا ئەفەرموێ:مێژوو بۆمانی گێڕاوەتەوە(بخت النصر) ی پادشای بابل پاش سولەیمان فەلەستینی داگیر کرد (بیت المقدس) ی ڕووخان چوونی ئەو دووپیاوە زانایە کارێکی زۆر گەورەو گرنگی ڕەخساندبوو بۆ ئەوداگیرکردنە ڕێگەو شوێنی بۆساز کردبوو ، کەواتە ڕاناوی ﴿واتبعوا﴾ ئەگەڕێتەوە بۆلای جولەکەکانی مەدینە ،کەلە پێش ئەو ئایەتەوە (٦٢) ئایەت یەك لەدوای یەك لەسەر جولەکەکانی مەدینە هاتۆتە خوارەوە لەدوایش دا ئەگەر لە مانای ئەو ئایەتە وورد بینەوە کە پەیوەندی بەسوولەیمانەوە هەیە زۆر بەووردی لەسەر مانای

﴿ علی ملك ﴾ ڕاوەستین و بۆی داچین بەو هەموو ماناو بەڵگانەوە چوار دەوریان داوە ئەوت بۆئەزانرێ جولەکەکانی مەدینە دەستیان دابوە گێرەشێوێنی و درۆو دەلەسە بۆ پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ پروپاگەندەی تریان بلاو ئەکردەوە لەدژی پێغەمبەر﴿ ﷺ ﴾ هەروەك

جولەکەکانی پێشوو یاریدەی ئەو دووزانا نێراوەی بـابل یـان دا بۆڕوخـاندن و نەهێشـتنی دەستەلاّتی سولەیمان لەمەو پاش مانای ئەو ئایەتە ئەکەین بەو جۆرەی مامۆستای پایـە بـەرز العبیدی موفتی موسلّ کردوێتی ئەفەرموێ :

﴿واتبعوا ماتتلوا الشیاطین ﴾ وە جوەکانی سـەردەمی پێغەمبـەر دوای شـێ کـەوتبون شەیتانەکان ئەیان خوێند ، هەندێ لەو شەیتانانە بوون ئەو دوو مرۆڤـە زانایانـەی بـابل کـە خۆیان دەرئەخست بە دەرخستنی پیرۆز، ئەوان لە ناوەرۆکا شەیتان بـوون و بـێ بـاوەڕ و دژی توانا و پاشایەتی سولەیمان بوون لە سەردەمی پاشایەتی ئەوا، وەك خودا دەفەرموێت:

﴿ علیملك سلیمان ﴾ یانێ بەڕاستی جولەکەکانی مەدینە فێلّ و درۆیان بەکار دەهێنـا لە دژی پێغەمبەر ﴿ ﷺ﴾ هەروەك پێشـووکانیان لە جولەکـە بـەکاریان ئـەهێنا لـە دژی سولەیمان لە کاتی پاشایەتی سـولەیماندا، ئـەیان ووت سـولەیمان بـێ بـاوەڕە بـە خـودا و جادووگەرە.

﴿ و ماکفر سلیمان و لکن الشـیاطین کفـروا﴾ وە سـولەیمان بـێ بـاوەڕ نەبوەبـەلّکو شەیتانەکان بێ باوەڕ بوون، ئەو شتانەی لە دژی سولەیمان دروسـتیان کـرد بـۆ، ئەیاندایـە پالّی سولەیمان، هەموویان درۆ بوون، دەستکردی درۆینەی خۆیان بوو.

﴿ یعلمـون النـاس السـحرَ و مـا أنـزل علـی الملکـین ببـابل هـروتَ وَمَـروتَ ﴾ ئادەمیزادیان فێری جادوو شتی پوچ و درۆینەیان ئەکردن و، نەنێراوەتە خوارەوە بـۆ سـەر ئەو دوو پیاوە زانایانە لە بابلدا کە بە ڕوالّەت خۆیانیان دەرئەخست بە وێنەی فریشتە لـە پیرۆزی و پاکیداهیچ شتی فێریان کرابێ لەلایەن خواوە . هاتنـە خـوارەوە لێرەدابـە مانـا سروش نییە لەلایەن خوداوە بەلّکو بە مانا فرێدانی شتێکە بخرێتە نێو دلّەوە.

﴿و ما یعلمان من احد حتی یقولا إنَّما نَحنُ فِتنة فلا تکفـر ﴾ ئـەو دوو پیـاوە بـە نـاو فریشتانە ئەیان ووت. بە درۆ و بە دووڕوویی، فێری هیچ کەسێ ناکەین جادوو هەتا نەیان ووتایە: بەڕاستی ئێمە تاقیکردنەوەی خوایین، دووایی تۆ بێ باوەڕ بە بـە فـێربوونی جـادو،

هەروەك درۆوزنانی دەست بڕی مرۆڤی ئەم سەردەمە دەست دەکەن بە نوسینی نووشتەی خۆشەویستی و لیّ بێزان بڕوایان وایە راستە و کاری خۆی دەکا و ئەڵێن بەو کەسە فێری دەست بڕینیان ئەکەن: تۆ خۆت بپارێزە لەوە کە نوشتە بنوسی بۆ جیا بوونەوەی مێرد و ژنی راستی، یا بۆ خۆشەویستی ژنیّ بۆ جگەی مێردی خۆی ، بۆ ئەوە ئادەمیزاد بخەنە گومانەوە کە بەڕاستی زانیاری ئەوان خواییە، پیشەکەیان گیانیە ئەوان نیاز پاکن، هەر وەك هەموو دەست بڕ و مفتە خۆرەکان و نوشتە نوسە درۆزنەکان و فاڵچییەکانی ئەم سەردەمە، خۆیان بە خواپەرست نیشان ئەدەن بە ساویلکەکان.

وە دەستیان ئەبڕن و نامەیان بۆ ئەگرنەوە، نوشتەی دڵداریان وئاڵۆزیان بۆ ئەنوسن برایارانی موسڵمان: دەستم داوێنتان خۆتانیان لێی بپارێزن و سامانی خۆتانیان مەدەنیّ.

﴿ فيتعلمون منهما ما يفرقون به بين المرء و زوجه ﴾ دووایی ئادەمیزاد فێر ئەبوون لەو دوو زانایانە کە خۆیانیان وەك فریشتە دەرئەخست شتیّ ئەوان جیا بونەوەی مێرد و ژن لەیەك جویّ بکەنەوە بە هۆی ئەو شتەی، وایان ئەژمارد ئەو جیابوونەوە ئەبیّ ، پڕ بەپێستی خۆی وەك ئادەمیزادی درۆزن دەست ئەکەن بە نووسینی نامەی خۆشەویستی و ، ئاڵۆزی بە گوێرەی گومانی خۆ کاریگەرە.

بە کورتی ئەو ئایەتە ئاماژە بۆ ئەوە ئەکا کە بەڕاستی بەڵگەنیە لەسەر دابین کردنی کاریگەری جادو یا ناکاریگەری; چونکە ڕستەی پێشوی فەرمودەی خوا فەرماندانێکی بێگومان نییە بۆ دابین بوونی جیابوونەوەی نێوان مێردو ژن لە هەموو ڕویکەوە، بەڵکو ماناکەی ئەوەیە فێری شتیّ ئەبن دانراوە لەبەر جیابوونەوەی ژن و مێرد لە یەکتری، ئەوە ناگەیەنیّ جیابوونەوەکە ئەبیّ.

﴿ و ماهم بضارين به من أحد إلاّ باذن الله ﴾ وە ئەو کەسانە توانای ئەوەیان نییە زیان بدەن لە هیچ کەسیّ مەگەر بە دەستور و فەرمانی خوا ، نوشتە و فاڵ و خوێندنەوەی

دەست درۆ یە زیان گەیاندن و سود بەخشی پەیدا ناکەن، ئەگەر توشی زیان ببن بە ڕێکەوتە و هۆی دەرەوەی بۆ ڕخساوە.

﴿ و یتعلمون ما یضرهم و لا ینفعهم ﴾ وە فیری شتێ ئەبن زیان بە خۆیان ئەگەیەنێ و سودیان پێ نابەخشێ کوتومت درۆیە.

﴿ و لقد علموا لمن اشتراه ماله في الآخرة من خلاق ﴾ وە بە ڕراستی ئەوان ئەزانن کەسێ جادوو درۆ بۆ خۆی هەڵبژێری لە ڕۆژی دواییدا لای خوا هیچ بەشێکی لە چاکەدانییە.

﴿ و لبئس ما شروا به انفسهم ﴾ وە خراپ شتێکە خۆیانیان بەو شتە فرۆشتووە، شتی خراپ و پەستیان هەڵبژاردووە بۆ خۆیان (لو کانو یعلمون) ئەگەر بە خراپی خۆیان بزانن.

فەرمودە زانانی پایە بەرز مامۆست (العبیدی ) کۆتایی پێ هات، هەموو شێ هەر خوا ئەزانێ، خوا لە ئێمە و لە مامۆستا (العبیدی) و هەموو زانایانی موسڵمان خۆشبێ.

بۆ زانین: (السحر) یانێ جادوو، مانای چ شتێکە؟ جادوو شتێکی ناسك و نهێنییە ئادەمیزاد بەکاری ئەهێنێ لەسەر پەت و گوریس و دار بۆ دەرخستنی کاری نارەوا و پڕوپوچ و بۆش لە شێوەی ڕاستیدا، قورئانی یرۆز لە زۆر جێگەدا باسی جادووی کردووە، بە تایبەتی لە باسی موسا و فیرعەوندا، جادوو لە بیرو باوەڕ و کەلەپوری نارەوای گەلانە لە کۆنەوە.

هەموو کاتێ جێگە بۆ گیانی نادیاری مرۆڤ فراوان کرابێ، لە کاروباری نهێنی کۆڵابنەوە، بە بێ فروستادەکانی خودا، دەرگای فراوانیش بۆ جاددوو قڕوفێل کراوەتەوە ، زانایانی ئایینی ئیسلام لەسەر جادوو نووسیویانە، وەك ئیبنو خەلدوون لە پێشەکی مێژوەکەیدا، وە ئیبنو نەدیم لە فیهروستا، فەرموویانە: جادوو وا ئەبێ خاوەنی سودە و وایش ئەبێ خاوەنی زیانە ئادەمیزاد سودی لێ وەردەگرن، هەروەك توشی زیان ئەبن پێی،

بەڵام یاسانووسەکانی ئیسلام و دەستوور دانەرەکانیان لـە ڕوی قورئـان و فـەرموودەکانی پێغەمبەرەوە بە گشتی فەرمانیانداوە بە قەدەەکردنی جادوو.

بە جۆرێکی کورت ئەکرێ بەم بەشانە خوارەوە، هەرچەندە بەشەکانیان زۆرە:

١-جادوو ماری ئەژدیها و دووپشك گرەکان و دەستەڵاتیان بەسەریانا و ڕام کردنیان، ئەو جادووە بەکار هێنراوە لە ڕۆژهـەلاتا بـە درێژایـی سـاڵ هـەر لـە کۆنـەوە، ئێسـتایش ڕۆژئاواییەکان بەکاری ئـەهێنن بـۆ ڕابـواردن و کـات کوشـتن، یـا بـۆ دوورخسـتنەوەی جرو‌جانەوەری خشۆك لـە ئادەمیزاد و ئاژەڵ، مارگرەکانی هیندوسـتان توانیویانـە زاڵ بـبن بەسەر (کۆبرا)دا کە خراپترین ماری ژەهراویە، ڕامی دەکەن بە هـۆی لـێدانـی زۆڕنایـەکی تایبەتی، هەروەها توانراوە هەموو مارێکی ژەهـراوی بگـیرێ بـە هـۆی جـۆرە هـاتوچۆی تایبەتی بە شتێکی ڕوناکی دەر لـە ڕوی مارەکەدا، هەتا ڕامی دەکەن، هەندێ جار مارەکان دگانیان دەرئەهێنن، هەتا پێیانەوە نەدا، ئەو جۆرە جادووە لە پێشوەکانەوە بۆ ئەمانەی ئێستا ماوەتەوە، هەندێ جاریش مار بەیاری کردن لـە گەڵیا ڕام ئەبێ هەتا ماوەیە.

٢- جادوی مرۆڤە بەهێزەکان و پروپـاگندە چییـەکان بـە هـۆی چاویانـەوە تەماشـای ئادەمیزادیان بکردایە توشی زیانیان ئەکردن، وایان دانابوو بیرکردنەوە مرۆڤ لـە هـەندێ ڕوداودا بە خۆشی و یا بە ناخۆشی کار ئەکاتە سەر مرۆڤ، وەك بیرکدنەوە لـە خەفـەت و خۆشی و ئارام و ترس و دڵداری کار ئەکاتە سەر مرۆڤ بۆ توشبوونی خەفەت و خۆشـی و ئارامی و ترس و پەرستشی دڵدارەکەی. کەواتە دروسـتە گیـانێکی بـەهێز و نـهێنی لـە کەسێکەوە کە وازی لـە کاری ئاسایی و ئارەزوی جیهانی هێنابێ بە جۆرێکی ژیرانەی فڕ و فێلبازی کار بکاتە سەر جگەی خۆی و هەڵیان سوڕێنێ بە گوێـرەی ویسـتی خـۆی، ئـەو جۆرە کارانە لـە کەسانێ ئەوەشێنەوە جادووگەرن و مێشکی ئادەمیزاد تێك ئەدەن، هەندێ جاریش ئەڵێن: ئێمە مرۆڤی خواین و بە ناوی گـەورەی خـواۆ جنۆکـە ڕام ئەکـەین و مـل کەچمان ئەبن، مرۆڤی ساویلکە ترسـیان لـێـی پـەیدا ئـەبێ و بڕوایـان پـێ ئەکـەن کـاری

نارەوایان پێ ئەکەن و دەستیان ئەبڕن، پارە و پولیان لێی ئەکێشیتەوە، خۆیانیان لێی ئەگۆڕن بە هۆی جۆرە بەرگێکەوە، ریشی تایبەتی و میکیاج و دیکۆری شیاو ئارایشتی دەست کرد بۆ خەڵەتاندنی مرۆڤی ساویلکە ئەو کەسانە ئەبنە جێگەی خەشمی خوای گەورە.

٣-جادوی کلدانییەکان لە کۆنەوە، کە ئەوانە ئەستێرە پەرست بوون، گومانیان وابو ئەستێرە سەرچاوی نەگبەتی و بەختیارین، لە جادووەکانیانا بخور دەیان ئەسوتان و دووکەڵیان ئەکرد، جۆرە پۆشاکێکیان ئەپۆشا بە گومانی خۆیان شیاوبووایە لەگەڵ ڕەنگی ئەستێرەکان، بەو بۆنەوە کاری نائاساییان ئەکرد.

تێبینی: جادووگەر ئەو شتەی نیشانی ئەدا بە ڕواڵەتە و بە فێربوونی هەندێ کارە بە هۆی پەلەکردنی دەستی، لە ناوەڕۆکدا درۆیە و ئەو شتە وانییە، بەڵام موعجیزەی پێغەمبەران و کەراماتی دۆستانی خوا ئەوەی بە ڕوواڵەت نیشان ئەدرێ لە ناوەڕۆکیشدا ئەو شتەیە.

٤- جادوی ئەو کەسانەی داوای یارمەتی ئەکەن لە گیان لەبەری سەر زەوی، وەك جنۆکە ئەو جۆرە جادووە بەهێزترین جۆری جادووە، بۆ پروپاگەندە چییەکان و بۆش و پوچ پەرستان لەم سەردەمەی ئێمەدا باوی هەر ماوە.

٥- جادووی ئەو کەسانە، چەندین کەرەسەی هاتوچۆ پێکراو لەیەك ئەدەن بە شێوەیەکی ئەندازیارانە و هونەری سەرسوڕێنەر لە زانستی کیمیادا، وەك ئاگری فسفۆر لە نێو ئاودا نیشان بە ئامیزاد ئەدەن، وایان پیشان ئەدەن ئاگر لە ئاودا بەکار ئەهێنن و ناکوژێتەوە، ئەوریشمی بەردی چلکن لەسەر ئاگر دائەنێن و ناسوتێ و خاوێنیش ئەبێتەوە، بەو بۆنەوە ساویلکەکان ئەخەڵەتێنن، ئەو شتاە بە هۆیهێزێکی نهێنی هەر بۆ ئەوان ڕام دەبن.

٦- جادووی هاتووچۆکەرانی دڵ یس لە نێو ئادەمیزادا، بە هەڵبەستنی کاری ناڕەوا و دەستکرد بۆ تێکدانی نێوانیان بە جۆرێکی نهێنی و زۆڵانە، هەتا ئاژاوە دروست ئەبێ لە نێوانیانا وە دەست ئەکەن بە کوشتن و لێدانی یەکتری، بە بێ هۆی زانراو، بە خۆیان نازانن وا ئەزانن هەریەکەیان خۆیان لەسەر ڕەوان، لە ئەنجامدا بە دەیان کوژراو و سەرشکاویان لێ پەیدا ئەبێ، بە هەزاران دۆست ئەبن بە دوژمنی یەکتری.

جادوو جۆری زۆرە ناتوانین هەموویان باس بکەین ، مرۆڤی ژیر و ئایین پەروەر و ئاگادار لە یاسای قورئان و فورمودەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بە ئاسانی ئەتوانن خۆیانیان لێی بپاریزن، هەندێ تر لە جادوگەر هەن ئەوانە زیانیان لە هەمووان زۆرترە، کەسانێ هەن نوشتە ئەنووسن و هەندێ لە قورئانی پیرۆز بە خوێن ئەنوسنەوە لە خوێنی گیانداری کە لە کەسانی ساویلکە داوای ئەکەن و سەری ئەبڕن، بە گومانی خۆیان لە ڕێگەی خوادا بەکاری ئەهێنن و بخۆریش ئەسوتێنن، زۆر سەیرە زۆربەی ئەو کەسانە نوێژ و ڕۆژ و فەرمانی خوا بەجێ نایەرن، بە گومانی پیسی خۆیان بەو نوشتەیەوە بە یاریدانی جنۆکەکان دەردەداران و فێداریان چاك ئەکەنەوە، زۆربەی ئەو کەسانە ئەچنە لای ئەو دەست بڕانە بریتین لە ژن و نەخوێنەوار و بێ باوەڕان بە ئایین، ئەو کەسانە هەموویان بە جادووگەران و نوشتە بۆ نووسراوان بێ باوەڕانەوە ئیسلام لەوانەوە دوورە .

بۆ زانین: فەرمانی ئایینی ئیسلام بە بێ جیاوازی لە هەموو کۆمەڵ و خاوەن بیریان بە گوێرەی دەرهێنانی بیرەکەیان لە قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بەم جۆرەی خوارەوەیە: بە لای پێشەوا ئەبی حەنیفەو پێشەوایان مالیك و ئەحمەد جادوو بێ باوەڕیەو جادووگەرە بە موسڵمان دانانرێ، هەندێ لە زانایانی سەر بە ئەبوحەنیفە ئەڵێن: ئەگەر فێری جادوو بێ بۆ ئەوە خۆی بپارێزی لە جادووگەران و ئەنجامی جادووەکەیان و خۆیانی لێی دورخاتەوە بە فێربوونی بێ باوەڕ نابێ، بەلای هەموویانەوە کەسێ بڕوای وابێ جادوو لە خۆ یا دروستە یا سود بەخشە بە بێ باوەڕ دائەنرێ.

پێشەوا شافعی ئەفورموێ: ئەگەر کەسێ فێری جادوو بو داوای لێ ئەکرێ: ئەو جادووەی خۆیمان بۆ ڕوون بکەرەوە، ئەگەر بێباوەڕی تێدا بوو، وەك ئەوەی ئەستێرەکان ئەتوانن هەموو شتێ بکەن، یا کاری ناڕەوا بەڕەوا دابنێت، ئەگەر ئاوا بوو ئەو کەسە بە بێ باوەڕ دائەنرێ، ئەگەر وانەبوو بەبێ باوەڕ دانانرێ، مەگەر بلێ: فێربوونی جادوو دروستە، جادووگەر بە جادووەکەی مرۆڤی کوشت ئەکوژرێتەوە، ئەوەی جێگەی باوەڕ بێ جادووگەر پەشیمان بوونەووەی لێ وەرئەگیرێ.

نوشتە ئەگەر ئەخوێنرایەوە و مانای ئەزانرا و، بۆ کارێکی ڕەوا نوسرابوو دروستە، هەرچەندە واچاکە نوشتە نەنوسرێ، چەنکە نە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾، وە نەهاوڕێکانی نەیان نوسیوە و، فەرمانیان نەداوە، بەڵام بە دڵ پاڕانەوە بۆ دەردەداران و داواکەران دروستە، و لەو جۆرەیە کە ئەگێڕرێتەوە لە هەندێ هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ کە چەندین سەر مەڕیان لە مرۆڤێ وەرگرت کە دووپشك پێوەدا بوو بۆ ڕزگاربوونی لە ئازار و نەخۆشی ڕوداوەکەیان بردە خزمەت پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرموی: دروستە، ئەویش بە پاڕانەوە بو نەك بە نووسین، ئەگەر مانای نوشتەکە نەئەزانرا، یا نەئەخوێنرایەوە، یا بۆ کارێکی ناڕەوا نوسرابوو، وەك چەورو شیرینی بۆ جوتبوونی دوو کەسی لەیەك قەدەغەکراو، ئەوەیان دروست نیەە، بڕواپێ بوونی بێباوەڕییە، پەشیمان بوونەوەی لێی وەرئەگیرێ وەك جادووگەر.

بەستنی ژن و پیاو لە یەکتری، فوکردن بە گرێدا بۆ ئەو مەبەستە، یا بۆ هەر مەبەستێ بێ، بنچینەی ڕاستی نییە بەڕاست دانانرێ، هەروەك گومان بردن بۆ جوت کردنی دوو کەسی لە یەك قەدەغە، وە یا پچڕانی مێرد و ژن، ڕاکێشانی فریشتە و جنۆکە بۆ کاری نهێنی و چاککردنەوەی فێدار، ئەوانە هەموویان قەدەغەن، بە دروست زانینیان بێ باوەڕییە.

بەڵام پاڕانەوە لە خوا بۆ ڕزگار کردنی نەخۆشان و دەردەداران، بۆ ئەو کەسانەی توشی کاری نالەبار بوون، ئەوانە هەموویان ڕاستن و خاوەن بەڵگەن، بە تایبەتی پاڕانەوەی

مرۆڤ بۆ خۆی لە خوای گەورە، بۆ کاری ڕەوا و نەهێشتنی هەموو ڕوداوێ هەلگرتنی گرانیێ، بۆ ئاسانکردنی کاروباری، ئەوانە هەموویان ڕاستن، وەك خوا ئەفەرموێ: (فاني قريب اجيب دعوة الداعي اذا دعان) بە ڕاستی من نزیکم لێتانەوە، من وەلامی داواکاریی داواکەران ئەدەمەوە، هەر وەك خوێندنی قورئان و فوکردن بە دەستا لە کاتی خوێندنی هەندێ ئایەتا دروستە و خاوەنی بەلگەیە.

پاش ئەوەی خوای گەورە خراپەی جولەکەکانی ژمارد و بە درۆ و دەلەسەیان لە دژی پێغەمبەر ڕون کردەوە فەرمووی: بێباوەڕی و لاساری ناگاتە فریاتان، ئەفەرموێ:

وَلَوْ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَمَثُوبَةٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ خَيْرٌ ۖ لَّوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٣﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقُولُوا۟ رَٰعِنَا وَقُولُوا۟ ٱنظُرْنَا وَٱسْمَعُوا۟ ۗ وَلِلْكَـٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٠٤﴾ مَّا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ وَلَا ٱلْمُشْرِكِينَ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْكُم مِّنْ خَيْرٍ مِّن رَّبِّكُمْ ۗ وَٱللَّهُ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿١٠٥﴾

﴿ و لو انهم امنوا ﴾ وە بەڕاستی ئەگەر جولەکەکان باوەڕیان بهێنایە بە قورئان و پێغەمبەر، بەو جۆرەی تەورات فەرمانی پێدابون لە خۆشیدا ئەبون و بە خۆشی ئەژیان و ئەحەسانەوە.

﴿ واتقوا ﴾ وە خۆیانیان لە جادووگەری بپارێزاییە، وازیان لە تەورات نەهێنایە، دوای جادووگەران نەکەوتنایە و بێ باوەڕ نەبوایە بە جادوکردنیان بۆ تێکدانی نێوان ژن و مێرد.

﴿ لمثوبة من عند الله خير ﴾ بە ڕاستی پاداشتێ لە لایەنی خوا چاکترە لە هەموو شتێ، چونکە بەردەوامە پاداشتی خودا.

﴿ لو كانوا يعلمون ﴾ ئەگەر ئەوان بیزانن و باوەڕیان بەو پاداشتە ببوایە، بەڵام نەیانزانی و بڕوایان پێ نەکرد ، یانێ ئەگەر بڕوایان بهێنایەو ، خۆیانیان بپاریزایە پاداشتیان ئەدرایەوە لە لای خوا کەچاکتر بو لەوەی خۆیانیان پێ فرشت، بە پایە و پلەی بەرز ئەگەیشتن، ئەو ئایەتە ئەو کەسانە ئەگرێتەوە فێری جادوو ئەبوون لەو فریشتانە بە ڕواڵەت فریشتە بوون. ئەوانەیش ئەگرێتە دووای ئەو پڕو پوچانە کەوتبوون کە شەیتانەکان ئەیان گێڕایەوە لە کاتی پاشایەتی سولەیمان، وازیان لە تەورات هێنابوو، دووای فڕو فێڵی ئەوان کەوتبوون.

کاتێ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ موسڵمانانی فێری یاساو فەرمانی خوا ئەکرد، ئەیان ووت بە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ (راعنا) یانێ چاوەڕووانی ئێمە بکە و لەسەر خۆبە لەگەڵمان لە کاتی فێرکردنمان هەتا لێی تێبگەین جولەکەکان کە ئەوەیان بیست، بە هەلیان زانی ئەو ووشەیە بەکار بێنن بۆ گاڵتە پێ کردن بە پێغەمبەر وە پێ بکەن، زۆر جاران ڕویان ئەکردە پیغەمبەر و ئەیان ووت: (راعینا) ئەو ووشەیە بە زمانی عیبری یانی نەفام، مەبەستیان ئەوە بو نەفامی بدەنە پاڵ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ سەعدی کوڕی عوبادە ئەو وشەیە بە زۆری لە جولەکەکانەوە ئەبیست، لە مەبەستەکەیان تێگەیشت، بە جولەکەکانی ووت: ئەی هووژمنانی خوا : یاخوا نەفرەتی خواتان لێبێ، سوێند بەو کەسەی منی بە دەستە لە هەر

کەسێکتان ئەو ڕستەیە ببیسم و بڵێن: بە پێغەمبەر ئەدەم لە گەردنتان، جولەکەکان ووتیان: ئەی بۆ ئێوە خۆتان ئەیڵێن: بۆیە خوای گەورە وتنی ئەو ڕستەیەی قەدەغە کرد لە موسڵمانان فەرموی: لە جیاتی (راعنا) بڵێن: (أنظرنا) هەتا ئەو تاوانجە دوور بخرێتەوە، بۆیە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە. فەرمووی:

﴿ یا ایها الذین امنوا﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە بە پێغەمبەر و بە قورئان.

﴿ لا تقولوا راعنا﴾ ئێوە مەڵێن لە کاتی کفوگۆ کردنتان لەگەڵ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ (راعنا) واتە چاودێریمان بکە، نەك بەو ڕستەیەی ڕێگە بۆ تاوانجی جولەکەکان بکرێتەوە.

﴿ و قولوا انظرنا﴾ وە ئێوە بڵێن: تۆ تەماشای ئێمە بکە و لەسەر خۆ بە لەگەڵمان، هەتا ڕزگارتان بێ لە تاوانجی جولەکەکان، ڕستەی (راعنا) وە (انظرنا) لە زمانی عەرەبیدا مانایان یەکە، بەڵام بە ڕستەی (انظرنا) جولەکەکان دەم کوت ئەبن و بۆیان جوت نابێ ئەو هەڵوێستە نارەوایە بەکاربهێنن.

﴿ واسمعوا ﴾ وە ئێوە گوێ بگرن و فەرمودەی خوا بە باشی وەربگرن و بە جێی بێنن و مەڵێن : (راعنا) هەتا سەر نەکێشێ بۆ لای جنێودان بە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ڕێزی پێغەمبەر بگرن و شیرینترین ووشەی بۆ بەکار بهێنن، چاکترین مانای بۆ هەڵبژێرن.

﴿ و للكافرين عذاب اليم ﴾ وە بۆ بێباوەڕان هەیە سزای ئازاردەر لە پاشاڕۆژدا. بە تایبەتی بۆ ئەو جولەکانە لاقرێتان بە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەکرد.

بۆ ئاگاداری: یەکەمین بانگکردن لەم سورەتەدا بۆ هەموو ئادەمیزاد بۆ لای ئاینی ئیسلام و پەرستنی خوا، فەرموی: (ياايها الناس اعبدوا ربكم الذي خلقكم) ئەی ئادەمیزاد ئێوە بپەرستن پەروەردەکەری ئەو تۆی خۆتان ئێوەی دروست کردووە.

دوو هەمین بانگ بۆ کوڕانی ئیسرائیل بو کە گەورەترین هۆزبون، گاورەکانیش لەوانبوون، فەرمووی بەوان بیریانی خستەوە لە چەوسانەوە ڕزگاری کردن، چاکەی

زۆری لەگەڵ کردن، فەرموی: (یـا بـني اسـرائیل اذکـروا نعمـتي علیکـم) ئـەی کوڕانـی ئیسرائیل بیری من بکەنەوە بە بەخشینم بە ئێوە و ڕازاندم بەسەرتانا چاکەی خۆم.

سێهەمین بانگ بۆ ئۆمەتی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ کە لەم ئایەتەدا بانگیان و ئەفەرموێ: (یاأیها الذین امنوا لا تقولـوا راعنـا) بـەو ئایەتـە بانگیـان ئـەکا و موسـڵمانان فـێری دەسـتوری ئیسلامیان ئەکا، فێری چۆنیەتی موسڵمان بونیان و باوەڕ هێنانیان ئەکا.

ئەو سێ بانگ کردنە بەو جۆرە شتێکی سروشتی و ئاساییە ، ڕێـك و پێکـە بـۆ بـانگ کردنیئادەمیزاد ، ئەبێ هەروایشبێ ، یەکەمین جـار بـۆ ئـادەمیزاد دووهـەم جـار بـۆ ئـەو کەسانەی باوەڕیان هێناوە بەزیندووبونەوە بانگ بکرێن و بیریان بخاتەوە ئەو چاکەو ڕێـزەی خوا لەگەڵیانی کردووە ، سێهەم جار بانگی ئەوانە بکرێدوایی باوەڕیان هێناوە دەسـتوری خوایان پێ فێربکرێ ، ئەوانەیش کەبە و جۆرە دارژاون لەخۆش خوانیەکانی قورئانی پیرۆز کە لە سەرەوە بۆ خوارەوە دەست پێ بکرێ .

لەو ئایەتەوە (٢) دوو فەرمانی گەورەمان بۆ دەرئەهێنرێ ، پێویستە بەجێیان بهێنین :

١- خۆمان بپارێزین لەتاوانج گرتنە ئادەمیزاد بەئاشکرا و بەنهێنی و بەهەر شێوەیە بێ ، مەگەر سودێکی پێویستی ئایینی پاڵمان پێوە بنێ بۆ ئـەو توانجـە ، بۆیـە پێغەمـەر ﴿ ﷺ ﴾ فەرموی : موسوڵمان ئەوەیە موسوڵمانان لەدەسـت و لـەزمانی ڕزگـار و حەسـاوە بـن و لەزیانیان نەترسن وتاوانجی قەدەغەیان نەگرنە خۆیان و ناموسیان .

٢- پێویستە هەموو ڕێگەیە ببەستین لەواتەووتەی ناڕەوای وا مەترسی لێ بکـرێ ، بـەو هۆیەوە تووشی شتێکی قەدەغە لێکـراو بـین ، بۆیـە خـوای گـەورە ئەفـەرموێ لەئایـەتی (١٠٨) سەدوهەشت لەسـورەتی ئەلئـەنعامدا ﴿ وَلَا تَسـبوا الذیـن یَدْعـونَ مِنْ دُون الله فَیَسبوا الله عدواً بِغَیر عِلمٍ ﴾ ئێوە جنێو مەدەن بەو کەسانەی ئەوتۆ جگەی خوا ئەپەرستن ، توانج بگرنە خوداکانیان ، دوایی ئەوان جنێو بدەن بەخوا بەستەم و دوژمنانە بەبێ زانـین و دانش ، هەموو ڕێگەیە بگیرێ لەوانە لەلای گـۆڕی پێغەمـەران و پیـاو چاکانیـاندا نوێـژو

خواپەرستی ئەکەن . نەوەك ڕۆژێ لەڕۆژان سەر بکێشێ بۆلای پەرستنیان و گەڕان بەدەوریانا ، دارو بەردەکەی ماچی بکەن ، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ئەفەرموێ : { إشتد غضب الله على قومٍ اتخذوا قبور أنبيائهم وصالحهم مساجد } توند و سەختە خەشمی خوا لەسەر کۆمەڵێ گۆڕی پێغەمەرەکانیان و پیاو چاکەکانیان بکەن بەمزگەوتەکان بۆ پەرستنی لەناویانا . پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ئەفەرموێ { اللهم لا تجعل قبري وثنا يعبد }ئەی خوایە تۆ گۆڕی من مەکە بە بت بپەرسترێ .

هەندێ لەجولەکەکان دۆستایەتی و خۆشەویستی خۆیانیان دەرئەبڕی بۆ موسوڵمانان ئەوانیش بڕوایان پێ ئەکردن ، وایان ئەزانی ڕاست ئەکەن و چاکە ئەمانیان ئەوێ ، خوای گەورە نهێنی پیسی دڵیانی دەربڕی ، درۆکانیانی دەرخست کە خۆیانیان پێوە ئەنوان کە ڕق و کینە تێکەڵاوی دڵیان بووە ئەفەرموێ :

﴿ مايَوَدُّ الَّذينَ كفروا مِنْ اَهلِ الكِتابِ وَلا المشركين ﴾ پێیان خۆش نیە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە لەخاوەن نامەکان لەجولەکە وگاوور ، پێیان خۆش نیە ئەو کەسانەی هاوبەشی بۆ خودا ئەنێن .

﴿ أنْ يَنزل عِلَيكُم من خير من ربكم ﴾ کە بنێردرێتە خوارەوە بەسەر ئێوەدا هیچ چاکەیە لەلایەن پەروەردەکەری خۆتانەوە ، ئەیانەوێ ئێوە تووشی چاکە نەبن ، پێیان ناخۆشە پەیامی خوا بۆ ئێوە بێتە خوارەوە ، ئەو ئایەتە بەڵگەی ڕونە لەسەر ئەوەی خوای گەورە قەدەغەی کردوە کە موسوڵمانان بڕوا بەدوژمنی خۆیان بکەن ، گوێیان لێ نەگرن ، ئامۆژگاریان لێ وەرنەگرن ، هەر شتێ ئەوان بیلێن فڕوفێڵە شتێکی سەرسوڕێنەر نیە جوولەکە و گاور و بت پەرست دووڕوەکان و دوژمنانی ئاینمان لایان ناخۆشبێ قورئان بێتە خوارەوە بۆ پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ ، بەتایبەتی لەلایەن خوای گەورەوە ڕێزی لێ بگیرێ و ڕێزبدا بەموسوڵمانان و ڕانمویان بکا . هەروەك خوێن مژان و و داگیرکەرانی ئەم سەردەمە

پێیان ناخۆشە گەلانی ژێردەستەیان بەرەو پێش کەوتن برۆن و رزگاریان ببێ و فێری زانین و زانست وپیشەسازی بن .

﴿والله یختص برحمته من یشاء﴾ وە خوا جوێ ئەکاتەوە بۆ پێغەمەرایێتی خۆی هەرکەسێ ئارەزۆی هەبێ، هەڵی ئەبژێرێ و ئەیکا بە پێغەمەر و قورئانی بۆ ئەنێرێ، ئەو کەسەیش موحەممەدە. جگەی خوا مافی ئەوەی‌نیە سروەش بەنێرێ بۆ کەسێ خۆی ئارەزۆی هەبێ.

﴿والله ذو الفضل العظیم﴾ وە خوا خاوەنی گەورەیی و رێز و چاکە کردنە، هەرکەسێ خۆی هەڵی بژێرێ و ئەیکابە پێغەمەر، هەرکەسێ نەکا بە پێغەمەر لەبەر ئەوە نی‌یە بێ دەسەڵاتە بەڵکو ئەوەی خوا ئەیزانێ کەسی تر نایزانێ.

جولەکەکان گومانیان وابو پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فەرمان ئەدا بەهاوەڵەکانی بەفەرمانێ کەچی لە دووایدا قەدەغەی ئەکا و فەرمانیان پێ ئەدا بەدژی فەرمانی پێشو، ئەمرۆ شتێ ئەڵێ وە بەیانی لێی پەشیمان ئەبێتەوە. کەواتە قورئان خۆی دروستی ئەکا، بۆیە هەندێکی بە پێچەوانەی هەندێ تریەتی، خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە، فەرموی:

مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٠٦﴾ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿١٠٧﴾

﴿ماننسخ من آیة﴾ ئەگەر ئێمە بگۆڕین فەرمان و مەبەستی ئایەتێ لە ئایەتەکانی قورئان لەبەر بەرژەوەندی و سودی موسڵمانان.

﴿أو ننسها﴾ یان ماناو مەبەستی ئایەتێ لەبیری موسڵمانان ببینەوە و واز لە ناوەڕۆکەکەی بهێنن، یا واز لە ناردنە خوارەوەی ئایەتێ بهێنین بۆلای کاتێکی تر.

﴿نأت بخیر منها﴾ ئێمە ئەهێنین ئایەتێ تر چاکتر بێ لەوەی پێشو، ئاسانتر بێ لەسەر ئێوە، سود و پاداشتی زۆرترە بۆ ئێوە، واتە هەمویان چاکن. بەڵام سود و پاداشتی یەکێکیان چاکترە.

﴿أو مثلها﴾ یا ئەهێنین وێنەی ئەو ئایەتە لە سود و پاداشتا، بەڵام پێغەمەر و موسڵمانان وایان پێ چاکە بگۆڕرێ وەك گۆڕینی ڕووانگەی نوێژ لەکاتی کردنی نوێژ لە بەیتولموقەدەسەوە بۆلای بەیتولحەرام لەمەکە. یانێ خوای گەورە فەرمانێ ئەکا بەدەستور بۆ موسڵمانان بۆ ماوەیەکە زۆر پێویستیان بەو فەرمانە هەیە، لەدواییدا موسڵمانان پێویستیان بەو فەرمانانە نامێنێ خوای گەورە ئەی گۆڕێ بۆیان بۆ کارێ تر لەبەر بەرژەوەندی موسڵمانان ، هەروەك پزیشکێ وای بەچاك ئەزانێ کە نەخۆشی بۆ ماوەیە گۆشت نەخوا، وایشی بەچاك ئەزانێ بیروبۆچونی خۆی بەو نەخۆشە نەڵێ و ماوەی قەدەغە کردنی خواردنی بۆ دیاری ئەکا، پاش ڕۆیشتنی حەفتەیە قەدەغەکردنەکەی لەسەر هەڵئەگرێ هەردوو لایان لەبەرژەوەندی نەخۆشەکەیە، ئەمانەی خوارەوە چەند نمونەیەکن بۆ گۆڕینی فەرمانی ئایەتێ بۆلای فەرمانێ ئایەتێ تر لە بەرژەوەندی ئاتدەمیزاد:

١-خوا پێویستی کرد بۆ شەو نوێژ لەسەر باوەڕداران مەگەر کەمێ لەشەو نەبێ، خوای گەورە ئەو فەرمانەی گۆڕی بۆلای سونەت بۆ ئاسان کردنی سەرشانیان و لابردنی قورسایی لەسەریان، بەبێ دیاری کردنی ماوە بۆیان، وە شەو نوێژ بکەن بە گوێرەی توانای خۆیان.

٢- پێویست کردنی (٣) سێ ڕۆژ ڕۆژو گرتن لە هەمو مانگیا خوای گورە گۆڕی بە ڕۆژو گرتنی مانگی ڕەمەزان سەرانسەر لەبەر زۆری پاداشتی ڕۆژوی ڕەمەزان، هەرچەندە گرانترە. گۆڕینی فەرمانی خوا بۆ فەرمانێ تر وەنەبێ هەر بۆ ئۆمەتی پێغەمەری ئیسلام

بوبێ. بەڵکو لە ئاینی پێغەمەرە پێشوەکانیشا هەبوە، وەك دروستبونی مارەکردنی خوشك بۆ برا لەسەردەمی یاسای ئادەمدا، قەدەغەکردنی لەیاسای پێغەمبەرەکانی تردا. هەروەها فەرماندانی موسا بە کوشتنی گوێرەکە پەرستان، لەدوایدا ئەو فەرمانە گوڕرا بە نەکوشتنیان. فەرماندانی بە ئیبراهیم بە سەربڕینی کوڕەکەی، دووایی قەدەغەکرا.

بائەمەیشمان لەبیربێ (النخ) یانێ گۆڕینی پەرستنێ بۆ جۆرەپەرستنێ تر، گۆڕینی فەرمانێ بۆ فەرمانێ تر لەبەر بەرژەوەندی و سودی ئادەمیزادە، بەگوێرەی کات و پێویست میهرەبانی خوایە بۆ بەندەکانی... بە پێچەوانەی (البداء) یانێ خوا بڕیاری کردنی شتێ ئەداو کەچی واز لەکردنی ئەهێنێ، ئەو جۆرە کارە ناڕەوایە پێویستە نەدرێتە پاڵ خوای گەورە، جگە لە سەر شۆڕی و ڕوو ڕەشی هیچ شتێ تر بۆ جولەکەکان و شاگردەکانیان نامێنێتەوە.

گۆڕینی فەرمانی خوا لای زۆربەی موسڵمانان دروستە بە گوێرەی ئەقڵ، لەقورئاندا بیستراوە، نمونەی هەیە، بە پێچەوانەی جولەکەکان ئەڵێن: بە هیچ جۆرێ دروست نیە، بەلای ئەبو موسلیمی ئەسفەهانیەوە گۆڕین لە قورئاندا نیە، هەرچەندە دروستە.

بۆ ئاگاداری: مامۆستا موستەفا مەراغی لە تەفسیرەکەی خۆیا لە مامۆستاکەیەوە ئیبن و عەبدە ئەگێرێتەوە، ووشەی (آیة) لەو ئایەتەدا موعجزەی پێغەمبەرانە، وەمانای ئەم ئایەتە بەم جۆرە ئەکا: (خوای گەورە موعجزەیە ئەبەخشێبە پێغەمبەرێ لە پێغەمەران، لە پاشا ئەو موعجیزەیە لەو پێغەمەرە ئەسەنێتەوە و ئەیدا بە پێغەمەرێ تر) ئەو مانا هەرچەندە لە ناوەڕۆکا ڕاستە. بەڵام دارڕاندنی ئایەتە کە پاڵی پێوە ئەنێ و بەڕاستی ناژمێرێ، ئەوەی جێگەی باوەڕبێ لە فەرمودەی هەمو هاوڕێکانی پێغەمەرەوە زۆربەی زانایانی تر، بەتایبەت ئیبنو عەباس و ئیبنو مەسعود فەرمویانە (النسخ) یانێ گۆڕینی فەرمانی ئایەتێ بۆ ئایەتێ تر هەیە، مامۆستا جەساس لە (أحکام القرآن)دا ئەفەرموێ: ئەو کەسانەی ئەڵێن: گۆڕین لە دەستوری پێغەمبەردا نیە، دورن لە ڕێنمویانی وەرگرتن، بەر لەوان کەسی تر نەی ووتوە،

بەڵکو پێشوەکانمان لە زانایانی ئاینی دەست بەدەست لە یەکترەوە وەریان گرتوە، هەتا گەیاندویانە بە ئێمە، هەمویان فەرمویانە: گۆڕین هەیە. وە ئەو کەسانەی ئەڵێن: گۆڕین لە دەستوری قورئاندا نیە، هەرچەندە گومان لە ئاین پەروەری هەندێکیان نیە و خاوەنی زانیارین لە زانستی (بەلاغە و زماندا) بەڵام خاوەنی زانیاری نین لە فیقە و بنچینەی ئوسولی فیقەدا.

خوای گەورە لەو ئایەتەدا ئەفەرموێ: ئێمە ئایەتێ ئەگۆڕین، نافەرموێ: ئێمە هەمو قورئان ئەگۆڕین، چونکە دوای قورئان شتێ تر نیە جێگەی قورئان بگرێتەوە، بە قورئان فەرمانی ئایەتێ ئەگۆڕێ و هەندێ لە یاسای نامەکانی پێشویش ئەگۆڕێ... مەبەست لە گۆڕینی ئایەتێکی قورئان مانەوەی ووشەکانی و مانەوەی خوێندنەوەی، لەگەڵ وازهێنان لەفەرمانەکەی، کاری پێ کراوە کاتێ لە کاتەکان.

گۆڕین لە قورئاندا لەوانەیە بەش بکرێ بۆلای (٣) سێ بەش:

١- ئەوەیە کە خوێندنەوەکەی و فەرماندانەکەی بگۆڕێ بەجۆرێ ووشەکانی و فەرماندانەکەی بشۆڕێتەوە.

٢- ئەوەیە خوێندنەوەکەی بگۆڕێ بەڵام فەرمان پێدانەکەی بمێنێتەوە، یانێ ووشەکانی لابرێن، فەرماندانەکەی بەردەوامبێ.

٣- ئەوەیە فەرمان پێدانەکەی بگۆڕێ نەك خوێندنەوەکەی، یانێ هەر لە قورئاندا ئەخوێنرێتەوە، دووای ئەوە هەندێ ىجار کاری پێ کراوە فەرماندانەکەی.

بەشی یەکەم و دووهەم نەبوون..بەشی سێهەمیان دروستە و هەیشە ، بەبیر و بۆچونی زۆرتر لە موسڵمان و زۆربەی زانایان کەمانای قورئانیان کردوە. ناوەڕۆکی ئەو ئایەتەیش ئاماژەی بۆ ئەکا.. گومان لەمەدا نیە دروستە گۆڕانی فەرمانی ئایەتێکی قورئان بە ئایەتی تر، فەرمودەی پێغەمبەر بەفەرمانی قورئان ئەگۆڕێ، وەك پێویست بونی ڕۆژی (١٠) دەهەمی مانگی موحەرەم بە ڕۆژوی مانگی ڕەمەزان. زانایان لە گۆڕینی فەرماندانی قورئان

بەفەرمودەی پێغەمبەر بیریان جیاوازە، ئیبنو عەتیبە زانای بلیمەتی سەردەمی خۆی و شافیعی ئەڵێن: دروست نیە، هەندێ لە زانایان ئەڵێن: فەرماندانی قورئـان بـە سـونەتی موتەواتـەر ئەگۆڕێ، ڕێزم بۆیان ئەو فەرمودەیە ناچێتە دڵەوە. گۆڕان کـاری زۆر لـە نێـوان زانایـاندا ئاڵوگۆڕکراوە لە بارەی ئەو گۆڕان کاریە لە زانیاری ئوسوڵی فیقەدا.

﴿ ألم تعلم أنّ الله علی کل شيء قدیـر﴾ ئایا تـۆ نـازانی خـوا بەسـەر هـەموو شـتێکا توانای زۆری هەیە. خوای گەورە بەو ئایەتـە بـە گوێـرەی ڕووالـەت ڕوی پـێ کـردوە بـۆلای پێغەمـەر، مەبەستیشـی ئـەو موسـڵمانانەیە کەتەنگـەتاو کرابـون بـە هـۆی تـاوانی جولـەکەکان و هەندێ لەچەنەبازان، ئەیان ووت: گۆڕانی فەرمانی قورئان درۆیـەو ڕاسـت نیە. خوای گەورە بە پێغەمەری فەرمو: گۆڕان دروستە و خوا دەسەڵاتی بەسەر هەمو شتێکا هەیە و هەمو شتێ ئەکا، فەرمانی ئایەتێ بە ئایەتێ تر ئەگۆڕێ لەبەر بەرژەوەندی و سـودی بەندەکانی خۆی بەگوێرە کات و پێویستیان.

﴿ألم تعلم أن الله له ملك السّماوات والأرض﴾ ئایا تۆ نـازانی بەڕاسـتی بـۆ خـوا هەیـە خاوەنێتی و پاشایەتی ئاسمانەکان و زەوی و هەڵیان ئەسـوڕێنێ بـەگوێرەی ویسـتی خـۆی، هەمو فەرماندانێکی بەدەستە، بەگوێرەی ویستی خۆی فەرمانێ بۆلای فەرمانێ تر ئـەگۆڕێ، یاوەك خۆی ئەی هێڵێتەوە بەبێ گۆڕان. ئەو ئایەتە لەگەڵ پێغەمەریەتی و مەبەسـتیش هـەمو موسڵمانانە، جۆرە هەڕەشەیە دەر ئەکەوێ بە ووشەی (ألم تعلم).

﴿ومالكم من دون الله من وّليّ ولا نصیر﴾ وە بۆ ئێوە نیە لە جگەی خوا هیچ دۆست و هیچ یاریدەرێ. کەواتە ئەی باوەڕداران: گوێتان لە تاوانجی هیچ کەس نەبێ کـە باوەڕیـان بەگۆڕانی فەرمودەکانی خوا نیە بەفەرمانێ تری، خوا توانای بەسـەر هـەموتانا هەیـە. هیـچ بونەوەرێ ناتوانێ زیانتان لێ بدا، هەتا خوا پشتیوان و یارمەتی دەرتان بێ.

بەکورتی گۆڕانکاری لە فەرمانەکانی خوادا هەیە کە مەبەستی ئایەتێکی قورئان بە ئایەتی تر بگۆڕن بەبێ گومان. هیچ شتێ نیە ڕێگەی پێ بگرێ، بە گوێرەی ئەقڵ و دەستور ئـایین

ڕاست ڕەوایە، مەگەر لای ئەو بێ باوەڕانە پلار و تاوانج فرێ ئەدەن بۆ موسڵمانان، وەخوای گەورە هەمو شتێ ئەزانێ.

هەندێ لە موسڵمانان پرسیاریان لە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ کە باسی هەندێ شتیان بۆ بکا، بەتایبەتی درێژەدان بەباسی گۆڕانی فەرمانەکانی قورئان کە سودی ئەوان لەو پرسیارانەدا نەبو. خوای گەورە ئەو پرسیارانەی لێ قەدەغە کردن، فەرموی: ئەو جۆرە پرسیارانە واز لێ بهێنن، هەتا نەبنە هۆی گرانبونی فەرمانی خوا لەسەرتان، هەرپرسیار کردن بو، بو بەهۆی گرانکردنی فەرمانی خوا بەسەر جولەکەکانەوە. کەواتە هەر فەرمان و کارێ لای خواوە هات بەجێی بهێنن جابۆیە خوا پێیانی فەرموو:

أَمْ تُرِيدُونَ أَن تَسْـَٔلُوا۟ رَسُولَكُمْ كَمَا سُئِلَ مُوسَىٰ مِن قَبْلُ ۗ وَمَن يَتَبَدَّلِ ٱلْكُفْرَ بِٱلْإِيمَـٰنِ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١٠٨﴾ وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَـٰنِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْحَقُّ ۖ فَٱعْفُوا۟ وَٱصْفَحُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ



﴿أم تریدون أن تسألوا رسولکم ﴾ ئایا ئێوەی موسڵمان چ شتێکتان ئەوێ کە ئێوە پرسیار بکەن لە نێراوی خۆتان، بەو پلەو پایە بەرزەوە هەیەتی، ئەوەی خۆتان ئەتانەوێ داوای ئەکەن، بڕواتان بەو فەرمانە نیە ئێوە لەسەری ئەڕۆن، پاش ئەوەی خوا بە ئێوەی فەرمو: گوێ لە پروپاگەندەی ئەو کەسانە مەگرن باوەڕیان بە فەرمانەکانی خوا نیە کەلەو فەرمانانەیە گۆڕینی فەرمانی قورئان، وەپێشیانی فەرموو: چ شتێکتان ئەوێ لە پێغەمەر بەو هەموە بەڵگە بێگومانانەوە هێناویتی، ئێوە پرسیاری وا ئەکەن زۆر ناقۆڵایە و دروست نیە، مرۆڤ وائەبێ گومان پەیدا ئەکا لە کارێکا.. پرسیاری بۆ ئەکا، کە بەڵگەی بەدەست کەوێ ئەو گومانەی نەمێنێ، ئەگەر بەرێك و پێکی پرسیار بکا جێگەی خۆیەتی. بەڵام ئەگەر بڵێ: ئەو کێوەم بۆ بکەیە زێڕ. یا ئەو بیابانەم بۆ بکەنە باخ چیمەن و گوڵ بەبێ ئاو، ئەو پرسیارە بیانوگرتنە و لەخۆ بایی بونە، نارەوایە و چاکەی لێ ی ناوەشێتەوە، کەوابو ئەی باوەڕداران ئێوەیش بێ گوێ مەبن و پرسیاری ڕەوا و سود بەخش بکەن خوا لە هەمو کارێکا چاکەی ئێوە و جگەی ئێوە هەڵئەبژێری و ئەتانداتێ.

﴿کما سئل موسیٰ من قبل﴾ هەروەك پرسیار ئەکرا لە موسا لەلایەن تاقمەکانیەوە لە پێش پێغەمەرەوە، پرسیاری وایان ئەکرد لە موسا لە ئەقڵەوە دوربو ئەیان ووت: خوایێکمان بۆ دروست بکە، خوامان پیشاندە بە چاوی خۆمان تەماشای بکەین. چەندین پرسیاری تر، بەو بۆنەوە وایان لێهات بێ باوەڕبون، ئێوەی موسڵمان شایستەی ئەو جۆرە پرسیارانەتان نیە.

﴿ومن یتبدل الکفر بالأیمان﴾ وە هەرکەسێك باوەڕهێنان بگۆڕێتەوە بە بێ باوەڕی، بێ باوەڕی بۆ خۆی هەڵبژێرێ و واز لە باوەڕهێنان بهێنێ و واز لەو ئایەتانە بهێنێ کە بەگوێرەی پێویست هاتونەتە خوارە و لەگۆڕینی فەرمانی ئایەتێ بەفەرمانێ تر، پرسیاری بێ سودی زۆر بکا.

﴿فقد ضلّ سواء السّبيل﴾ دووای بەڕاستی ئەو کەسە وونی کردووە ناوەڕاستی ڕێگەکە بەرەو بەختیاری ئەی برد ، ئەو کەسەی لە ئاستی ڕاستی و باوەڕدا ڕاوەستێ و بیەدێ بەچاکی تێ بگا و پرسیاری بۆ بکا بەجۆرێکی شیاو ئەو کەسە باوەڕداری ڕاستە، ئەو کەسە بەفیز و بەبیانو گرتن و بەلوتەلاو بۆ لاقرتێ پرسیار بکا و شتی واداوا بکا لە ئەقڵەوە دوربێ، بێ باوەڕ و توشی تۆڵە ئەبێ لە هەردوو جیهاندا.

جولەکەکان بە هاوڕێکانی پێغەمەریان ووت لە پاش جەنگی ئوحود: ئەگەر لەسەر ڕاستی بونایە لەو جەنگەدا نە ئەشکان و نە ئەکوژران، کەواتە ئێوە بگەڕێنەوە بۆلای ئاینی ئێمە، ئێمە ڕانموێتان ئەکەین، خوای گەورە پیسایی دڵی ڕەشیانی ڕون کردەوە، بە موسڵمانانی فەرمو:

﴿ ودَّ كثير مِن أهلِ الكتاب ﴾ وە پێیان خۆشە زۆر کەس لەتاقمی خاوەن نامەکان وەك فەنحاسی کوڕی عازورا ، زیدی کوڕی قەیس هەندێ تریان ئاواتیان ئەمەیە :

﴿لو يرودونكم من بعد إمانكم كفاراً﴾ کە ئەوان ئێوە بگێڕنەوە لە دووای باوەڕ هێنانتان بەخوا و بەپێغەمەر و بەئاینی ئیسلام بەبێ باوەڕان بە ئاینی ئیسلام. هەمو ئادەمیزادێ وای پێ خۆشە هەمو کەسێ لەسەر بیروباوەڕی ئەو بێ، بۆیە یەکێ لە فەیلەسوفەکان ئەڵێ: بەختیارترین ڕۆژ لای من ئەوەیە بینیم یەکێ لەگەڵ بیروباوەڕمایە، بۆیە جولەکەکانیش هەمو کۆششی خۆیان ئەخستە کارەوە بۆ سەر لێ شێواندنی موسڵمانان و گەڕانەوەیان بۆلای ئاینە پێشوە خراپەکانیان، لەبەر هیچ شتێ نەبو جگە لە حەسودی و یاخی بونیان، ئەیان توانی باوەڕبهێنن، ئەیانزانی ئاینی ئیسلام ڕاستە. بەلام ترسیان لە نەمانی بازاڕ و قازانجیانبو، بۆ فرۆشتنی ئارەق و قومارکردن، سازدانی جێگەی کاری خراپ و دانانی ژنانی داوێن پیس لە ناویانا بۆ بلاو کردنەوەی بەرەلایی.

جولەکەکان تێشکاندنی موسڵمانەکانیان بەهەل زانی لە ڕۆژی ئوحودا، بەکاریان هێنا بۆ پلارگرتنە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لاوە موسڵمانەکانیان ئەبردە ماڵی خۆیانەوە، ئارەقیان

دەرخوارد ئەدان لەو کاتەدا ئارەق قەدەغە نەکرابو، کچە جوانەکانی خۆیانیان نیشان ئەدان. هەروەك ئەم سەردەمە ئەوان و خزمەتکارەکانیان ئەبینرێ خاوەنی ئەوکردەوە پیسەن، نەوەستان گومان بەموسڵمانان پەیدا ئەکەن لەبارەی قورئان و ئاینی پیرۆزی ئیسلام و پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ هەستی بەو فروفێڵە گلاوەیان کرد، لەموسڵمانانی قەدەغە کرد چونە ماڵیان بۆ ڕابواردن، هەڕەشەی زۆری خوای دەربڕی بۆ ئەو کەسانە ئارەق بخۆنەوە و قومار بکەن و گۆشتی بەراز بخۆن، پاش ئەوەی موسڵمانان هامەشۆی ماڵە جولەکەکانیان واز لێ هێنا، وەوازیان لە بارِ و گازینۆ و خراپەکانیان هێنا. هەروەها ئەمڕۆش شاگردەکانیان بەو جۆرە کارە نارەوایانە هەڵئەسن و وەجاخیان کوێرنەکردوەتەوە. پاش هەڕەشەی پێغەمەر و وازهێنانی موسڵمانان لە هامەشۆیان، دڵی پیسیان هاتە کوڵ لە حەسودیا.

﴿حسداً من عند أنفسهم﴾ لەبەر ئەو دڵ پیسیە لەلایەن دەرونی خۆیانەوە، لەبەر ئەو پلەو پایە بەرزە درابو بە پێغەمەر و بەموسڵمانان، ئەیانزانی قازانج و سود خواردنیان لەکیس چوە.

﴿من بعد ماتبين لهم الحق﴾ لەدووای ڕون بونەوە بۆیان ڕاستی ئاینی ئیسلام، موحەمەد ئاین و گفت وگۆکانی ڕاستە بەهۆی بەڵگەی ئاشکراوە، ڕەنگ وشێوەی لەتەوراتا نوسراوە. بەکورتی جولەکەکان هەوڵی زۆریاندا بۆ گەڕانەوەی موسڵمانان بۆلای بێ باوەڕی و گومڕایی، ئەیشیان زانی ئاینی ئیسلام ڕاستە، هاوبەش دانان بۆ خوا و باوەڕنەکردن بە پێغەمەر بۆش و پوچە.

**بۆ ئاگاداری:** لەو کردەوە خراپانەدا هەر جولەکەکان وانین. بەڵکو زۆربەی ئادەمیزاد بروای بە ڕاستی نیە و بەرەنگکاری ئەکرێ لەبەر ئەوەی دژی بەرژەوەندی ئەوان و داگیرکەران و خوێن مژان و ستەم کارانە.. بابزانرێ حەسودی دوو جۆرە: یەکەمیان ئەمەیە ئاواتە خواز بێ ئەو چاکەیە خوادا یوێتی بە کەسێ تر بەمیهرەبانی خۆی لە ناوبچێ،

ئەم بەشەیان قەدەغەیە لای خوای گەورە، خوا و پێغەمەر بە خراپی باسیان کردوە، وەك لەو ئایەتەدا و ئایەتی تردا باسی کراوە، بە خراپترین کردەوە ناسراوە، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ئەفەرموێ: حەسودی هەمو چاکەیە ئەخوا وەك ئاگر درەخت ئەخوا، حەسودی گەورەترین هۆیە بۆ پەیدا بونی ئاژاوە و ناکۆکی و کوشتن و برین و تالآن و چەوساوەی گەلان..

دووهەمیان ئەمەیە: خوا چاکەی بەخشیوە بەکەسێ بە میهرەبانی خۆی، ئەو کەسە رەوشتی لەگەڵ قورئاندایە، لە خوا پەرستی و فێربونی زانیاری ناوەستێ، وەیا سامانی زۆری هەیە، بەم دەدست و بەو دەست لەبەر خۆشنودی خوا ئەیبەخشێ، تۆیش ئاوات ئەخوازێ وەك ئەو کەسە وابێ و سامانی وات هەبێ، نەك بۆ ئەوە سامانی ئەو نەمێنێ، ئەو بەشەیان زۆر پەسەندە و پێی ئەوترێ (غبته) پێغەمەر ئەفەرموێ: حەسودی هەرلەو شعانەدا رەوایە.

﴿فاعفوا واصفحوا﴾ دووایی ئێوە ئێستا وازیان لێ بێنن و بەرەنگاریان مەکەن و سزایان مەدەن و لە نەزانینیان ببورن، هەمو کارێ بەستراوە بە کاتی خۆیەوە.

﴿حتی یأتي الله بأمره﴾ هەتا خوا فەرمانی خۆی ئەهێنێ و سزایان ئەدا و تەمێیان ئەکا و ئێوە سەرئەخا بەسەریانا. موسڵمانان وازیان لێ هێنان هەتا خوا فەرمانی پێدان بێ باوەڕان پاك بکەنەوە. فەرموی: ﴿قاتلوا الّذین لایؤمنون بالله والیوم الآخر﴾ ئێوە باوەڕدار جەنگ بکەن لەگەڵ کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕ بەخوا ناهێنن و باوەڕ بە ڕۆژی دوایی ناهێنن بێ باوەڕی و بێ ئاینی، داوێن پیسی و پێ شێل کردنی کاری ڕەوا و پەسەند، گێرە شێوێنی و ستەم کردن لە هەژاران ئەوانە هەمویان ئەبینرێن لە ژیاندا، هەمویان یەك هۆیان هەیە: ئەویش بریتیە لە سەرپێچی کردن لە ڕاستی و خواناسی. ئادەمیزاد ئەگەر دادپەروەر بونایە بە بەختیاری ئەژیان و ئەحەسانەوە. بەڕاستی فەرمودەی خوا کە ئەفەرموێ: ﴿فماذا بعد الحقّ إلاّ الضّلال﴾ نیە لە دووای ڕاستی جگەی گومڕایی، بەڵگەی ڕاستە بۆ ئەو مەبەستەی ئێمە. بێگومان مافی ڕەوا بەبێ پشتیوان و یارمەتی پەیدا نابێ، ئەگەر بیشبن زۆر کەمن،

ئەگەر مافی ڕەوا و ڕاستی و دادپەروەری زۆریان ببوایە بە وێنەی کاری بۆش و پوچ ئادەمیزاد بە خۆشی و برایەتی ئەژیان لە نێو ئاسایش و بێ ئازاریدا، بگرە بێ گومان ئەگەر هەمو کەسێ مافی خۆی وەرگرتایە و چاوی نەبڕیایەتە مافی یەکێ تر ستەم و ناڕەوایمان بە چاوی خۆمان نەئەدی، هەمو کەس بە پێویستی سەر شانی خۆی هەڵئەسا. خوای گەورە بەڵگەو دەستوری بۆ مافی ڕەوا و دادپەروەری و ستەم نەنکردن داناوە ڕانموی بۆ لای کراوە، ئەویش بریتیە لە فەرمانەکانی قورئان و دەستوری پێغەمەر و هەڵسان بە دەستوری ئیسلام، ئەگەر بە دڵێکی پاکەوە سەیر بکرێ، فیز و لە خۆ بایی بون و گێلی لە خۆمان دوور خەینەوە، وە بەبێ لایەنە لە قورئان ووردبینەوە، ئەزانرێ ئەو کەسەی پشت بکاتە ئەو بەڵگە ڕاستیانە کە ئەیشزانێ ڕاسن و ڕەوان جگە لەوەی بەبێ باوەڕ دابنرێ بە شێت و نەفام و کەڕ و کوێر و لاڵ دائەنرێ، بە ئەقڵ و زانست کار ناکا، بەگوێ بێ لایەنی و بەچاوی چاکە کارناکا جگە لە لاڵی هیچ وەدەست نایەنێ، وەك جولەکەکان و بت پەرستان هەمان خوڕەوشتیان هەبو.

لەوانەیە پرسیار بکرێ: موسڵمانان بەم ژمارە کەمەوە چۆن زاڵ ئەبن بەسەر بێ باوەڕان بەو زۆریە، ئەتوانن سزایان بدەن و تەمێیان دادەن؟ خوا ئەفەرموێ:

﴿إن الله على كلّ شيءٍ قدير﴾ بە ڕاستی خوا بەسەر هەمو شتێمکا توانای هەیە، سزاو تۆڵە بەبێ باوەڕان ئەگەیەنێ، هێز ئەدا بەو موسڵمانان و پەرەیان پێ ئەدا کە تەمێی بێ باوەڕان دابدەن دووژمنانی ئاین و پێغەمەر و باوەڕداران پەرتەوازە بکەن، دەریان بکەن لە مەکە و لە مەدینە.

وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ۚ وَمَا تُقَدِّمُوا۟ لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ



موسڵماناتن کە خوا فەورمانی پێ دان واز لە بێ باوەڕان بهێنێ، ئـەیزانی گرانـە وازلێ هێنانیـان لەگـەڵ ئـەوەی ئەوپـەڕی دوژمنایـەتی باوەڕدارانیـان ئـەکرد، خـوا دڵخۆشـیان ئەداتەوە. ئەفەرموێ:

﴿وأقيموا الصّلاة﴾ وە ئێوەی باوەڕدار نوێژەکانتان بەرپا بکەن و بەجێی بـهێنن، داوای کۆمەك لـە خوا بکەن بەهۆی کردنی نوێژەکانتانەوە هەتا سەرکەون بەسەر بێ باوەڕاندا.

﴿وآتوا الزّكاة﴾ وە ئێوە زەکاتی سامان و دارایی خۆتان ببەخشن بـە هـەژاران، داوای یارمەتی لـە خوا بکەن بەهۆی بەخشینی زەکاتەکانتانەوە.

﴿وما تقدموا لأنفسكم من خيرٍ﴾ وە هەر شتێ ئێوە پێشی خەن بـۆ سـودی خۆتـان لـە هەر چاکەیە.

﴿تجدوه عند الله﴾ ئێوە ئەو شتەتان دەسـت ئەکـەوێ لەخزمـەت خـوادا لـە هـەردوو جیهاندا.

﴿والله بما تعملون بصير﴾ وەخوا بەشتێ ئێوە بیکەن ئەی بینێ و ئاگادارە، لـەناو ناچـێ زۆر بێ یاکەم. ئەو ئایەتە (٣) سێ شتی زۆر گرنگی بۆ موسڵمانان ڕون کردوەتـەوە: (١) فورمانی داوە بە موسڵمانان نوێژەکانیان بەجێ بهێنن.

(٢) فەرمانی پێ داوە زەکاتی سامان و دارایی خۆیان بدەن بە هەژاران.

(٣) سێ هانی داون بۆ کردنی هەمو چاکەیە. ئەو ئایەتە یەکەم جار بەتایبەتی فەرمانی داوە بە کردنی نوێژ و بەخشیشی زەکات. دووهەم جار فەرمانی داوە بەکردنی هەمو چاکەیە کە نوێژ و زەکاتیش ئەگرێتەوە، کەواتە دوو جار فەرمانی داوە بەکردنی هەمو چاکەیە کە نوێژ و زەکاتیش ئەگرێتەوە، کەواتە دوو جار فەرمانی داوە بەکردنی نوێژو دانیزەکات لەبەر ئەوەی زۆر گرنگە کردنیان، ئەو جۆرە دارژاندنە بێ وێنە هەر لە قورئانی پیرۆز ئەوەشێتەوە.

بەڕاستی زۆربەی لاوانی ئەمڕۆمان گاڵتە و لاقرتێ بە ئایین پەروەران ئەکەن، هەندێکیان بەبێ پێ چوپە ناڕوبەڕو ئەڵێن: جگە لە سروشت شتی ترنیە، بڕوایان بەبونی خوا نیە، هەندێکی تریان ئەڵێن: جگە لەسروشت بەڕێوە بەرێکی وا هەیە هەمو بونەوەرێکی لەجێگەی شیاوی خۆیا داناوە. بەلاَم نە ڕۆژو هەیە و نە نوێژ، ئەوانە هەردوولایان بێ باوەڕن لای خوا، چونکە ئەو کەسەی نوێژ نەکا کوت ومت وەك بڕوا بەخوا نەبێ وایە..

ئێمە زانایانی ئاینی پێویستە شین بۆ خۆمان بکەین لە سەرکردەوەی لاوانیئەمڕۆمان، ناخۆشی خۆمان دەربڕین لەسەر بێ باوەڕیان و گاڵتە کردنیان بە ئاینپەرستان، ئێمە فەرمانمان داوە بەسەر ئەو لاوانەدا کە لایان داوە لە ڕاستی و ، ئاشکرایە بێ باوەڕن. بەلاَم چ شتێکمان بۆ ئەو مەبەستە کردوە: بێگومان بە هیچ کارێ هەڵنەساوین، شێوازێکی بسەلمێنمان پێش کەش نەکردوون، ئیشێکی هەرەوەزیمان بۆ ساز نەکردون، بە کۆبونەوە و بەستنی کۆڕ بۆیان، گفتو گۆمان لەگەڵ نەکردون کە پێیان بخوێنین، بە پێك هێنانی قوتابخانە و زانکۆ بۆ فێرکردنی قورئان و فەرمودەی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ و فەلسەفەی باوەڕی ئیسلامەتی، فێرکردنی مێژوی ئیسلام و زانستی دەرونی و ڕاهێنانیان لەسەر ئامۆژگاری و بانگ کردنیان بۆلای ئیسلام بە شێوەیەکی جوان و ڕێگەیەکی تازە.

بێگومان هەندێکمان هەڵساوین بە کۆششێکی سوپاس بۆ کراو لەو بارەیەوە. بەلاَم پێویستمان بە یەکێتی کۆشش هەیە، بە ویستێکی خاوێن و خۆ بەقوربانی کردنێکی گشتی.

بەڵام بەداخەوە یەکێتی چۆن پەیدا ئەبێ لە نێو ئەو کەسانەدا کە بەزۆری هەن و خۆیان بەسەر ئاینەوە ئەژێنن کۆشك و سامانی زۆر پەیدا ئەکەن، ئەو شتەی گرنگبێ بۆیان لە ئایندا ئەوەیە پلەی بەرزو سامانی زۆریان بۆ برەخسێنێ. کەواتە ئێمەی زانایانی ئایین پرسیار لێ کراوین لەلایەن خوا و زۆر بەسەختی دەربارەی لاوەکانمان، هەروەك ئەوانیش پرسیار لێ کراون بەتوندی تر کە گاڵتەو گەپ بە ئاین ئەکەن و رێگە بە ناسینی راستی ئەگرن و ، بە فەرمانی ئایین هەڵناسن. ئا ئەمەیشمان لە بیر بێ پرسیار لێ کراو بە شێوەیەکی راستەو خۆ کاربەدەستانن، چەك و سامان و دارایی و بەرگری و ئابوری و رامیاری و راگەیاندن و پەروەردە کردن و رۆشنبیری و هەست و نەستی گەلیان گرتوەتە دەست لەو ئایەتەدا کە خوا فەرمانی داوە بە موسڵمانان بۆ کردنی نوێژ و بەخشینی زەکات پێویستە بزانین نوێژ چۆن ئەکرێ، وەزەکات چۆن ئەدرێ بە گوێرەی یاسای ئایین، بەو جۆرەی خوالێمان وەربگرێ بە پێچەوانەوە بکرێ لێمان وەرناگرێ، بۆ ئەو مەبەستە باسی سودەکانی نوێژ و زەکات و چۆنیەتیان ئەکەین، هەریەکەیان بە جیاوازی.

**سودەکانی نوێژ:** ئادەمیزاد پێویستێکی بەتینیان هەیە بۆ بەهێز کردنی خۆیەتی خۆیان بەبێ وچان بۆ بەدەست هێنانی رێزی خۆیان، لەترسی ئەوەی نەوەك پەیوەندی نێوانیان بریتی بێ هەر لە خواردن و خواردنە و سامان پەیدا کردن و سودی تایبەتی و، سەربکێشێ بۆ گێرە شێوێنی لە زەویدا. کەواتە پێویستمان بە پاڵپیوەنەرێ هەیە هەتا توشی گێرە شێوێنی نەبین، هەر تەنها نوێژە ئادەمیزاد رابکێشێ بۆ پەرە پێدانی گیانی پێویست بۆ چاك کردنی ئەو کۆمەڵایەتیە. ئادەمیزاد ئەگەر پەیوەندی گیانی بەردەوام و تەواویان بە دروست کەری خۆیانەوە نەبێ، رووالەتی دورِوندەیی و پەژارەیی و بێ باوەر بە خۆیانەوە ئەبینن، وائەزانن ئەوا نەبۆیان پەیدا ئەبێ لەگاڵتەو گەپ و رابواردن وەریان. گرتوە، بۆیە خۆیان فرێ ئەدەنە باوەشی ئەو کردەوە بێ سەردانەوە و رایان ئەکێشێ بۆلای ئارەق خواردن و قومار کردن و سورِدان و گۆرانی و پل تەقاندن و چەقەنە لێدان، هەمو ژیانی خۆیان لەو

پڕوپوچانەدا دائەنێن، لەهەمویان سەیرتر ئەوەیە بیرێ لە خۆیـان ناکەنـەوە، هەڵپـەی زۆر ئەکەن بۆ پەیدا کردنی سامان بە کۆششێکی زۆرەوە بێ ئەوەی بە ئاواتی خۆیـان بگـەن و هەڵپەکەیان بەبێ ئەنجام ئەڕوا، جگە لەوەی وەك ئاژەڵ ژیاون و بخۆن و بخۆنەوە هیچ شـتێ تریان بەدەسـت نـەهێناوە، لـەوان کـردەوە و لـە ڕەشـەبا بـردن هـەموکاتێ خەفـەتبار و سەرگەردان و خەوالو، بەڵام نوێژ بۆ مرۆڤ ساز ئەکات بۆی هەموکاتێ لە خوا بپاڕێتەوە، ئەوەی بیانەوێ ئـەیانداتێ، هەناسـەیەکی خـۆش هەڵئەکێشـن، نوێـژ دروسـت ئـەکا بـۆ ئادەمیزاد بیرو باوەڕی پەرستنی خوا و بەجێ هێنانی فەرمانەکانی خوا، گەڕانەوەیان لـەکار و باری نەگونجا و لەگەڵ سروشتیانا، خەفەت و بڕوا نەبون بە خۆێتی پـرژ و بـڵاو ئـەکا، پاڵیان پێوە ئەنێ بۆ دەست گرتن بەهێز لەلای خوا و بۆیان دێت. کەواتە پشت ئەبەستن بە خوا و هەست بەسەر گەردانی ناکەن لە دڵیانا. ئەبن بەخاوەنی هـێزێ لـەخۆیانا پـاڵ بنـێ بەگەورە ترین گیرو گرفتی سام ناکەوە، بۆیان ڕون ئەبێتـەوە پـەیوەندی گیـانی ئـادەمیزاد بەدروست کەری خۆیانەوە، بـابۆ ماوەیـەکی کـەمبێ لـە ڕۆژێکـا، سـودی نوێـژ زۆرن و ماوەمان کەمە.

لە پێویستە هەرە بەنرخەکانی ئادەمیزادە نوێژ کردن، بۆیە خوای گەورە نوێژی کـردوە بە دەستور لەئیسلامدا. خـوای گـەورە لـە قورئـاندا نزیکـەی (٩٩) جـار فـەرمانی داوە بەکردنی نوێژ ، یا بەهەڕەشەکردن لەو کەسانەی نەیکەن ، نوێژە فـەرزەکان (٥) نوێـژن : نوێژی نیوەڕۆ (٤) چوار ڕکاتە کاتی بەجێ هێنانی دەست پێ ئـەکا لـە لادانـی خـۆر لـە ڕاستی ئاسمان، هەتا سێبەری هەمو شتێ بە ئەندازە خۆ پتر ئەبێ، لە جیـاتی نوێـژی نیـوەڕۆ دورکات نوێژی هەینی دەکرێ، بەو مەرجانەی بۆی دیاری کراوە، خوا یارمەتی دەرمـان بێ لە جێگەی خۆیا باسی ئەکەین بە درێژی (٢) دووهەم نوێژی عەسر چوار ڕکاتە، کـاتی دەست پێ کردنی پتر بونی سێبەری هەمو شتێ لە ئەندازەی خۆی جگە لە سێبەری لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان، هەتا ئاوابونی خۆر لە بەرزترین کێوی بینراو.

(٣) سێهەم: نوێژی مەنغریب سێ ڕکاتە کاتی کردنی دەست پێ ئەکا لە ئاوابونی خۆر لە بەرز ترین کێوی بینراو، هەتا نەمانی سورابی خۆر لە کەناری ئاسمان و شین هەڵگەڕاندنی. (٤) چوارەم نوێژی عیشا چوار ڕکاتە بەجێ هێنانی دەست پێ ئەکا بەشین بونی کەناری ئاسمان هەتا دەرکەوتنی سپیایی خۆر لە کەناری ئاسماندا. (٥) پێنج هەم نوێژی بەیانی دوو ڕکاتە بەجێ ئەهێنرێ لە کاتی سپیایی کەناری ئاسمان نەوە هەتا هەڵهاتنی خۆر بەسەر بەرزترین کێوێ بینراو کەواتە نوێژە فەرزەکان. (١٧) حەڤدە ڕکاتن مەرجەکانی پێویست کردنی نوێژ لەسەر ئادەمیزاد (٣) سێ شتن (١) موسڵمانەتی، بێ باوەڕان نوێژیان لەسەر نیە، یانێ کاتێ موسڵمان بون سزایان نادرێ لەسەر نەکردنی نوێژ لەکاتی بێ باوەڕیدا (٢) دووەهەم باڵغ بون بۆ پیاوان بە پەیدا بونی شاوات ، یاتەمەنی بوبێ بە (١٥) پازدە ساڵی تەواو، بۆ ژنان پەیدابونی حەیز، یاتەمەنی بوبێ بە (١٥) پازدە ساڵی تەواویی، مناڵان نوێژیان لەسەر پێویست نیە، (٣) سێهەم ئەقڵ، یانێ شێتەکان نونێژیان لەسەر پێویست نەکراوە.

مەرجەکانی نوێژ بەر لەدەست پێ کردنی نوێژ، کە بەشێ نین لە نوێژدا (٥) پێنج شتن. (١) پاکی هەمو ئەندامەکانی لە بێ دەست نوێژی و لەش پیسی، پاکی ئەندامەکانی و بەرگ و پۆشاکیان لە پیسی (٢) داپۆشینیپیاوان نێوان ناوك و ئەژنۆیان لە کاتی نوێژ کردندا، داپۆشینی ژنان هەمو لەشی جگە لە دەست و دەم و چاوی. (٣) ڕاوەستان بە پێوە بۆ نوێژ لە جێگەی پاکدا. (٤) بڕوابون بە هاتنی نوێژ. (٥) ڕوکردنە لای کەعبە بەڕاستی و بێ گومان.

ڕوکنەکانی نوێژ ئەوشتانەی بەشێکن لە نوێژ، نوێژ بێ ئەوان پێك نایە (١٤) شتن:

(١) نییەت: یانی لە دڵا بێژرێ چوار ڕکات نوێژی نیوەڕۆ ئەکەم بۆ خوا، هەروەها نوێژە کانی تر.

(٢) وەستان بە پێوە ئەگەر توانا هەبو بۆ خوێندنی فاتیحە.

(٣) ووتنی ووشەی (الله أكبر) بەر لە خوێندنی فاتیحە.

(٤) خوێندنی سورەتی فاتیحە لە (بسم الله الرحمن الرحيم) هەتا (ولا الضالّين).

(٥) ڕکوع بردن وەستان بۆی هەتا لەشی نوێژ کەر لەجوڵە ئەکەوێ (الطمأنينه).

(٦) هەڵسان لە ڕکوع و ڕاوەستانی تەوا و هەتا ئەندامەکانی لە جوڵە ئەکەون (الأعتدال).

(٧) سوژدە بردنی یەکەم هەتا ئەندامەکانی لە جوڵە ئەنیشنەوە.

(٨) دانیشتن لە نێوان هەر دوو سوژدەکان، هەتا لەشی لە جوڵە ئەکەوێ.

(٩) سوژدە بردنی دووهەم.

(١٠) دانیشتن بۆ تەحیاتی دووهەم.

(١١) خوێندنی تەحیاتی دووهەم لە (ألتحيات لله) هەتا (اللهم صلّ على محمدٍ).

(١٢) سەلام دانەوەی یەکەم بە ووشەی (ألسّلام عليكم).

(١٣) نییەتی دەرچون لە نوێژ لەکاتی ووتنی (السّلام عليكم).

(١٤) بەجێ هێنانی بەو جۆرەی باسکران بەبێ پاش و پێش.

ئەو شتانەی نوێژ پوچ ئەکەنەوە (١٠) شتن:

(١) گفتو گۆ کردن بە دەسیان قس.

(٢) کار کردن و هاتو چۆی زۆر لە نوێژا.

(٣) خواردن و خواردنەوە لە نوێژا.

(٤) پەیدابونی بێ دەست نوێژی و لەش پیسی.

(٥) پەیدا بونی پیسی بۆسەر بەرگ و لەشی نوێژ کەر لەنوێژا.

(٦) دەرکەوتنی ئەندامی نوێژ کەر بۆ پیاوان ناوك و نێوان ئەژنۆ، بۆ ژنان دەرکەوتنی جگەی دەست و دەم و چاوی.

(٧) گۆڕینی نییەتی نوێژ لە کردنی نوێژەوە بۆلای نەکردنی.

(٨) ڕو وەرچەرخانی نوێژ لەقیبلە.

(٩) پێکەنینی قاقا.

(١٠) وەرگەڕانی نوێژ کەر لە ئاینی ئیسلام بۆلای جگەی ئیسلام.

باس کردنی دەست نوێژ و لەش پیسی، حەیزی ژنان، تەیەموم، نوێژی هەینی، کورت کردنەوەی نوێژ و کۆکردنەوەی دوو نوێژ بەیەکەوە، نوێژی ترس، نوێژە سونەتەکان. هەمویان بەیەکەوە لە جێگەی خۆیان باسیان ئەکەین. هەروەها باسی نوێژی مردو ئەکەین باسی زەکات و چۆنێتی پەیداکردنی و بەش کردنی بەر لە ئیسلام:

گەلانی پێش ئایینی ئیسلام کاربەدەستەکانیان باجیان لەسەر سامانی هەژارانی ژێردەستەی خۆیان دانابو، پاشاکان و کاربەدەستان و پیاوانی ئایینی ئەو باجەیان (چربە الدخل) ئەخوارد، زۆر بەخۆشی ڕایان ئەبوارد، چینە هەژارەکانیش بەئەوپەڕی ناخۆشی ئەژیان، بگرە بە بەندەی خۆیانیان دائەنان: بۆیە لەو کاتەدا هەژارەکان کاربەدەستەکانیان بەنوێنەری خۆیان دانەئەنا، بەپێچەوانەوە بەدوژمنی هەرەگەورەی خۆیانیان ئەزانی، هەمو ئاواتی کاربەدەستانیان خواردنی سامان و مژینی خوێنی هەژاران بو، بێ ئەوەی سودێکی بینراویان لێوە دەردەکەوێ بۆ چینە خوارەوەکانیان، بۆیە هەژاران ئەو باجەیان بە بارێکی قورسی سەر شانی خۆیان دائەنا، بەهەرچۆنێ ببوایە بەشوێنی ڕێگەی ڕاستیدا ئەگەڕان.

گەلانی پێشو ئاگایان لەدارایی ناوخۆی نیشتمانیان نەبو، نەیان ئەزانی چۆن پەیدا ئەکرێ، بۆچ جێگەیە ئەڕوا، خۆیانیان بەبێ بەش دائەنا، خۆیانیان بە خۆراکی تایبەتی پاشاکان و دار و دەستەی ئەوانیان لە شالیار و فەرمان بەران دائەنا.. میری کۆن هەمو کاریان نارەوا بو، وەك ئەمیری ئەمرۆ نەبون بەهەرچۆنێ بێ بەشێکی زۆری سامانی میری بلاو ئەکەنەوە لە ڕێگەی بەرژەوەندی و بوژانەوەی دانیشتوان و پێك هێنانی دادپەروەری هەرچەندە تەواویش نیە، خۆیان زۆرتری ئەبەن، ئەی خەنە بانگەکانی بێگانەوە. بەڵام ئەگەر

یاسای قورئان بچەسپێ لە هەمو ڕوێکەوە، دادپەروەری باڵی پیرۆزی ڕونی خۆی بەسەر هەمو ئادەمیزادا ڕائەکێشی.

کاروباری میری هەروەها بەبێ دادپەروەری ئەڕۆیشت هەتا ئیسلام سەری هەڵدا و ڕوی ڕوناکی خۆی بەسەر زەویدا دەرخست. دژی ئەو ڕژێمە کۆنە پەرستانە بۆ سودی هەژاران بەشێکی دیاری کراوی شیاو بۆ هەمو کەسێ لە سامانی سەرمایەداران و هەمو خاوەن دارایی دیاری کرد بۆیان.

بەگوێرە سامانیان بدرێ بە هەژاران و ناویان نا زەکات، بە جۆرێکی داد پەروەرانە بەش بکرێ بەسەریانا کە بێ وێنە بێ و لە هیچ یاسایەکا شتی وا چاك نەبینرابێ لە کۆن و لەتازەدا. بەسە بۆ سودی زەکات ئادەمیزاد ڕزگار ئەکا لە ڕژدی و بێ نرخی و دڵ ڕەقی و خوێتی و چاو چنۆکی و سامانی یەکتری خواردن بەبێ ماندو بون و ئارەق ڕژاندن، پاکیان ئەکااتەوە لە کاری ناڕەوای ناو کۆمەڵ کەئەبنە هۆی دەست درێژی و دوژمنایەتی و جەنگ و ئاژاوە.

بۆمان سەلمێنرا هەژاری بۆ چینی خوارەوەی کۆمەڵ لە کۆمەڵگەی ئادەمیزادا خراپترین دەردی بێ دەرمانن ئەگەرە چارەیە بۆنەمانی هەژاریان نەکرێ. هەژاری پاڵ بەهەژارانەوە ئەنێ کە خراپترین کاری ناڕەوای زۆر بکەن هەتا پارەو نانێ پەیدا بکەن و پێی بژین، لە برسێتی ڕزگاریان بێ، وەلە برسێتی هەمو کارێکی خراپ ئەکەن، ئیتر ئەو کارە ڕەوابێ یان ناڕەوا، بە مان گرتن و خۆ پیشاندان هەزاران کوژراو بریندار یان لێ پەیدا ئەبێ، بەدەیان خانووبەرە و کەرەسە ئاگری تێ بەرئەدەن، ئەو گەلە توشی کاری دڕوندا نەئەبن و بەڕەوای دائەنێن، هەر بۆ نەبەستی خۆیان، ئەو گەلانەی هەژاربن بەدەیان تاقم و کۆمەڵ و پارتیان تێدا پەیدا ئەبێ، هەریەکەیان دژی ئەوی تریانن.

بەڕاستی ئەتوانین بڵێین: ئەگەر کاربەدەستانی ئیسلام کاریان بەدەستوری ئیسلام بکردایە، بە ملیار پارەیان پەیدا ئەکرد، پێویستی هەژارانیان پێ ئەبەست، جێگەی زۆرترین

باجی نارەوایان پێ پڕ ئەکردەوە. کەواتە بۆمان ڕون بویەوە زەکات پەیڕەوە کۆمەڵایەتیەکە یەکێتی نێوان هەمو چینەکانی ئادەمیزاد ئەکێشێ بە شێوەیەکی دادپەروەرانە. ئیسلام یەکەمین یاسایە پێش هەمو ئادەمیزاد کەوتبێ بۆ دانانی زەکات، جگەی ئیسلام چاویان لەوان کردوە، کە هەریەکەیان بەجۆرێ باجیان خستوتە سەر دانیشتوانیان.

**بۆ زانین:** پیت و دەسکەوتی دەرهێنراو لە نێوزەوی پێویستە کتوپڕ چل یەکی بدرێ بە هەژاران، بۆیە دانانی دەستوری زەکات هەمو بەشەکانی سامان ئادەمیزاد ئەگرێتەوە و بەشی هەموویانیشی دیاری کردوە بە جۆرێکی ڕێك و پێکی دادپەروەرانە. کەواتە چارە نامێنێ ئەبێ بسەلمێنرێ کە پێغەمەرێ ﴿ ﷺ ﴾ لە نێو دورگەی عەرەب پێ گەیشتبێ، بەو نەخوێنەواریەناتوانێ یاسای وادابنێ لەخۆیەوە، ئەوەیش بەڵگەیەکی بڕندە و بێ گومانە کە یاسای ئیسلام هەموی لەلایەن خواوە هاتوە و ڕێك خراوە. زەکات جێگەی بەرزی هەیە لە ئیسلامدا، بۆیە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا (٢٣) جار باسی کردوە بە فەرمان دان بەدانی، هەڕەشە کردن لەسەر نەدانی... زەکات لە (٥) پێنج شتا پێویست کراوە:

**یەکەم:** چوار پێ کە لەباسی زەکاتا بریتین لە هوشتر و ڕەشە وڵاخ و گامێش و بزن و مەڕ مەرجی پێویست بونی زەکات لەوانەدا (٦) شەش شتن:

(١) پێویستە زەکات دەر موسڵمان بێ، بێ باوەڕ زەکاتی لەسەر پێویست نیە.

(٢) ئەبێ ئەو کەسە زەکاتی لەسەرەسەر بەستبێ، بەندە زەکاتی لەسەر پێویست نیە.

(٣) خاوەنێتی تەواوی بۆ ئەو شتانە هەبێ زەکاتی لێ ئەدا، بۆ وێنەکڕراو بەر لەوەرگرتنی کڕاوەکە زەکاتی لەسەر پێویست نیە.

(٤) ئەندازەی دیاری کرا بۆ زەکات دان لەو شتانەدا زەکات دەر ئەکرێ هەیبێ ، بۆ نمونە پێنج هوشتری هەبێ، ڕەشە وڵاخ (٣٠) سەر بزن و مەڕ (٤٠) سەری هەبێ، هەروەها.

(٥) تێپەڕ بونی یەك ساڵ بەسەریانا (الحول) لە ساڵێ کەمتر بێ زەکات پێویست نابێ.

(٦) ئەبێ بەهۆی خۆیانەوە خواردن بخۆن. دابەستەو ئەوانەی ئالفیان بۆ بکڕێ زەکاتیان پێویست نەکراوە.

هوشتر هەتا ئەگەنە (٥) پێنج سەر زەکات پێویست نابێ، بەجۆرەی خوارەوە زەکاتیان ئەدرێ:

لەپێنج سەر هوشتر هەتا نۆ سەر یەك سەر کاوڕی یەك ساڵە، یا بزنێکی دوو ساڵە ئەدرێ لە زەکات. (١٠) دەسەر هوشتر هەتا (١٤) چواردە سەر (٢) دوو سەر مەڕی یەك ساڵە، یادوو سەر بزنی تەمەن دوو ساڵە ئەدرێ لە زەکاتیانا. (١٥) پازدە سەر هەتا (١٩) نۆزدە سەر سێ مەڕی یەك ساڵە یا سێ سەر بزنی دوو ساڵە ئەدرێ لەزەکاتیانا. (٢٠) بیست سەر هەتا (٢٤) بیست و چوار (٤) چوار مەڕی یەك ساڵە، یا چوار بزنی دوو ساڵە ئەدرێ لە زەکاتیانا. (٢٥) سەر هەتا (٣٥) سەر بێچوە هوشترێکی یەك ساڵانەیان بۆ ئەدرێ لە زەکاتا. (٣٦) سەر هوشتر هەتا (٤٥) سەر بێچوە هوشترێکی دوو ساڵەیان بۆ ئەدرێ لە زەکاتا. (٤٦) سەر هوشتر هەتا (٦٠) شەست سەر هوشترێکی سێ ساڵەیان بۆ ئەدرێ لەزەکاتا. (٦١) سەر هوشتر هەتا (٧٤) حەفتاو چوار سەر هوشترێکی چوار ساڵەیان بۆ ئەدرێ لە زەکاتا. (٧٥) سەر هوشتر هەتا (٩٠) سەر (٢) بێچوە هوشتری دووساڵەیان بۆ ئەدرێ لە زەکاتا. (٩١) سەر هوشتر هەتا (١٢٠) دوو بێچوە هوشتری سێ ساڵەیان بۆ ئەدرێ لە زەکاتا. (١٢١) سەر هوشتر ی هەتا (١٣٠) سەسێ هوشتری دوو ساڵیان بۆ ئەدرێ لە زەکاتیانا. ئیتر هەتا ئەگاتە (١٣٩) سەر زەکاتەکەیان ناگۆڕێ. بەڵام کە بون بە (١٤٠) سەد و چل سەر لە هەموو چل سەرێ دوو ساڵەیکی هوشتر ئەدرێ لە زەکاتیانا، وە لە هەمو پەنجا سەرێ سێ ساڵێکی هوشتر ئەدرێ لە زەکاتا. یانێ لە (١٤٠) سەر هوشتر دووساڵ و سێ ساڵەیە هوشترێ ئەدرێ لە زەکاتیانا.

**تێبینی:** ئەوەی ئەدرێ لە زەکاتا پێویستە مێینە بێ، مەگەر هەمویان نێربن.. وەك یەك ساڵەی مەڕ و دوو ساڵەی بزن هاوتای یەکتر بن بۆ زەکات دان.

ڕەشە ولاخ و گامێش هەتا نەگەنە (٣٠) سی سەر زەکاتیان پێویست نەکراوە، بەم جۆرەی خوارەوە زەکاتیان ئەکرێ:

(٣٠) سەر ڕەشە ولاخ هەتا (٣٩) سەر گوێرەکەیەکی یەك ساڵە مێینە ئەدرێ لە زەکاتیانا.

(٤٠) چل سەر ، کوێرەکەێکی دوو ساڵەی مێینە ئەدرێ لە زەکاتیانا، ئیتر پێویستە ناگۆڕی هەتا (٥٠) پەنجا سەر کە لە (٥٠) سەر زۆرتربون لە هەمو پەننجا سەرێ دوو ساڵەیەکو لە هەمو چل سەرێ یەك ساڵیە ئەدرێ لە زەکاتا. یانێ لە (٩٠) سەر یەك ساڵەیەکو دوو ساڵەیە ئەدرێ لە زەکاتیانا.

مەڕ و بزن هەتا نەگەنە (٤٠) سەر زەکاتیان لەسەر نیە کەبون بە چل سەر بەم جۆرەی خوارەوە زەکاتیان لێ دەر ئەکرێ:

لە (٤٠) سەر هەتا (١٢٠) سەر مەڕێکی یەك ساڵە یا بزنێکی دوو ساڵە ئەدرێ لە زەکاتیانا.

وە (١٢١) هەتا (٢٠٠) سەر دوو مەڕی یەك ساڵە یا دوو بزنی دوو ساڵە ئەدرێ لە زەکاتیانا.

وە (٢٠١) سەر هەتا (٣٩٩) سەر سێ مەڕی یەك ساڵە یا سێ بزنی دوو ساڵ ئەدرێ لە زەکاتا.

(٤٠٠) سەر مەڕ یا بزن (٤) سەر مەڕی یەك ساڵ یا چوار بزنی دوو ساڵە ئەدرێ لە زەکاتا. یانێ دووایی لە هەمو (١٠٠) سەرێ یەك مەڕی یەك ساڵە یا یەك بزنی دوو ساڵە ئەدرێ لە زەکاتا.

مەرجە بۆ پێویستبونی زەکات لە زێڕ و زەیو (٥) پێنج شت:

(١) ئیسلامەتی، بێ باوەڕ زەکاتی لەسەر پێویست نیە.

(٢) سەربەستی، بەندە زەکاتی لەسەر پێویست نیە.

(٣) ئەندازەی دیاری کراو بۆ زێڕ بگاتە (٢٠) بیست مسقاڵ. بۆ زیو بگاتە (٢٠٠) دوو سەد درهەم. ئەوکاتە زەکاتیان لێ ئەدرێ.

(٤) خاوەنێتی تەوا و بۆ زەکات دەر، لە کڕین و فرۆشتنا هەتا وەریان نەگرێ زەکاتیان پێویست نیە.

(٥) تێپەڕ بونی یەك ساڵ بەسەریانا، کەمتر لە ساڵی زەکات پێویست نیە لەواندا زێڕ و زیو ئەندازەکەیان گەیشتە(٢٠) مسقاڵ بۆ زێڕ، (٢٠٠) درهەم بۆ زیو، لە هەردوو لایانا بە چل یەك زەکاتیان لێ دەر ئەکرێ.

**تێبینی:** شخڵی ژنان زەکاتی لێ ناکەوێ، مەگەر ئەندازەکەی زۆر بێ بەگوێرەی دام و دەزگای ئەو شوێنە. بەڵام ئەو زێڕ زیوانە بەکارهێنانیان قەدەغەیە وەك قاپ و کەرەسەی ناو ماڵ، ئەو شخڵانەی پیاوان بەکاری بهێنن زەکاتیان لێ ئەدرێ.

مەرجە بۆ پێویستبونی زەکات لەگشت کاڵاو دانەوێڵە و مێوژ و خورما (٢) دوو شت:

(١) چێنراوی ئادەمیزادبێ، ئەوانەی خۆیان سەوز ئەبن و ئەڕوێنرێن لە زەویدا زەکاتیان تێدا نیە، بۆ ژیانی ئادەمیزادیش شیاو بێ هەڵگرتنی.

(٢) دوو بگاتە ئەندازەی دیاری کراو بۆیان، ئەندازەی دیاری کراویش بۆیان ئەگەر بەبێ توێکڵ هەڵگیرێن بریتیە لە (٥) ویسق کە ئەکاتە (٦٣١) شەش سەد و سی و یەك کیلۆ گرام. ئەگەر بە توێکڵەوە هەڵگیرێن وەك چەڵتوك ئەبێ بگاتە (١٢٦٢) هەزار و دووسەد و شەست و دوو کیلۆ گرام، کە گەیشتە ئەو ئەندازەیە لەهەر (١٠) دەکیلۆ بەیەك کیلۆ ئەدرێ لە زەکاتا دانە وێڵەو کشت و کاڵ ئەگەر بە دۆڵچە یا ئاویان بۆ ئەگەڕرا یا بە وڵاخ ئاویان ئەدرا پێویستەکەیان ئەبێتە بیست یەك. ئەو دانەوێڵەو کشت و کاڵانە زەکاتیان لێ ئەدرێ، وەك گەنم، جۆ، نۆك، نیسك، ماش، برنج، گەنمە شامی.

مەرجە بۆ پێویست بونی زەکات لەمیوەدا وەك مێوژ و خورما (٤) چوار شت:

(١) ئیسلامەتی، بێ باوەڕ زەکاتی لەسەر پێویست نیە.

(٢) سەربەستی، بەندە زەکاتی لە سەر پێویست نیە.

(٣) ئەندازەی دیاری کراو بۆیان کە بریتیە لە (٦٣١) کیلۆ گرام هەر وەك دانەوێڵـە، وەگەیشـتنە ئـەو ئەندازەیـە لـە هـەمو (١٠) وەکیلۆیـەك کیلۆدەرئـەکرێن. مەرجـە بـۆ پێویستبونی زەکات لەکەرەسەو پارچەی بازرگانی (٥) پێنج شت:

(١) ئیسلامەتی. (٢) سربەستی. (٣) ئەندازەو دیاری کـراو کـە نرخەکـەیان گەیشـتە بیست مسقاڵ زێڕ، یا دووسەد درهەم زیو، لەو کاتەدا لە هەر چل مسقاڵێ لە نرخەکـەیان زێڕبێ یەك مسقاڵ. زیوبێ (٥) درهەم ئەدرێ لە زەکاتا.. ئەگەر زێڕ و زیو لە کاتـەکانیانا هێنرانە دەرەوە و گەیشتنە بیست مسقاڵ زێڕ یا دووسەد درەم کوتوپڕ چل یـەك زەکاتیـان لێ دەرئەکرێ.

ئـەو زێـڕ و زیـوەی لـە زەویـدا شـاردرابێتەوە بـەر لـەهاتنی ئیسـلام و دۆزرانـەوە و دەرهێنران پێویستە دووای گەیشتنیان بە بیست مسقاڵ زێڕ یا دوو سەد درەم زیو پێویسـتە کوتو پڕ زەکاتی لێ دەربکرێ.

سەرفیترە پێویستە لەسەر هەمو کەسێ بەسێ مەرج:

(١) ئیسلامەتی، بێ باوەڕ سەرفیترەی لەسەر پێویست نیە.

(٢) بە ئاوابونی خۆر لە کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا.

(٣) لـە گوزەرانـی خۆیـی و ئـەو کەسـانەی پێویسـتبێ بـەخێو کردنیـان پڕبـێ. کـە ئەومەرجانە هاتنەدی. پێویستە هەمو کەسێ لە خۆیی و لەو کەسـانەی پێویسـتە بـەخێویان بکا بۆ هەریەکەیان (٢,١٠٠) دوو هەزار و سەد گرام لە دانەوێڵەدا لە خواردەمەنی ئـەو جێگەیە بە هەژاران بدرێ.

**بۆ ئاگاداری:** سەرفیترە لای شافیعیەکان یەك ساعە، ساعێ بریتیە لە چوار مـود، چـوار مودیش بریتیە لە (٢,١٠٠) دوو هەزار و سیو یـەك کیلـۆ گـرام. دروسـتە نرخـی ئـەو

دانەوێڵەیە بدرێ لە سەرفیترەدا بە هەژاران.. ئەو ئەندازەیەی سەرەوە گۆترە کاری نیە خۆم مودی پێغەمەرم ﴿ﷺ﴾ کێشاوە بەم جۆرەیە: بە نۆك (٥٥٠) گرام. بە برنج (٥٧٥) گرام. وە بەگەنم (٥٢٥) گرام.

پێویستە زەکات بەش بکرێ بەسەر ئەم کەسانەی خوارەوەدا کە (٨) هەشت تاقمن:

١- (الفقراء) بەو کەسانە ئەڵێن: هەژارن بۆ خۆی و بۆ خێزانەکەی (١٠) دە دیناری پێویست بێ لە ڕۆژێکا، بەڵام ئەو کەسە لە نیوەی ئەو ئەندازەیە کەمتر هەبێ، وەیا هیچ شتێکی تری نەبێ.

٢- (المساکین) بەو کەسانە ئەڵێن: لە نیوەی پێویستی ژیانی زۆرتری هەبێ. بەڵام نەگاتە ئەندازەی تەواوی پێویستی بۆ ژیانی ڕۆژانەی خۆیی و خێزانی.

٣- (العاملین علیها) بەو کەسانە ئەڵێن: کاربەستان دایان ئەنێن کاربکەن و زەکات کۆ بکەنەوە، لە نوسەر و بەش کەرانی زەکات بەسەر هەژاراندا.

٤- (المؤلّفە القلوب) بەو کەسانە ئەڵێن: دڵ نەوایان بکرێ لە تازە موسڵمان بووان و لە ڕێز گیراوانی ناو هۆز و خزمەکانیان، چاوە ڕووان بکرێ لەبەر ئەوە خزمەکانی موسڵمان بن، بەو کەسانەیش ئەڵێن: بە تەواوی باوەڕ نە چەسپیوە لە دڵیانا و تازە موسڵمانن، بۆ چەسپانی باوەڕ لە دڵیانا زەکاتیان ئەدرێتێ، یا بۆ ئەوەی بنە کۆسپ لە ڕێگەی بێ باوەڕاندا هەتا نەتوانن دەست درێژی بکەنە سەر موسڵمانان.

٥- (الرقاب) بەو کەسانە ئەڵێن: بەندەن و لەگەڵ گەورەکانیانا پێك هاتون لە چەند مانگێکا ئەندازەیەکی دیاری کراوی نێوانیان پارە بدەن بە گەورەکانیان، ئەو کەسانە زەکاتیان ئەدرێتێ هەتا بتوانن خۆیان لە بەندەی ڕزگار بکەن.

٦- (الغارمین) بەو کەسانە ئەڵێن: قەرزار بون و بەهۆی ژیانی خۆیان و خێزانیان و ئیتر یا دارایی خۆی دانابێ و قەرزار بێ لە گوناە کردندا، بەڵام گەڕابێتەوە و پەشیمان بوبێتەوە

لە گوناهەکانی، یا قەرزار بوبێ بەهۆی ئاشت کردنەوەی دوو تەیافەی دوژمن بە یەکتری بە هۆی کوژراوێی لە نێوانیانا.

وەیا قەرزار بوبێ بە بۆنەی کەفالەت کردنی کەسێکەوە، نەخۆی و نە ئەو کەسە نەیان بێ قەرزەکە بیژیرن، یا خۆی بەتەنها نەیبێ. بەڵام بە بێ دەستوری کەفالەت بۆ کراوە کە بوبێ بەکەفیل.

٧- (فی سبیل الله) بەو کەسانە ئەڵێن: خۆیانیان تەرخان کردوە بۆ جەنگ کردن لەگەڵ بێ باوەڕان ئەو کەسانە زەکاتیان ئەدرێتێ با هەژاریش نەبن، بۆ یارمەتی دانیان لەسەر ئەو مەبەستە پیرۆزە.

٨- (ابن السّبیل) بەو کەسانە ئەڵێن: لە ماڵی خۆیان دور کەوتونەتەوە، بۆ گوناه نەڕۆیشتبن، ئەو کەسانە زەکاتیان ئەدرێتێ بە گوێرەی پێویستی خۆیان هەتا ئەگەنەوە ماڵی خۆیان.

**تێبینی:** ١- بەش کردنی زەکات پێویستە ئەو هەشت تاقمانە بگرێتەوە، بەگوێرەی توانا، وە هەمویان پێویستە لە (٣) سێ کەس کەمتر نەبن، جگە لە عامیل ئەو با یەکەسیش بێ دروستە.

٢- ئەو کەسانەی زەکاتیان پێ ئەدرێ پێویستە سامانی وای نەبێ بەشی تەمەنی غالبی بکا، لە نەوەی هاشم و موتەلیب نەبن، بێ باوەڕ نەبن، لەو کەسانە نەبن بەخێو کەریان هەبێ.

٣- ئەو کەسانەی زەکاتیان پێ ئەدرێ، بە هەر بۆنەیەکەوە بوبێ توشی هەژاری بوون، چونکە لە جیهاندا پەرستن بۆ خوا ئەکەن و کارناکەن بۆ گوزەرانی خۆیان، قەدەغەیە زەکات وەربگرن بەڵام ئەو کەسانەی توشی هەژاری ئەبن لەبەر خوێندنی دەستوری پێویستی ئیسلام زەکاتیان ئەدرێتێ، وە بگرە پێویستە لەسەر موسڵمانان بە خێویان بکەن.

خوای گەورە هەندێ تر لە پڕوپاگەندەی خاوەن نامەکانمان بـۆ ئەگێڕێتـەوە کـە ئـەیان ووت: هەر ئێمە ڕانوماایمان وەرگرتوە، بەهەشت هەر بۆ ئێمەیە، کەچی هەریەکەیان ئـەوی تریانان بەدرۆ ئەخستەوە. ئەگێڕنـەوە نوێنـەری گاورەکـانی (نـەجران) هـاتن بـۆ مەدینـە، مالومەکانی جولەکە هاتن بۆلایان، لە خزمەت پێغەمبـەردا دەسـتیان کـرد بـە ووتووێـژ و جنێودان بە یەکتری، هەریەکەیان ئایینی خۆیانیان بەڕاست ئەزانی، هەردولا نامـەیخۆیانیان ئەخوێندەوە جولەکەکان بڕوایان بە عیسا و ئینجیل نەبو، وە گاورەکان باوەڕیان بە موسا و بە تەورات نەبو، هەروەك بت پەرستان بڕوایان بە هیچ ئاینـێ نـەبو، خـوای گـەورە ڕونـی ئەکاتەوە ئەفەرموێ:

وَقَالُوا۟ لَن يَدْخُلَ ٱلْجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ ۗ تِلْكَ أَمَانِيُّهُمْ ۗ قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١١١﴾ بَلَىٰ مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَلَهُۥٓ أَجْرُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١١٢﴾ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ لَيْسَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ عَلَىٰ شَىْءٍ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ لَيْسَتِ ٱلْيَهُودُ عَلَىٰ شَىْءٍ وَهُمْ يَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ ۗ كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ مِثْلَ قَوْلِهِمْ ۚ فَٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿١١٣﴾

﴿وقالوا لن يدخل الجنّة إلاّ من كان هوداً أو نصارى﴾ وە جولەکەکان و کاورەکان ئەیان ووت: ناچێتە بەهەشت مەگەر کەسێ جولەکە بێ یا گاور بێ. یانێ جولەکەکان ئەیان ووت: هەر جولەکە ئەچێتە بەهەشت، گاورەکانەیان ووت: هەر گاور ئەچێتە بەهەشت.

﴿تلك أمانيّهم﴾ ئەو بیرو بۆچونەی جولەکەکان و گاورەکان کە هەرخۆیان ئەچنە بەهەشت چەندجین ئاواتی ئەوانە، ئاواتیان زۆرە: هەندێکیان ئەمەیە کە موسلمانان وەرئەگەڕێنەوە بۆ لای بێ باوەڕی، سزای دوژمنانی جولەکەو گاورەکان ئەدرێ، بەهەشت هەر تەنها بۆ ئەوانە.

﴿قل هاتوا برهانكم﴾ موحەمەد تۆ بلێ: ئێوە بەڵگەی خۆتان بهێنن لەسەر ئەوەی کە هەر ئێوە بە تەنها ئەچنە بەهەشت، کەسی تر جگەی ئێوە ناچێتە بەهەشت.

﴿إن كنتم صادقين﴾ ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن لە داوای خۆتانا، هەمو داوایە پێویستە کە بەڵگەیکی سەولمێنراوی هەبێ، پێویستە ئێوەش بەڵگە بهێننەوە، هەتا لە کۆتایدا وای لێ بێ هەمو زانایان و ژیرەکانیان گومانیان نەمێنێ، وەك ئەوەی لیێ ئاگر گەرمە و ژمارە (١٠) لە (٥) زۆرترە کە پێویستیان بە بەڵگە نیە، ڕونە ئێوە بەڵگەی واتان دەست ناکەوێ. کەواتە داواکەتان بێ بەڵگەیە.

تەفسیری (ئەلەنار) مانای ئەو ئایەتە بەم جۆرە ئەکا و ئەڵێ: موسڵمانانی پێشو بەو جۆرە کاریان ئەکرد هیچ شتێکیان بەبێ بەڵگە نە ئەکرد و نەیان ئەوت، هەرکەسێ هەرشتێکی بووتایە ئەیان ووت: بەڵگەت چ شتێکە؟ لە پڕ خۆیانیان نە ئەکرد بە بچوك و گوێڕایەڵیان، بە گوێرەی زانیاری خۆیان ئاینیان ئەبرد بە ڕێوە، بەلاسایی کردنەوەی کەس کاریان نە ئەکرد. بەڵام پیاوە خراپەکانی دوایی بە پێچەوانەی ناوەڕۆکی ئەو ئایەتەوە کاریان کرد، ئەیان ووت: هەر شتێ زانا پێشچوەکان ووتویانە بڕوامان پێیان هەیە و کاریان پێ ئەکەین، قەدەغەیە بلێن: بۆچی ئەبێ وابێ؟ وایان بە دانیشتوان کرد بە

فەرمودەی خوا و پێغەمەر هەڵنەسن، بە واتاو بە گفتو گۆی ئەم زانا و ئەو زانا کاربکـەین، بە مەرجێ بیرو بۆچونی ئەو زانایانە دوربێ لە فەرمودەی خوای مەزن ئەو پـەڕی ڕێـزم بـۆ خاوەنی تەفسیری (ئەلمەنار) ئەو زانا و پێشەوا پێشوانە ئەو شتەی فەرمویانە بێ بەڵگـە نیـە، هەر فەرموودەیەکیان ووتبێ، پێیان بێژراوە بۆچی؟ ئەوانیش فەرمویانـە: بەڵگـەمان قورئانـە یان فەرمودەی پێغەمەر یا ئیجماع یاقیاسە. کەواتە لە ناوەڕۆکا ئێمە بـەگفتو گـۆی ئـەوان هەڵنەسین، بەڵگەمان ئەوەیە ئەوان بۆ ئێمەیان گێڕاوەتەوە لەو سەرچاوە بێگومانا ئەوە بگرە ئەگەر ئەو پێشەوایانە نەبوایە ئەو مـیرات و کەلـەپورە بەنرخـەیان بـەجێ نەهێشـتایە ئـەو، مامۆستا دووایییەی ئەوان نـەیان ئـەتوانی نەباسـی قورئـان بکـەن و نەباسـی فـەرمودەکانی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ ئەگەر ئەوان نەبونایە چ کەسێ تـر ئـەو سـەرچاوە پیرۆزانـەیان بـۆ ئێمـە ئەگێڕایەوە، خاوەنی تەفسیری ئەلمەنار بە دەستە وەسـان دا ئەنیشـت و سـەرچاوە نـە ئـەبو باسی یاسای ئیسلام بکا.

لەو ئایەتە پیرۆزەوە دەر ئەکەوێ گاور و جولەکەکان هەر لـە کۆنـەوە هـەمو شـتێکی چاکیان هەر بۆ خۆیان ویستوە، خۆشی هەردوو جیهانیان بـۆ خۆیـان دانـاوە، وەك بۆمـان ڕون بویەوە بەهەشتیان بەتاپۆی ئایینی خۆیان داناوە، بۆیـە کلیسـایەکان چـەکی لێ خـۆش بونیان بەگوناه باران ئەفرۆشت بە پارەو پول بـە نـەزان و نەفامـەکانی خۆیـان، بـەو کـارە نارەوایە سامانی زۆریان بەدەست ئەهێنا بـۆ پیـاوە ئاینیـەکانیان، ڕێگـەی داوێـن پیسـی و گوناهیان بۆ تاوانباران ئەکردەوە، هانیان ئەدان هەرشتێ ئەکەن بیکەن، دەقی ئەو چەکـەی لێ خۆشبونە بەم جۆرە ئەنوسی: (پێوە دراوە لە تۆ ئەی گوناهبار: ئەودەرگایە تاوانباران پێیا ئەڕۆن بۆلای سزاو تۆڵە، ئەو دەرگایـەت بـۆ کراوەتـەوە تـۆ تێپـەڕ ئەکـەی بـەوا بـۆلای بەهەشت، با بەدرێژی ساڵ لە گوناها بیت ئەو چاکەیەت بـۆ ئەمێنێتـەوە و نـاگۆڕێ هـەتا ڕۆژی دووایی، بەناوی باوك و کوڕو گیانی پیرۆزەوە)

﴿بلی من أسلم وجهه لله﴾ ئەوەی ئێوەی خاوەن نامە ئەی لێن وانیە: هەركەسێ خۆی تەرخان كرد بێ بۆ خواپەرستی بە نیازی پاكەوە لەكردارەكانیا، بۆنی هاوبەشدانان و دوورِویی تێدا نەبو، ئەو كەسە لە ڕێز گیراوەكانی لای خوایە.

﴿وهو محسنٌ﴾ وە ئەو كەسە چاكە كەربێ لە هەمو كارو كردەوەیدا، وابزانێ نزیك بونەوە لە خوا هەر بەكردەوە چاكەكانە، نەك بە كردەوەی خراپ و زیان بەخش.

﴿فله أجره عند ربّهِ﴾ دووایی بۆ ئەو كەسە هەیە پاداشتی كردەوەكانی لەخزمەت پەروەردگارەكەی خۆیا لە بەهەشتا بەبێ كەم و كوڕی.

﴿ولا خوفٌ علیهم ولا هم یحزنون﴾ وە ئەو كەسانە ترسیان لەسەر نیە و ئەوان خەفەت بار نین لە ڕۆژی دوایدا كاتێ ئەچنە بەهەشت، لەو ڕۆژەدا هەمو ئادەمیزاد لە ترس و لە خەفەتایە باوەڕداران ئەترسن نەوەك خوا پەرستی و چاكەیان وەرنەگیرابێ لە خزمەت خوادا. بێ باوەڕان لە سزای خوادان، سامان و گێرە شێوێنی جیهانیان بو بەهۆی مانەوەیان لە دۆزەخدا.

خوای گەورە بەو ئایەتە خاوەن نامەكان بەدرۆ ئەخاتەوە كە بەهەشت هەر بۆ ئەوانە. فەرموی: ئەو كەسە خۆی تەرخان كردبێ بۆ خوا و چاكە كەربێ هەر ئەوان پاتداشتیان بۆ هەیە ناترسن و خەفەتبار نین.

﴿وقالت الیهودُ لیست النصاری علی شيءٍ﴾ وە جولەكەكان ئەیان ووت: گاورەكان لەسەر هیچ ئایینێ نین، هەرشتێ ئەوان ئەیلێن ڕاست نیە.

﴿وقالت النّصاری لیست الیهود علی شيءٍ﴾ وە گاوەڕكان ئەیان ووت: جولەكەكان لەسەر هیچ ئایینێ نین، هەر شتێ ئەوان ئەیلێن ڕاست نیە.

﴿وهم یتلون الكتاب﴾ وەخاوەن نامەكان ئەخوێننەوە نامەكانی خوا لە تەورات و لە ئینجیل، وە خۆیان بە خوێنەوار و بە زانا ئەزانن، ئەوان ئەگەر نامەیە لە نامەكانی خۆیان بخوێندایە وە بەڕاستی باوەڕیان ئەهێنا بە نامەكانی یەكتری، چونكە هەمو نامەكان یەكتری

بەڕاست دائەنێن، لە تەوراتا مژدە بە هاتنی عیسا دراوە، لە ئینجیلا موژدە بە هاتنی موحەمەد دڕاوە.. دووایی چۆن موسڵمان بێ باوەڕی ئەدەن بەسەر یەکتریدا، قورئان ئەخوێنینەوە، کەواتە با لەخوا بترسن و زمان لانەدەن لە ناوەڕۆکی قورئان، دڵیان لە مەبەستی کوێر نەبێ.

﴿كذلك قال الّذين لايَعْلَمونَ مثل قولهم ﴾ هەر بەو جۆرە خاوەن نامەکان ئەیان ووت: کەسانێکی ئەو تۆ هیچ شتێ نازانن لە بت پەرستان ئەیان ووت وێنەی گفتو گۆی خاوەن نامەکان کەئەوان نەبێ کەسی تر ناچێتە بەهەشت .

﴿ فالله يحكم بينهم يوم القيامه ﴾ دوایی خودا فەرمان ئەدا لەنێوانیانا لە ڕۆژی دواییدا

﴿ فيما كانوا فيه يختلفون ﴾ لە شتێکا ئەوان لەو شتەدا ئاژاوەیانە و لە دوو بەرەکیدان کە ئەو سێ تاقمە ئەڵێن لە جولەکەکان و گاورەکان و بت پەرستان. ئەڵێن : هەر ئێمە ئەچینە بەهەشت.

**بۆ زانین:** لەم سەردەمەدا بە چاوی خۆمان بینیمان، بە گوێی خۆمان بیستمان کە گاور و جولەکەکان پرۆژەیەکی تایبەتیان دارشت لە نێوان خۆیانا لە دژی موسڵمان و داگیرکردنی نیشتمانی موسڵمانان.. ئەوە زانراوە و ناسراوە بۆ هەمو کەسێ کە ئاینی گاورەکان لە کۆنەوە بڕیاریان داوە جولەکەکان عیسای خوای ئەوانیان کوشتوە و هەڵیان واسیوە، بە پێچەوانەی ئاینی ئیسلام کە ئەفەرموێ: نە عیسایان کوشتوە و نە هەڵیان واسیوە کەچی (پاپا ڕۆما) ئەو پەڕی هەوڵی خۆی خستە کار بۆ بەدرۆ خستنەوەی خۆیان.

لەساڵی (١٩٦٥) بۆ لابردنی ئەو تاوانەی کوشتنی عیسا لەسەر جولەکان و نەوەکانیان، بۆ ئەو مەبەستە چوار کۆبونەوەی پێك هێنا، (٢٠) بیست ملیۆن دۆلاری تێچو، ئەو تاوانەی لەسەر لابردن. کەواتە هەر لە کۆنەوە پاپاکان لەلایەن خۆیانەوە ئایینیان دروست کردوە، بە گوێرەی مەبەستی خۆیان ئەی گۆڕن، لەسەر لابردنی ئەو

تاوانە لەگەڵ کلێسای ڕۆژ هەڵاتی بوبە ئاژاوە و ناکۆکیان، ڕون بویەوە هەمو کردەوەی پاپاکان ڕامیاریە نەك ئایینی، ئەمەیشمان فێر ئەکەن ئایین لەلای ئەوان بریتیە لە پارەو پول پەیدا کردن و داگیر کردنی نیشتمانی موسڵمانان جەنگی خاچ پەرستی تازە ئەکەنەوە، سەر شۆڕی خۆیان و ڕاو نانیان لە فەلەستین بە بەسەرۆکایەتی پاڵەوانی کورد (سەلاحەدین) ئەسڕنەوە ، ئارەقی شەرمەزاری باو باپیریان وشك ئەکەنەوە.. زۆر جێگەی سەر سوڕمانە کە گاور و جولەکە لایەنی یەکتری بگرن. هەریەکەیان نامەیەکی تایبەتی و ئاینێکی تایبەتیان هەیە کەچی موسڵمانان پشتی یەکتر ناگرن . لە ڕاستیدا یەك کۆمەڵن و یەك خوا و یەك نامە و یەك پێغەمبەریان هەیە و بۆ ئەبێ موسڵمان لە نێو خۆیانا یەك نەبن، بۆ ئەبێ هەرلایێ ئەو لایەنەی تر بەبێ باوەڕ دانێ؟ بۆ ئەو هەموە بیروباوەڕە جیاوازە پەیدابێ لەنێوانیانا؟ بۆ ئەبێ بکەونە جەنگ و ئاژاوە لەگەڵ یەکتریدا؟ بۆ ئەبێ ڕەگەز پەرستی بخەینە کارەوە لە دژی یەکتری؟ ئەی بۆ سودی یەکتریان مەبەست نەبێ لە دژی داگیر کەرانمان؟ ئەگەر لەمانای ئەو ئایەتە وردببنەوە جولەکە و گاورەکان یەکتری بەبێ باوەڕ دائەنێن، بەراوەردیان بکەین لەگەڵ خۆماندا، ئێمە بە هەزاران لەوان خوا بترین، ئەوان دوو پێغەمەر دوو ئایینی جیاوازیان هەیە، کەچی لە دژی ئێمەی موسڵمان بوون بەیەك، ئێمە یەك پێغەمەر و یەك ئایینمان هەیە کەچی یەك ناگرین، بە پێچەوانەوە بووین بە دوژمنی یەکتری. بەداخەوە قورئان ئەخوێنینەوە، بائەوانە بەدەم قورئان ئەخوێنن و بەدڵ کوێرن لە خوا بترسن، بەکورتی خوای گەورە وەڵامی جولەکە و گاورەکان ئەداتەوە بەم شتانەی خوارەوە:

١- ڕاستی پەیوەندی بەوە نیە کە ئەبێ بۆ چەندین کەسێ بێ، یا بۆ کەسانی ناودار و خاوەن ناوبن، چونی بەهەشت پەیوەستە بە باوەڕ و کردەوەی چاکەوە نەك بەئاواتەوە.

٢- بەڕاسی خوای گەورە چاکە کاران و خراپە کاران ئەناسێ پاداشت و تۆڵەی هەردوولایان ئەداتەوە. هەمو ئایین پەرستان و کۆمەڵ و پارت و تاقمێ بەلایانەوە وایە

خۆیان ڕاستن و جگەی خۆیان درۆن بەزەقی لاسایی گاور و جولەکە بت پەرستەکان ئەکەنەوە کە هەریەکەیان خۆیانیان بەڕاست ئەزانن. کەواتە ئێمە چۆنمان بۆ ڕوون ببێتەوە چ کەسێ ڕاست گۆیە و ڕاست ئەکا لە داواکاری خۆیا، بەر لەوەی ئێمە وڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە، پێویستمان بەم پێشەکیەی خوارەوە هەیە، ئەو کەسەی داوای ڕاستی ئەکا و ئەڵێ: من ڕاستم، داواکاریەکەی لەم دووانە بەدەر نیە:

١- یا کەسێکە بڕوای بە بیروباوەڕی خۆی هەیە و هۆگری بوە، بە جۆرێ لای وایە هەر ئەو بیرو باوەڕەی ئەو ڕاستە و شایستەی خراپەی لێ ناکرێ، گوێ لە هیچ بەڵگەیە ناگرێ کە پێچەوانەی بیروباوەڕەکەی ئەو بێ بەهەر شێوەیە بێ.

٢- یا ئەو کەسەی داوای ڕاستی ئەکا، ئەیەوێ بگەڕێ بەشوێن ڕاستیدا، کۆششی خۆی بۆ ئەخاتە کارەوە بۆ دۆزینەوەی ڕاستی، بە وردی بۆیدا ئەچێ هەتا بە بڕوای خۆی ڕاستی ئەدۆزێتەوە بە بەڵگەو نیشانە.

ئەو کەسە بڕوا بەڕاستی ئەهێنێ با لەلای یەکێ ترەوە بۆ ڕوون ببێتەوە، کاتێ بیروباوەڕی ئەو کەسەی لا چاکبێ واز لەوەی خۆی ئەهێنێ، چونکە ئەو ڕاستی ئەوێ بالای کەسێ ترەوە بێ دووایی پێویستە درێژەی ئەو بیرو باوەڕانە بەکورتی باس بکەین. دەربارەی یەکەمیان ڕێگەی بۆ نادۆزرێتەوە کە پێی بسەلمێنرێ. نە بەئەقڵ و نە بەبەڵگە، چونکە بۆ یەکەم جار ڕێگەی ئەو شتانەی لە خۆ گرتوە، بگرە ئەوەی ئەیڵێ دەردی بێ دەرمانە، پێویستە وازی لێ بهێنین.. دووهەمیان گفتو گۆ لە گەڵیا ئاسانە، چونکە دووایی بەڵگەو پرسیار کەوتوە لە هەرلایەکەوە ڕاستی بۆ هات باوەشی بۆ ئەگرێتەوە، هەمو دانیشتوان ئەزانن هەندێ شت هەن خۆی لە خۆیا ڕونە و کەس گومانی لەوەدا نیە، وەك هەرزانی، خۆشی. بەختیاری هەژاری. شوم و نەگبەتی. دۆستایەتی چاکترە لە دوژمنایەتی. یارمەتی چاکترە لە ئاژاوەنانەوە. ئاشتی چاکترە لە جەنگ. زانین و زانیاری ڕوناکیە. نە

خۆشی و نە خوێنەواری تاریکیە داد پەروەرێ ڕاستیە. ستەم و پرو پـوچ ناڕەوایـە. ئەوانـە پێویستیان بە بەڵگە نیە.

کاتێ ئەو پێشەکیەمان زانی، ئەگەر کەسێ داوایـەکی کـرد و ووتـی: مـن ڕاسـتم لـە داواکاری خۆما، جگە لەمن کەسی تر ڕاست ناکا، ئێمـە بـەراوردی ئـەو داوایـە ئەکـەین لەگەڵ ئەو دوو شتانەی پێشودا، ئەگەر لەگەڵیانا گونجـا و سـەری بـۆ ڕاسـتی دانـەواند، ئێمەیش باوەڕی پێ ئەکەین، ئەگەر دژی ئەو ڕاستیانە بو ئێمە بە پروچی دائـەنێن. ئەیخەینـە ئەو لاوە، چونکە ئەگەر بە ووتنی ئەو بێ و گوێمان لـــە بەڵگـە نـەبێ، پێویسـتە دەرگـای قوتابخانە و زانکۆ و مزگەوتەکان داخەین، نرخ نـــە بـۆ ئـەقڵ، نـە بـۆ یاسـا و ڕەوشـت و دادگاکان دانەنێن، سەرگەردانی و نەزانین بڵاو ببێتەوە، هەمو کەسێ بەرەو شوێنی بـڕوا و بلێن و نەیکەن.

وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ أَن يُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ وَسَعَىٰ فِى خَرَابِهَآ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ مَا كَانَ لَهُمْ أَن يَدْخُلُوهَآ إِلَّا خَآئِفِينَ ۚ لَهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا خِزْىٌ وَلَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١١٤﴾

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە ئەمەیە: (تەیتوسی) ڕۆمی پاشای گاورەکان لــە سـاڵی (٧٠) حەفتای زاینیـدا خـۆی و سـوپاکەی پـەلاماری جولەکـەکانی دا، جـەنگاوەرەکانی جولەکەکانی کوشت ژن و منداڵەکانیانی بەدیل گرتن، بەیتولموقەدەسی ڕوخاند، مردارۆ بـو و پیسی تری فڕێدایە ناویەوە، تەوراتیان سوتاند، بەرازیان لە نێو بەیتولموقەدەسدا سەر بڕی. هەروەها بەیتولموقەدەس بە کاولی مایەوە هەتا کاتێ عومەری کوڕی خەتاب ڕزگاری کردلە

دەستی ڕۆمەکان بەو سامانەی لە ئاگر پەرستەکان گیرابو، بەیتولموقەدەسی پێ چاك کردەوە بۆ جاری دووهەم خاچ پەرستەکان داگیریان کردەوە و قەسابخانەیان بۆ موسڵمانەکان دانا، ماوەی پتر لە سەد ساڵ بەدەستیانەوە بـو، هـەتا سـوڵتان سـەلاحەدین بـە خـۆی و سـوپا کوردەکان و هەندێ لە نەتەوەکانی تریش لەساڵی (٥٨٥) پێنج سەد و هەشـتا و پێنـج دا کۆچیدا زۆر بە سەربەرزیموسڵمانان و دادپەروەری لەگەڵ خاچ پەرستان لە بیروباوەڕی ڕەگەز پەرستانەی ئەوانی ڕزگار کرد. خاچ پەرستان بە سەر شۆڕی ڕاونران لە سەرداوای خۆیان چونەوە بۆ ئەوزوپا. بۆ جاری سێهەم لە ساڵی (١٩٤٨) جولەکەکان و زاوێنیەکان بەیارمەتی ڕژێمەکانی ڕۆژ ئاوایەکان بە تایبەتی بەریتانیا قاچی خۆیانیان فڕێدایە بۆ نێو خاکی فەلەستینەوە.

ووردەیە بەیارمەتی ئیمپریالزمی ئەمریکا بەیتولموقەدەسیان داگیر کرد.

هۆی تر بۆ هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە ئەمەیە: پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾ لـە سـاڵی (٦) شەشـی کۆچیدا خۆشی کەوتە دڵی خۆی و هاوڕێکانی بۆ سەردانی لە کەعبەی پـیرۆز، فـەرمانی دا بە هاوڕێکانی خۆیان گورج بکەنەوە لە مانگی زیلقەعیدەدا بۆ بەجێ هێنانی حەج، ئـەو هەواڵە گەیشت بە قورەیشیەکان، دڵیان پڕبو لە ترس، دەستیان کرد بەگفتوگۆ کردن لـە خزمەت پێغەمەردا ﴿ﷺ﴾ کۆتایی پێ هات بـە بەسـتنی ئاشـتی حودەیبیـەی بـەناو بـانگ، بەمەرجێ پێغەمەر خۆی و هاوڕێکانی لە ساڵی دووایدا بێنـەوە بـۆ حـەج و (٣) سـێ ڕۆژ بمێننەوە.

﴿ومن أظلم ممّن منع مساجد الله﴾ وە چ کەسێکە ستەم کار تـر لـە کەسـێ قەدەغـەی مزگەوتەکانی خوا بکا، ئیتر هەر مزگەوتێ بێ.

﴿أن یذکر فیها اسمه﴾ کە باس بکرێ لەو مزگەوتانەدا نـاوی خـوا و پەرسـتنی خـوای تێدا بکرێ دروشمی تێدا جێ بەجێ بکرێ.

﴿وسعى في خرابها﴾ وە ستەمکارتر بێ لە کەسێ کۆششی کردبێ لە ڕوخاندن و کاول کردنیی مزگەوتەکان لە هەر جێگەیەبێ.

﴿أولئك ماكان لهم أن يدخلوها إلاّ خائفين﴾ شایستە نەبو بۆ ئـەو کەسـانەی قەدەغـەی مزگەوتەکانیان ئەکرد کە ناوی خوای تیا باسکرایە کە بچنـە ناویانـەوە مەگـەر بـەترس و لەرزەو لە، چونکە بەیتولموقەدەس جێگەی حەجی گاورەکانە، کەواتە ئەبوایە ئەو کارەیـان نەکردایە لەگەڵ خۆیان ، گاور بوون بەیتولموقەدەسیان ڕوخان . هەروەك موسڵمانان نەیان ئەتوانی بچنە ناو کەعبە مەگەر بەترسەوە ، بەر لەگرتنی مەکە .

﴿لهم في الدّنيا خزيٌ﴾ بۆ ئەو جۆرە کەسانە هەیە ڕسوایی لە جیهاندا بـە کوشـتن ودەر کردنیان، بـێ بـەش بـون لـە خۆشـی هـەتا ئەگەڕێنـەوە بـۆ لای خـوا و ڕێـز گرتـن لـە مزگەوتەکان.

﴿ولهم في الآخرة عذابٌ عظيم﴾ وە بۆ ئەو کەسانە هەیە لە ڕۆژی دوایدا سزایەکی زۆر زۆر گەورە. بەڵێنی خوا بێگومان بەڕاست گەڕا، موسڵمانان سەرکەوتن بـە سـەریانا. ئـەو ئایەتە لەو ئایەتانەیە مانای زۆری لێ دراوەتەوە، هەر زانایێ بەجۆرێ، بەڵام ئەوەی بـۆ ئێمـە ڕوون بێ بۆ هەڕشە کردنە لەو کەسانە ڕێزی مزگەوت ناگرن، نایـەڵن چاکیـان بکەنـەوە دووایی ڕوخان و نایەڵن پەرسـتنی تێـدا بکـرێ، هـەوڵ بـۆ ڕوخـانی ئـەدەن، وە نـاهێڵن دانیشتوان هاموشۆی بکەن و دروشمی ئایینی تێـدا بـەرپابکرێ. بەڕاسـتی فـەرمانی خـوا و دەستوری مـرۆڤ پێویسـتی کـردوە لەسـەر ئـادەمیزاد ڕێـزی مزگـەوت بگـرێ لەگـەڵ پەرستگاکانی تردا. برۆنە ناویان بە مل کەچی و گەردن کـەچی و کزۆڵیـەوە، لـە سزای خوا بترسن و بەتەمای پاداشت بن، گاڵتە بە مزگەوتـەکان نەکـەن، چونکـە بـۆ پەرسـتنی خوای گەورە دانـراون، بۆیـە خـوای گـەورە ئـەو ئایەتـە بۆمـانی ڕوون کردوەتـەوە ئـەو کەسانەی گاڵتە بەمزگەوتەکان بکا ڕیسواو کزۆڵ و سەر شۆڕی هەردوو جیهانە و سـزای گەورە ئەدرێ لە پاشە ڕۆژدا. بە کورتی ئەو ئایەت بۆمانی ئاشکرا کرد ئەو کەسـەی ئـەو

کردەوە خراپانە بکا دەربارەی مزگەوت، خوا ئەوەی فەرموێتی ئەیکا لە ڕیسوای و سزادان کەواتە ئەو ئایەتە بۆ ڕوداوێکی تایبەتی نەهاتوەتە خوارە ئیتر ڕوداوەکە لەوە و بەر پەیدا بوبێ یا لەکاتی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکە پەیدا بوبێ، یا لەمەو پاش پەیدا ببێ.

بەلاَم هەندێ لە زانایان ئەلێن: ئەو ڕوداوە بەر لە هاتنی پێغەمەر بوە، بریتیە لە کاول کردنی بەیتولموقەدەس بەدەستی ڕۆمانیەکان. هەندێ تریان ئەلێن: بریتیە لە قەدەغە کردنی بت پەرستان و ڕێگە گرتنیان لە پێغەمەر و هاوڕێکانی لە چونیان بۆ کەعبە. هەندێ تریان ئەلێن: ئەو ڕوداوەی قەدەغەکردنەی مزگەوتەکان دووایی هاتنی پێغەمەر پەیدا ئەبێ لەوانەیە بریتی بێ لە قەدەغەکردنی خاچ پەرستان کە چون بۆلای بەیتولموقەدەس، یا قەدەەغەکردنی ئێستای جولەکەکان بێ ، فەرمودەی ئەو زانایانە ئاو بە گەرمایی دلی ئێمەدا ناکا چونکە بەلگەی ڕاستیان نە ئەقلەن ، کەواتە ئێمە وەك وتمان دەست بە مانای دەرکەوتوی ئایەتە ئەگرین کە پێویستە ڕێزی مزگەوتەکان و پەرستگاکان بگرین، قەدەغەکردنیان جێگەی ڕسوایی ئەمڕۆ و سزای پاشە ڕۆژە.

**بۆ ئاگاداری:** دروست کردنی مزگەوت ئەو پەڕی ڕەواجی بۆ دانراوە لە لایەن خوای گەورەوە بۆ پەرستن، پێویستە بە خاوێنی ڕابگیرێن، قەدەغەیە لەش پیس و ژنی حەیزدار دانیشن لە ناویدا، ئەو پەڕی ڕێز پێویستە بۆیان لە هەمو ڕوێکەوە.. بەلای پێشەوا مالیکەوە قەدەغەیە چۆنی بێ باوەڕان بۆ ناو هەمو مزگەوتێ. حەنەفیەکان ئەفەرمون: چون بۆ ناو هەمو مزگەوتێ دروستە بۆ بێ باوەڕان. شافیعی ئەفەرموێ: تەنها بۆ مەسجید و لحەرام قەدەغەیە چوون بۆ نێوی.

وَلِلَّهِ الْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ وَاسِعٌ عَلِيمٌ (١١٥) وَقَالُوا اتَّخَذَ اللَّهُ وَلَدًا سُبْحَانَهُ بَل لَّهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ كُلٌّ لَّهُ قَانِتُونَ (١١٦) بَدِيعُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَإِذَا قَضَىٰ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُن فَيَكُونُ (١١٧)

جولەکەکان تانەیان ئەدا لە پێغەمەر و موسڵمانان کاتێ خوا قیبلەی گۆڕی لە بەیتولموقەدەسەوە بۆلای کەعبە، ئەیان ووت: موحەممەد ئەمڕۆ فەرمان ئەدا بە هاوڕێکانی بە فەرمانێ بەیانی بەجۆرێ تر فەرمانیان پێ ئەدا، هەتا دوێنێ بو ڕوی پێ ئەکردن بۆلای بەیتولموقەدەس، ئەمڕۆ ڕویان پێ ئەکا بۆلای کەعبە. چۆن ئەبێ بەسەر ئولاخەوە بڕۆی و نوێژ بکەی و ڕوت بۆ هەر جێگەیە بێ.. ئەیان ووت: لە مزگەوتا نەبێ پەرستن قەدەغەیە، چۆن ئەبێ لە هەر جێگەیە بێ نوێژ و پەرستن بکرێ. خوای گەورە ئەو ئایەتەی ناردە خوارەوە.

﴿وللهِ المشرق والمغرب﴾ وە بۆ خوا یە خۆرهەلات و خۆرئاوا، یانی زەوی هەمو گۆشەو کەناری و هەمو شتێ لەسەر زەویە بۆ خوایە و بەبێ جیاوازی. خوای گەورە لەو ئایەتەدا ناوی خۆر هەلات و خۆر ئاوای بەتایبەتی بردوە چونکە ئەو دوانە هەمو جێگەی زەوی ئەگرنەوە، هەر جێگەیێ تۆ بیگری مانگ و خۆری بەسەردا هەلدێ و بەسەریانا

ئاوادەبێ، بە پێچەوانەی باشور و باکور، هەر بۆیەش زەوی دابەش کراوە بە خۆرهـەڵات و خۆرئاوا. نەك بە باشور و باکور.

﴿فاینما تولّوا فثم وجه الله﴾ دووایی بۆ هەر جێگەیە ڕووەرگێڕن بـۆلای ڕوانگـە لـەو جێگەیە زاتی خوا هەیە کە بتانەوێ خوا پەرستی بکـەن و نوێـژ بکـەن بـەو جـۆرەی خـوا فەرمانیان پێ ئەدا یانێ ئەگەر ئێوە نەتان توانی نوێژ لە کەعبە یـا لەبەیتولموقـەدەس بکـەن و ڕێگەیان پێ گرتن خوا هەموو زەوی کردووە بە مزگەوت بۆ ئێوە، دووایی نوێـژی خۆتـان بکەن لە هەرجێگەیە ئارەزۆتان هەیە لەو جێگەیە ڕووەرگێڕن بـۆلای قیبلـەو بۆتـان دابـێن ئەبێ و گران نیە.

﴿إن الله واسع علیم﴾ بەڕاستی خوا پێوەیستی بەکەس نیە و میـهرەبانی خـوا فراوانـە و ئەیەوێ ئاسانی برێژی بەسەر بەندەکانی خۆیا، ئەزانێ بەکردەوە و نیازەکانی ئێـوە، لەهـەر جێگەیە ئێوە نوێژ بکەن خوا ئاگادارە.

پ/ لەو ئایەتەوە وادەرئەکەوێ موسڵمانان ئەتوانن لـە نوێـژا ڕوبکـەن بـۆ هەرشـوێنێ بیانەوێ نەك بەتایبەتی بۆلای کەعبە؟ کەچی پێغەمەر و موسڵمانان جگــە لەکەعبـە ڕویـان بۆلایەنە کردوە.

و/ بەڵێ نوێژی سونەت دروستە بەســواری و بـە پیـادە ڕو بـۆ هـەر جێگەیـە بکـرێ، هەروەها کەسێ سەرگەردان بێ ولای کەعبـەی بـۆ نەدۆزرێتـەوە ئـەتوانێ دوای کۆشـش خۆی لایە دیاری بکا و نوێژی فـەرزیش بکـا. بـەڵام لـەکاتی ئاسـایش و زانینـی کەعبـە لەنوێژی فەرزا پێویســتە هـەر بـۆلای کەعبـە ڕوبکـا، بەڵگەیشـمان ئایـەتی (١٤٩) ئـەم سورەتەیە خوا ئەفەرموێ ﴿فولّ وجهك شـطر المسـجد الحرام﴾ تـۆ ڕو وەرگـێڕە بـۆلای مەسجیدولحەرام لەنوێژا.

﴿وقالوا اتخذ الله ولداً﴾ وە جولەکە و گاور و بت پەرستانی عەرەب ئەیان ووت: خـوا دایناوە بۆ خۆی منداڵ، بەوێنەی ئەوە لە ئایەتی (١١٣) باسکرا کە ئەیان ووت: هـەر ئێمـە

راستین، جگە لە ئێمە ڕاست وێژ نین و لەسەر هیچ ئاینێ نین، ئەوەی ئەوان ئەیلێن هەموی بوختان و پڕوپوچن، بۆیە خوای گەورە لــە قورئانـا بۆمـانی ڕون ئەکاتـەوە و ئەفـەرموێ: جولەکەکان ئەلێن: عوزەیر کوڕی خوایە کە پێغەمبەرێ بو هەمو تەوراتی لەبەر بو، دووای بەختەنەسر خۆی و سوپاکەی دایان بەسەر جولەکەکاندا و بەیتولموقەددەسیان ڕوخان بەر لە هاتنی عیسا و لە دایك بونی بــە (٧٨٠) ســاڵ، جولەکـەکان بـەدیل گـیران و کەەسـیان نەمایەوە هەمو تەوراتی لەبەر بـێ کـە عوزەیـر هـات و لەبـەر تـەوراتی بـۆ جولەکـەکان خوێندەوە ووتیان: بێ و نەبێ ئەمە کوڕی خوایە، گاورەکانیش ئەیان ووت: عیسا کــوڕی خوایە، وە بت پەرستان ئەیان ووت: فریشتەکان کچی خوان

﴿سبحانَهُ﴾ پاك و خاوێنی بۆ خوایە، تەنها و تاکە منالی نەبوە.. ئەگەر خوا منالی هەبێ ئەم کارە نارەوایانەی خوارەوە ڕوئەدا:

١- ئەو کەسە منالی لێ پەیدا بێ، پێویسـتە ئـەو منالـە ڕەگـەزی بـاوکی بێـت، هـەتا بتوانرێ ببێژرێ ئەو منالە لەو باوکەیە، خوای گەورە بێ ڕەگەز و بێ وێنەیە.

٢- ئەگەر منالی بێ ئەبێ خوا پێویستی بە منالێ هەبێ لە خۆیەوە نزیك بـێ، لـەش و پەیکەری لەو بچێ، خوای گەورە نە لەشی هەیە و نە پەیکەر و وێنەی هەیە.

٣- کەسێ منالی بێ پێویستە ئەو کەسە بەبێ منال کاری نەڕوا، خوا پێویستی بە هیـچ بونەوەرێ نیە، نەك منال و هاوکار.

٤- ئەو کەسەی منالی هەبێ، ئەبێ خۆشی منالی کەسێ تربێ و خوالەکەس نەبوە.

٥- هەمو شتێ لە ئاسمانەکان و لـەزەوی دروسـت کـراوی خـوان و بـەندەی ئـەون، دروستکەر بە باوکی دروست کراوی خۆی. فەرمودەی خوایە:

﴿بلْ له مافي السّماوات والأرض﴾ بەلکو بۆ خوایە شتێ لە ئاسمانـەکان و لــە زەویـدا، دروست کراوی خوان، منالی خوایان تێدا نیە و هەمویان بەندەی خوان.

﴿كلّ له قانتون﴾ هەموویان فەرمان بەرداری خوان و پەرستن بۆ ئەو ئەکەن، ناتوانن بێ فەرمانی ئەو بکەن، گیاندار و بێ گیانی بونەوەران مل کەچی خوان.

﴿بديع السّماوات والأرض﴾ خوای دروستکەرە و هێنانەدەری ئاسمانەکان و زەویە لە نە بونەوە بۆ بون، ئەوانەی لە ئاسمان و زەویدان دروست کراوی خوان، چۆن ئەبن بە منالّی خوا.

﴿وإذا قضى أمراً يقول له كن فيكون﴾ هەرکاتێ خوا فەرمانی دابێ بەشتێك و بەکارێ بۆ پەیدابونی، دووایی خوا ئەفەرموێ تۆ ببە، دووایی کتوپڕ ئەو شتە ئەبێ بەو جۆرەی خوا بیەوێ.

**بۆزانین:** جیاوازی نێوان (القضاء والقدر) { قەزا } لای زانا ئەشعەیەکان بریتیە لە خواستی ئەزەلی خودا کەپەیوەندە بەشتەکانەوە بەو حالّ و جۆرەی لەپاشە ڕۆژدا و لە { مالایزال } دا لەسەری دەبن ، { قدر } یش بریتیە لە دروستکردنی خودا بۆ ئەو شتانەی هەریەك لە کات و وادەی خۆیا و لەسەر ئەو ئەندازەیە کەبڕیاری داوە لە سەر ئەو حالّ و سیفەتانەی کە خواستی خۆی دیاری کردون . ئەم جێگەیە زەریای بێ بنە . ئەو بونە بەو جۆرەی خوا ئەیفەرموێ: ببە، ئەو شتەیش پەیدا ئەبێ بەبێ وەستان، ئێمە ناتوانین نەخشەی بۆ بکێشین و بزانین چۆنە. کەواتە با ئێمە خۆمانی بۆ ماندونەکەین و توانای خۆمان بە فیڕۆ نەدەین، خۆمان بخەینە نێو زەریای بێ‌بن و دەشتی بێ پایان و بەرین، ئەو کارە گرنگە کاری خوایە، هەرگیز ئێمە بۆمان دیاری ناکرێ وێنەی ئەو دروست کردنە.

وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ لَوۡلَا يُكَلِّمُنَا ٱللَّهُ أَوۡ تَأۡتِينَآ ءَايَةٞۗ كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِم مِّثۡلَ قَوۡلِهِمۡۘ تَشَٰبَهَتۡ قُلُوبُهُمۡۗ قَدۡ بَيَّنَّا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يُوقِنُونَ ﴿١١٨﴾ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗاۖ وَلَا تُسۡـَٔلُ عَنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡجَحِيمِ ﴿١١٩﴾ وَلَن تَرۡضَىٰ عَنكَ ٱلۡيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمۡۗ قُلۡ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلۡهُدَىٰۗ وَلَئِنِ ٱتَّبَعۡتَ أَهۡوَآءَهُم بَعۡدَ ٱلَّذِي جَآءَكَ مِنَ ٱلۡعِلۡمِ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٍ ﴿١٢٠﴾

﴿وقال الذين لايعلمون لولا يكلمنا الله﴾ وە كەسانێكی ئەوتۆ بەڕاستی پێغەمبەر نازانن لە بت پەرستان ئەیان ووت: بۆچی خوا گفتوگۆ لەگەڵ ئێمە ناكا ڕوبەڕو بڵێ: موحەمەد فوروستادەی منە. كەواتە بۆیە ئێمە باوەڕت پێ نایەرین.

﴿أوتأتينا آية﴾ یابێت بۆلای ئێمە بەڵگەیە لەسەر ڕاستی تۆ، ئەو بەڵگانە ئەوان داوایان ئەكردن زۆرن، وەك ئەمانە: بۆمان هەڵقوڵێنە لەزویی و وشكدا كانیاوێ. بێستانێكت هەبێ لە ترێ و لە خورما. ئاسمان بكەوێتە خوارەوە بەسەر ئێمەدا. فریشتەكان بێن شایەتی

بدەن لە سەر ڕاستی تۆ. کۆشێکت هەبێ لەزێڕ. بەرزبیتە بۆ ئاسمان. ئەو کاتە ئێمە بڕوات پێ ئەکەین بۆ باسکردنی ئەو داوایانەی ئەوان تەماشای ئایەتی (٩٠) لە سورەتی ئیسرادا بکە.

﴿کذلك قال الّذین من قبلهم﴾ هەر بەو جۆرەی ئەوان و داواکەیان ، ئەیان ووت کەسانێکی ئەو تۆی نەزان لەپێش ئەوان، هەر تۆ بەتەنها ئەو داوایەت لێ نەکراوە. ئەیان ووت:

﴿مثل قولهم﴾ وێنەی گفتو گۆی ئەوان، ئەوە بو تاقمەکانی موسا بەموسایان ئەوت: باوەڕت پێ ناهێنین هەتا خوامان پیشان نەدەی بە ئاشکرا، گاورەکان بە عیسایان ئەووت: ئایا خوای تۆ ئەتوانێ لە ئاسمانەوە خوانێکمان بۆ بهێنێ پڕبێ لە خواردەمەنی.

﴿تشابهت قلوبهم﴾ دڵی ئەوانەی ئێستا و ئەوانەی پێشو لەیەك ئەچن لە ڕەقیدا، بیرو بۆچونی هەمویان وەك یەکوان.

﴿قد بیّنا الآیات لقومٍ یوقنون﴾ بەڕاستی ئێمە ڕونمان کردوەتەوە چەندین بەڵگە بۆ کۆمەڵێ باوەڕی بێ گومانیان هەبێ بەو بەڵگانە، بەڵگەی چڕو پڕمان هێناوەتەوە لەسەر ڕاستی موحەمەد، داوای زۆرتر بۆ بەڵگە لەخۆبایی بونە و داواکاری بەو جۆرە وازی لێ نەهێنرێ و سودی نیە بۆ نەزان و بێ باوەڕان، باوەڕ ناهێنن بەڵگەی زۆرتریشیان بۆ بهێنرێ.

**بۆ ئاگاداری:** ئەو شتەی بچێتە مێشکەوە، پێویستی بە ووڵام هەبێ کە بۆی داوا بکرێ: ئەمەیە خوا یارمەتی فروستادەی خۆی ئەدا بە نیشانە و بەڵگەیکی وا جێگەی گومان نەهێڵێتەوە لە دڵا، بۆ کەسێ بەڵگە سودی هیە خۆی تەرخان کردبێ بۆ ڕێگای ڕەوا و بەس، خوای گەورە ئەو کارەی لەگەڵ موسڵمانان کردوە، بەڵگەی تەواوی بۆ ڕون کردونەتەوە، وە ئەو کەسانەی بڕوایان پێ کردوە زۆر تر لەو بەڵگانە کات بەفیڕۆدانە. بەڵام ئەو کەسانەی بێ نرخن و گوێ یۆ هیچ شتێ ناگرن شایانی ئەوە نین ووڵامیان

بدرێتەوە، چاکتر وایە وازیان لێ بهێنرێ. ئەو کەسانە بەبێ بەڵگە لە خۆیانەوە بڵێن: بـاوەڕ بەو بەڵگانە نایەرن، چۆنیان پێ ئەسەلمێنرێ؟ ئەگەر ئێمە بمانەوێ بە باشی تێبگـەین و بزانـین ئەو توێژوە و برینەی کەوتوەتە سەر لەشێ لە لەشەکانی مرۆڤ چ نەخۆشیەکە؟ پێویستە بە تاقی کردنەوەی پزیشکی تایبەتی پشت ببەستین ئەگەر بمانەوێ بسـەلمێنین هەڵسـوڕێنەرێکی هەمو کارێ لە جێگە شیاوی خۆدانەر هەیە، پێویستە پشتە سوری ئەقڵ و ژیری بین، ئەگەر بمانەوێ فەرمانێ لە فەرمانەکانی یاسای ئیسلام بناسین ئەبێ تەماشای قورئان بکەین لەگـەڵ ڕەوشتی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ ئەگەر بمانەوێ فێری زمانی نەتەوەیە ببین پێویستە تەماشای نەریت و ڕەوشتی ئەوان بکەین ئەگەر بمانەوێ یاسایە لە یاساکان بزانین ئەبێ تەماشای نامەی یاسـا بکەین. ئەگەر بمانەوێ فێری مێژوو ببین ئەبێ پشت بە مێژوو ناسان ببەسـتین. کەواتـە ئـەو کەسەی خۆی بۆ خۆی سەربەخۆ لە خۆیەوە بەبێ پرس و ڕاوێژ و تاقی کردنەوەی کەسـێ تر هەر لەخۆیەوە بەڵگە و نیشانە بۆ خۆی دروست بکا هەرئەبێ سـەر گـەردان و گێـل و گەوجبێ بە وێنە جولەکەکان و گاور و بت پەرستان.

کاتـێ پێغەمـەر ﴿ ﷺ ﴾ بـەرەنگاری دوو ڕووان و بـێ بـاوەڕانی بـە قورئـان کـرد و گفتوگۆی ئەوانی پوچ کردەوە، توانایان نەما و سەریان شۆڕ کرد، ئەگـەر دووایـی بـاوەڕ نەیەرن بە نەزان و تێ نەگەیشتو دائەنرێن و دەرگایان لە خۆیان داخستوە، خۆیانیـان کـەڕ کـردوە لـە کـاتی بیسـتنی گفتوگـۆی ڕەوادا، خۆمـاندوکردن لەگـەڵیانا بـێ سـودە.. شاگردەکانی ئەو نەزانانە لەم کاتەدا وێنەیان بەردەوامە، لە هەمو لایەکەوە کای کۆن بـەبا ئەکەن.

خوای گەورە پیشەی پێغەمـەری ڕون و دیـاری کـردوە کـە مامۆسـتای ئـادەمیزادە و هەموکاری ڕەوای ڕون کردوەتەوە، کەس پاڵێ پێوە نانێ و زۆری لێ ناکا، خوا دڵخۆشی ئەداتەوە کە دڵ تەنگ نەبێ کەبێ باوەڕان باوەڕ ناهێنن و ئەفەرموێ:

﴿إنّا أرسلناك بالحقّ﴾ بەڕاستی ئێمە تۆمان ڕەوانە کردوە بە قورئانێکی ڕاست و ئاینێکی زۆر پاکەوە، جگە لەو ئایینە ئایینێ تر وەرناگرێ لە هیچ کەسێکەوە، زۆر لە هیچ کەسێ مەکە باوەڕ بهێنێ.

﴿بشیراً وّنذیراً﴾ تۆ موژدەری بەو کەسانە باوەڕ ئەهێنن بە بەهەشت، ڕانومایی کەریانی ترسێنەری بەو کەسانە باوەڕ ناهێنن بە ئاگری دۆزەخ، ئەوانەیە پیشەی تۆ، پاش ئەوەی داواکاریەکەت ڕون کراوەتەوە بەئاشکرای خۆت دڵ تەنگ مەکە، تۆ زۆر لەکەس مەکە بۆ وەرگرتنی داواکاریت، تۆ توشی خراپە نابیت و ئەوان توشی سزائەبن.

﴿ولا تسأل عن أصحاب الجحیم﴾ وە تۆ پرسیارت لێ ناکرێ لە دانیشتوانی دۆزەخ کە باوەڕیان نەهێناوە بەوانی ڕابگەیەنە ، ئیتر گوێت لێ ئەگرن یان گوێ ناگرن لێرەدا پرسیارێك دێتە کایەوە، ئایا دایك و باوکی پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ بەهەشتین یانە؟

لە وەڵامدا زانایان فەرمویانە مەبەست لەو دۆزەخیانە لەو ئایەتەدا بریتین لە جولەکە و گاور و بت پەرستان، پەیوەندی بە دایك و باوکی پێغەمبەرەوە نیە. هەروەها زانایان فەرمویانە: واپێویستە لەو بارەیەوە ئێمە گفتو گۆ نەکەین، چونکە بەڵگەیەکی بێ گومان بەدەستەوە نیە. بەڵام ئەوەی بەشایانی باسێ دای بنێن باوك و دایکی پێغەمبەر بڕوایان بە یەکێتی خوا بوە، بەو بیرووباوەڕەوە مردوون، زانینی هەموو شتێ لای خوایە.

خوای گەورە دڵخۆشی پێغەمەری دایەوە بەو ئایەتەی پێشو، بە پێغەمەری فەرمو: تۆ لەلایەن خۆتەوە هەمو شتێکت بە تەواوی ڕون کردۆتەوە، بێ باوەڕانیش بێ بەڵگەن لەوەی باوەڕ بەتۆ ناهێنن، ئەو پەڕیان گرتووە لە بێ باوەوڕیدا، ئەیانەوێ تۆ پەیڕەوی ئەوان بکەی و بڕۆیتە سەر ئاینی ئەوان. ئەوەەیش بۆ تۆ ناگونجێ، ناتوانی و ناچێتە مێشکەوە لەیەك کاتا پەیڕەوی ئاینی هەردوو لایان بکەوی، هەرلایەکیان بگری ئەوی تریان لێت ڕازی نابێ. کەواتە ئایینی ڕاست هەر ئاینی ئیسلامە، تۆ هەر پەیڕەوی ئەو بکە و بەس.

خوای گەورە ئەو مەبەستەی خاوەن نامەکان باس ئەکا، ئەفەرموێ:

﴿ولن ترضى عنك اليهود و الا النصارى﴾ وە ڕازی نابن لە تۆ جولەکەکان و گاورەکان. لێرەدا بەتایبەتی ناوی جولەکەکان و گاورەکان براوە، هەرچەندە هەمو بێ باوەڕان وەك ئەوان وان، چونکە ڕوداوەکە لەوانەوە پەیدا بوە، بۆ ئەوەیش پێغەمبەر لەمەو پاش بەتەمای ئەوان نەبێ، ئەوان بەجێگەی بڕوادا نەنێ.

﴿حتى تتبع ملتهم﴾ هەتا تۆ دووای ئاین و دەستوری ئەوان نەکەوی، ئەیان ووت: ئێمە لەتۆ ڕازی نابین با ئەو پەڕی هەوڵ بدەی بۆ ڕازی کردنمان، هەتا دووای ئاینی ئێمە نەوکەوی بەو ڕستەیە خوا پێغەمبەری هۆشیار کردەوە هەرگیز چاوەڕوانی باوەڕ هێنانی ئەوان نەکا.

﴿قل إنّ هدى الله هو الهدى﴾ تۆ بلێ: بەڕاستی ئەو ئاینەی ئیسلام کەبەسروش بۆ تۆ هاتوە لەلایەن خواوە. ڕانموکەەری خوایێ بۆ ئادەمیزاد هەر ئەو ئایینە ڕانومایی کەرە، خوا هەر لەو ئاینە ڕازیە، ڕانومایی کەرێ تر نیە جاری بۆ بدرێ.

﴿ولئن اتّبعت أهواءهم﴾ وە ئەگەر تۆ دووای ئارەزوی بۆشی ئەوان بکەوی، بڕوا بەدەستوری ئەوان بکەی، لە نوێژا ڕووبکەی بۆلای ڕووانگەی ئەوان. بێگومان ئەوە لە تۆ دورە.

﴿بعد الّذى جاءك من العلم﴾ دووای ئەوەی ئەوتۆ هاتوە بۆلای تۆ لەو سرووش و ئاینەکە ڕاستیەکەی زانراوە و ناسراوە.

﴿مالك من الله من وليّ ولا نصيرٍ﴾ نابێ بۆ تۆ لەلایەن خواوە هیچ دۆستێك و هیچ یاریدەرێ کە ڕێگە بگرن تۆڵەت لێ بکرێتەوە ئەگەر دوای ئەوان بکەوی .

بەکورتی جولەکەکان داوایان لە پێغەمبەر کردنەرم و لەسەر خۆبێ لەگەڵیانا هەتا پەیڕەوی بکەن و باوەڕی پێ بهێنن. خوای گەورە دەرگای بە تەمابونی پێغەمبەر بۆ گفتوگۆی ئەوان داخست بەو ئایەتە، ئەو ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوە هەرگیز نابێ پێغەمبەر دڵی جولەکە و گاورەکان ڕازی بکا، چونکە ڕازی کردنی ئەوان بەستراوە بەوەوە

پێغەمەر واز لە ئایینی ئیسلام بهێنی و ببێ بەجولەکەیا بەگاور، ئەوەیش هەرگیز ناگونجێ. کەواتە موحەممەد تۆ بەوان بڵێ: ئەو شتەی من لە سەریمی ڕاستە، ئەوەی ئێوە لەسەرینی گومڕایی بۆشە، چۆن من واز لە کاری ڕەوا ئەهێنم، دووای گومڕای ئەکەوم؟

ئەو شتەی گومانی تێدانەبێ هەرجولەکە و گاورەکان خاوەنی ئەو بیر و باوەڕەنین، هەمو ئایین پەرستان و تاقم و پارتێ ئەو بیرباوەڕەیان هەیە ئەیانەوێ هەموکەس پەیڕەویان بکەن، بگرە زۆریشیان هەتا ئەبێ بەبەندەیان لێت ڕازی نابن. بەلاّم ئاایینی ئیسلام ئەوبیروباوەڕە خراپەی زۆر لاناخۆشە، بە پێچەوانەی ئەوانەوە هەمیشە داوای بەیەکەوە ژیان ئەکا بەجۆرێکی ئاشتی خوازانە لە هەمو خاوەن بیروباوەڕێ. بەبێ دەست درێژی لە یەکتری بەدڵی پاکەوە بەیەکەوە بژین. بۆ نمونە ئیسلام ڕێز لە هەموو فروستادە و پێغەمەران ئەگرێ و ناویان بە چاکە ئەبا، داوا لە هەمو موسلّمانان ئەکا باوەڕ بەهەمو پێغەمەران بهێنن، ئەویش گەورەترین بەلّگەیە ئیسلام ئەیەوێ هەمو نەتەوە و خاوەن بیروباوەڕێ بژین بە یەکەوە بە خۆشی.

لە وانەیە هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە ئەمەی دووایی بێ: کە بەدڵی پێغەمەردا ﴿ﷺ﴾ هاتبێ، بەلای کەمەوە نزیك ببێتەوە لە جولەکەکان. بەلّکو ڕانومایی وەربگرن، یاریدەی بدەن لەسەر ئەو کارە ڕەوایەی ئەیەوێ، گێرە شێوێنەکەیان کەم بکەنەوە، واز لە خراپە کردن بهێنن، خوای گەورە ڕوونی کردەوە کە دوژمنایەتی ئایین و بیروباوەڕی تۆ لە تۆ ڕازی نابن هەتا تۆ واز لەو بیروباوەڕە نەیەریت لە سەریتی، دووای گومڕای ئەوان بکەوی، بۆیە لەدوایدا خوا قەدەغەی کرد لە پێغەمەر لەوان نزیك نەبێتەوە، چونکە ئەو نزیك بونەوە یاریدەی ئەوان ئەداو بەهێزیان ئەکا باپێغەمەر پێ ی نەزانێ. بێگومان ئەوانەیش قەدەغەن لەسەر تۆو هەمو موسلّمانان بەگشتی، هەروەك قەدەغەیە دووای ئاایینی ئەوان بکەون.

بائەمەیشمان لە بیربێ جولەکە خراپ کاری و گێرە شێوێنی ڕەوشتی ئەوانە، دژی چاکە و خاوەن چاکەن. ئەوان پێویستە لەسەریان ئەو کەسانەی چاکەیان لەگەڵ بکەن ئەوان خراپەی لەگەڵ بکەن، هەوڵدان لەگەڵیان بۆ ئاشتی خراپە نەکردن و بێ سوودە.. ئەو قدەغەکردنە و ترساندنی پێغەمەر لەلایەن خواوە گەورەترین هەڕەشەیە لە موسڵمانان کە دۆستایەتی لەگەڵ دوژمنانی ئایین و بیروباوەڕ و نیشتمانا نەکەن، بەبیری خۆیان بیانەوێ بەکاریان بهێنن بۆ سودی موسڵمانان. بەڵام پێچەوانەکەی زۆر ڕاستەت، چونکە ئەوان بەدەم دۆستایەتی لەگەڵ ئێوە ئەکەن هەتا لەژێرە وەبازرگانی و مامەڵەی خۆیان مسۆگەر ئەکەن.

قازانجی خۆیانیان ئەوێ هەموو کاتێ ، تاکە دروشمیان ئەمەیە: وەرگرن و هیچ شتێ بەکەس نەدەن، ئەگەر چارەیان نەما کەمێ ئەدەن بە موسڵمانان و زۆریان لێ وەرئەگرن، خوای گەورە ئەو بازرگانیەی ئەوانی زۆر بەباشی ڕون کردوەتەوە بەم ئایەتە کە ئەفەرموێ: ﴿ولتجدنهم أحرص النّاس على حياةٍ﴾ وە تۆ بەڕاستی جولەکەکانت دەست ئەکەوێ بەچاو چنۆك ترین ئادەمیزاد لەسەر گوزەران و ژیانی جیهان.

هەموو دوژمنانی ئیسلام بەبێ جیاوازی لەکۆن و لەتازەوە لە دژی ئیسلام نەوەستان و نایشوەستن: لەمەو بەر بەناوی ئاینەوە ئەجەنگان لە دژی موسڵمانان. بەڵام ئێستا بە ناوی پاراستنی سودی خۆیانەوە بۆ داگیر کردنی زەوی و نەوت، بۆ هاتو چۆی نێو ئەم زەریا و ئەو زەەریا ئەجەنگێن لەدژی موسڵمانان، دوکەڵی نەوت و گڕی گاز و ئاوی گەرم ئەبینن چاویان کوێر ئەبێ، ناوەستێن بۆ داگیر کردنی ئەوانە و هەمو سامانی تری موسڵمانان و کردنیان بە ژێر دەستەی خۆیان، جەنگی ئابووری و بەرگری و دارایی و ڕامیاری و ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن و شتی تریان لەگەڵ ئەکەن، موسڵمانیان خەڵەتاندوە و بێ هۆشیان کردون بەخواردنەوەی ئارەق و قومارکردن و داوێن پیسی بەهۆی فلیمی بەرەڵایی و سینەما و تەلەفیزیۆن و گۆڤار و ڕۆژنامە و سەتەلایتەوە، ئەبوایە هەندی

لەوانەیان بۆ کاری چاك بەکار بهێنایە، بەو بۆنـەوە دەسـتیان داوەتـە کوشـتنی یـەکتری و تالآن و دزی و دەست برین. لـە هەموان سەیرتر خۆیان بەپێش کـەوتو ئـەزانن، وەلاسـایی پیاوانی ئایین ئەکەنەوە لـەسەر شانۆ، جبە و سەرپۆش ئەپۆشن و ئەیانەوێ ڕەوەشتی بـەرزی پێشویان بریندار بکەن، بە دوژمنانی باو باپیری خۆیان بسەلمێنن کە باو باپیرمان نەفام و گێل بوون. ئەی ئێوە تاقمی لاسایی کەران چ شتێکتان کردوە بۆ هاونیشتمانتان جگـە لـەوەی دەری بخەن دوژمنانتان کە باو باپیرمان نەزان و گێج بوون.

برایانی موسلمان: لـەخەو بێدار ببنـەوە و ڕاپـەڕن و خۆتـان چـەك داربکـەن بەچـەکی قورئان، کۆشك و تەلاری زاوێنی و خاچ پەرسـتان بروخێنـن، خۆتـان ڕزگـار بکـەن لـە نینۆکی دڕوندانەی بێ ئاینیان و داوین پیسان و داگیرکەران و گۆرستان پەرستان و نوشـتە نوسان و جادوگەران، ڕاویان نێن لە نشتیمانی خۆتانا ببنە خـاوەنی ئـابوری و ڕامیـاری و زەوی و ئاو زەریا و ناموس و ئایین و بەرگری خۆتان، بائەم جارە ئەوان چاوەڕووانی ئێـوە بن. ئەو گەلەی بەزانست و زانیاری و پیشەو ڕەوشتی بەرز خۆی بەهێز ئەکا زۆر بێ نـرخ و لاوازە باوەکو ژمارەیان زۆربێ، بە پێچەوانەوە سەربەرزن بازمارەی نفوسیان کەمبێ.

دووای ئەوەی خوا ڕونی کردەوە بۆ پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ کە گاورو جولەکـەکان بـڕوات پێ ناکەن، بگرە لێت ڕازی نابن هەتا دووای دەستورەکانیان نەکەوی، ئەفـەرموێ: ئـەوان وەنەبێ هەمویان بەو جۆرە بن. بـەلکو هـەندێکیان بـەویژدان و دادپـەروەریان هەیـە، بـەو جۆرەی پێویستە تەمشای نامەکانی خۆیانیان کردوە، ئەوانەیان موسلمان ئـەبن و باوەڕیـان پێ ئەکەن.

ئەوانەیش (٤٠) چل کەس بون (٣٢) سی و دوو کەسیان دانیشتوی حەبەشەبون، (٨) هەشتیان زانایانی شام بون، هاتنە خزمەت پێغەمەر ﴿ (ﷺ) ﴾ موسڵمان بون، وەك خوا ئەفەرموێ:

ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَتْلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۗ وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿١٢١﴾ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتِىَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَنِّى فَضَّلْتُكُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٢٢﴾ وَٱتَّقُوا۟ يَوْمًا لَّا تَجْزِى نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْـًٔا وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا عَدْلٌ وَلَا تَنفَعُهَا شَفَٰعَةٌ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿١٢٣﴾

﴿ألّذين آتيناهم الكتاب﴾ کە سانێکی ئەوتۆ ئێمە بەوانمان بەخشیوە نامەیە، ئیتر ئەو نامەیە قورئانێ یا تەورات و ئینجیل لە موسڵمانان و جولەکە و گاورەکان.

﴿يتلونهُ حقّ تلاوته﴾ ئەو نامەیە ئەخوێننەوە بەو جۆرە ڕاستبێ و شایانبێ و خوەێندنەوەی ئەو نامەیە، مافی خۆی ئەدەنێ، بەفەرمانەکانی کارئەکەن، واز لەقەدەغە کراوەکان ئەهێنن. دەستکاری ئەو نامەیە ناکەن و نای گۆڕن، بەهەمو دڵیانەوەی وەریان گرتوە.

﴿أولئك يؤمنون به﴾ ئەو کەسانە بڕوا بەو نامەیە ئەهێنن کە نەگۆڕاوە و دەستکاری نەکراوە، واز لە گۆڕراوەکە ئەهێنن.

﴿ومن یکفر به فأولئك هم الخاسرون﴾ وە هەر کەسێ باوەڕ بەو نامەیە نەهێنێ، دووایی ئەو کەسە هەر ئەوانەن زەرەرۆمەندن، بەرەو نێو ئاگر ئەڕۆن کە بۆیان دانراوە، چونکە گومڕاییان بەکاری ڕەواو ڕاست کرپوە، ئیتر ئەو نامەیە بڕوای پێ نایەرن قورئان بێ یا تەورات و ئینجل، چ زیانێ لە زیانی دووا ڕۆژ گەورەتربێ؟

لێرەدا پێویستە ئەمەیش بزانین بڕواکردن بە قورئان و نامەکانی تریێك نایە بە گوێرەی زانستی تەجوید قورئان بخوێنرێ و بەس، ووشەکانیان ڕێك خرێ و پیتەکانیان لە جێگەی شیاوی خۆیانا دابنرێ، ئەوانە سوودیان پێ وەرناگیرێ ئەگەر لەماناکەیان وردنەبیتەوە و پێی تەمێ خوارد نەبین ، بۆیە پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ ئەفەرموێ: ((ماآمن بالقرآن من استحلّ محارمه)) باوەڕی بەقورئان نەهێناوە ئەو کەسەی بەڕەوای دانێ قەدەغە کراوەکانی قورئان.

زۆرم لا گرنگە مامۆستای بەڕێز (موحەمەد عەبدە) ئەفەرمێ: ئەو کەسەی قورئان هەربۆ خوێندنەوە بخوێنێ و بەس، وێنەی گوێ درێژێ وایە هەلگری چەند کتێبێ بێ بەشی لەباوەڕ بەونامانە نەبێ ،چونکە لەناوەرۆکەکەیان ناگات ڕێنومای خوای لەوانەدا بەدی‌ناکا کەواتە خوێندنەوەیە بەو جۆرەبێ سودی بۆ ڕانومای وەرگرتن نابێ ،باوەکو بزانێ مانەکەی چۆنە ،ئەوجۆرە زانینە دێت وئەڕواو لەدلّدا جێگر نابێ ،زانیێی ڕاستی وباوەڕی بێگومان بیر کردنەوەیە کە ڕێنومای وشارەزایی لێوەربگرێ وەوابزانێ ئەوئایەتانە داوای ڕێنومای لێێ ئەکەن و ئەلێ شارەزای مانەکەی بە، کۆتایی بە فەرمودەی موحەمەد عەبدەهات پوختەی‌مانای ئەوئایەتە ئەمەیە :تەورات وئینجیل موژدەیان بە فروستادەی پێغەمبەر داوە ،وە قورئانیش بەلگەیە بۆ ڕاستیەکەی ،بۆیەئەو کەسانەی لەمانای نامەکان وردبنەوە باوەڕ بەپێغەمبەرو بە ئاینی ئیسلام ئەهێنن . خۆیانی بۆتەرخان ئەکەن بەو جۆرەی‌پێویستبی،ئیتر جولەکەبن یان گاورو بت پەرستەکان.بێ‌باوەڕانی ئەم سەردەمەییش بەوجۆرەی شایانی قورئان بێ لەمانەکەی وردنابنەوە ، خۆیان گێل وکوێر ئەکەن و باوەڕی پێ ناکەن خوای گەورە لەئایەتی (٤٠) چلەوە هەتا ئایەتی (١٢٣) سەدوبیست وسێ باسی جولەکەکانی

کرد بەو ئایاتانە ڕوی فەرماندانی‌خۆی تیّ کـردن ،بـەدوورودرێژی باسـی مێـژوی رابـردوی ئەوانی لـەگەڵ خـواو پێغەمبـەرەکانی خۆیـانی بۆکـردن ، سـەرنجی ڕاکێشـان بـەڕوکردنی فەرماندانەکەی بۆ پێغەمبەرو موسڵمانان ، بـەوان ڕائەگەیـەنیّ بەوئایەتانـە .کۆتـایی بـانگ کردنیانە بۆ باوەڕهێنان کەچی ئەو جولەکانـەی ئێسـتا هـەروەك کۆنـەکانیان وان لـە بـیّ باوەڕی داو لـە لاساریدان بۆیە خوای گەورە لـەدوای بـاس کردنـی ئـەو هـەموو نیشـانە گەورانە باسی چاکەو بەخشندەی خۆی بۆیان دووپات ئەکاتەوە بە ئایەتی (١٢٢) سـەدوو بیست ودوو گوێچکەیان ئەلەرزێنیّو ئەیان ترسێنیّ بە ئایەتی (١٢٣) سەدوبیست وسـیّ ، ئەفەرموێ:

﴿ یابني إسرائیل اذکروا نعمتی التي أنعمت علیکم ﴾ ئەی کوڕانی ئیسرائیل: ئێوە بیری ئەو چاکە و بەخششانە بکەنەوە من بە چاکە ڕژاندم بەسەر ئێوەدا.

﴿وأني فضّلتکم علی العـالمین﴾ وە بەڕاسـتی مـن ڕێـزی ئێـوەم داوە بـە سـەر هـەمو ئادەمیزادی ئەو سەردەمەی خۆتان کە پێغەمەری زۆرتانم پیّ بەخشیون و کاری بـۆ کەسـی تر نەکراوم پیّ داون.

﴿واتقوا یوماً لاتجزی نفس عن نفسٍ شیئاً﴾ وە ئێوە بترسـن لـە سزای ڕۆژی دووایـی سود نابەخشیّ هیچ کەسیّ بە هیچ کەسیّ تر هیچ شتیّ، هـەمو کەسیّ چاکـە و خراپـەی کردەوەی خۆی وەرئەگریّ.

﴿ولا یقبل منها عدل ولا تنفعها شفاعة﴾ وە وەرناگیریّ لـە هیچ کەس بریتـی و بـەرتیل بەهەمو سامانی جیهان و سود ناگەیەنیّ بەهیچ کەسیّ پارانەوە بۆ کەسیّ تر.

﴿ولا هم ینصرون﴾ وە ئەوان یارمەتیان نادریّ لە هیچ کەسێکەوە. مانـای ئـەو ئایەتـە بەدرێژی لـە کاتی ماناکردنی ئایـەتی (٤٨) چـل و هەشـتا باسـی کـراوە لـەم سـورەتەدا. پوختەی باسی ئەوەیش کراوە ئایا (شفاعة) واتە پاڕانەوەی پیاوچاکان لە خزمەت خوادا لـە ڕۆژی دووایدا بۆ کەسیّ لـە ئادەمیزاد وەر ئەگریّ یا نە؟

دووای ئەوەی خوای گەورە باسی چاکەکانی خۆی کرد لەگەڵ کوڕانی ئیسرائیل و بت پەرستان و باسی لاساری و گومڕایی ئەوانیشی کرد. لەمەو پاش باسی چیرۆکی ئیبراهیم ئەکا کە هەمویان لە ڕێزداری ئیبراهیم ئاگادارن، ئەوانیش لەنەوەی ئەون، دانیشتوی شارە ڕێز گیراوەکەی خوان، خزمەت کاری خانوە پیرۆزەکەی خوان، هەروەها لەو بەسەر هاتەی ئیبراهیم دا چەند کارەساتێکی وا هەن پێویستی ئەکا لەسەر یان بڕوا بەئاینی پێغەمەر بکەن ، وە مل کەچ بن بو دەستوری ئەو پێغەمەرە. ئەو کارە ساتانەیش ئەمانەن:

١- ئیبراهیم فەرمانی پێ درا کە هەندێ فەرمانی زۆرگران جێبەجێ بکا، ئەویش جێبەجێ کردن بۆیە پیشەی پێغەمەرایەتی و پێشەوایەتی پێ درا. کەواتە هەمو چاکەیە بۆ هیچ کەس پەیدا نابێ هەتا واز یاخێتی نەهێنێ، فەرمانەکانی خوا بەجێ نەهێنێ.

٢- ئیبراهیم داوای کرد لەخوا ئەو پێشەواییە کە خوا داوێتییە بەخۆی ببەخشێ بە نەوەکانیشی، خوا داواکەی لێ وەرگرت. بەڵام ئەو پیشە گەورەیە نادا بە ستەم کارانی نەورەکانی. کەواتا زانرا ئەو کەسەی بیەوێ مافی ڕەوای دەست بکەوێ پێویستە واز لە ڕەگەز پەرستی و دووڕوویی و بێ نرخ کردنی مرۆڤە بەرزەکانی لای خوا بهێنێ، هەتا سەرۆکایەتی ئەمرۆ و پاشە ڕۆژی دەست بکەوێ.

٣- کاتێ ڕوانگە بۆلای کەعبە گۆڕا جولەکەکان زۆریان لا گران بو، خوا ویستی لەوان کەڕق و کینەکەیان لابەن، بەوەی کەعبە دروست کراوی ئیبراهیمە کە خۆیان بەگەورەی ئەزانن و بە باپیرە گەورەی هەمو پێغەمەمەرانی خۆیانی دائەنێن و ئەڵێن: ئێمە دووایی ئەو کەوتوین.

٤- ئیبراهیم پاڕایەوە لەخوا کە لەنەوەی خۆی پێغەمبەرێ بنێرێ، موحەمەدی نارد کە لەنەوەی ئەوە، ئەو کەسەی باوەڕی بە ئیبراهیم بێ پێویستە باوەڕیش بەوبکا. بۆیە خوا ئەفەرموێ.

وَإِذِ ٱبْتَلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَـٰتٍ فَأَتَمَّهُنَّ ۖ قَالَ إِنِّى جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا ۖ قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِى ۖ قَالَ لَا يَنَالُ عَهْدِى ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٢٤﴾

﴿وإذ ابتلى إبراهيم ربّه بكلمات﴾ وە موحەممەد تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە ئیبراهیمی تاقی کردەوە پەروەردگاری خۆی بە چەندین فەرمانێ و بەچەندین شتێ قەدەغەکرابون کە ئەو شتانە زۆر گرانبون و کردنیان، هەتا ئیبراهیم هۆگری خۆگرتن و هێمنی بێ لەسەر هەڵگرتنی باری گرانی فەرمانەکانیخوا، وەك ئەوەی فرێی دایە نێو ئاگرەوە، دانانی ژن و کورەکەی لەو جێگە چۆڵە و شیوە قوڵەی بێ ئاو و خواردەمەنیە لە مەکەدا، بەسەر برینی کورەکەی.

﴿فأتمهن﴾ دووایی ئیبراهیم ئەو فەرمانانەی بەتەوای بەجێ هێنا، بەو جۆرەی شایانبێ بۆیان بەبێ کەم و کورِی.

﴿قال إني جاعلك للناس إماماً﴾ خوا فەرموی بەئیبراهیم: بەراستی من تۆم کرد بە پێشەوای ئادەمیزاد و چاولێ کراو بۆیان بۆ ئەوەی پەیرەویت بکەن.

﴿قال ومن ذرّيتي﴾ ئبراهیم پارایەوە لەخوا ووتی: ئەو پێشەواییە ببەخشە بەهەندێ لەخێزانەکان و نەوەکانم، هەتا ئەوانیش ببنە پێشەوای ئادەمیزاد.

﴿قال لاينال عهدى الظّالمين﴾ خوا فەرموی: توشی ئەو پەیمان و پێشەواییە نابن کەسانێ ستەم کاربن لە ئادەمیزاد، پێشەوایی بۆ ستەم کاران دەست نادا، بەڵکو بەشی چاکە کارانە چونکە ئەوان شایانی چاو لێ کراوین نەك ئەو ستەم کارانەی باوەڕیان بەخوا نیە.

لێرەدا ئەمانەی خوارەوە جێگەی باسن:

١- کۆمەڵێ زانایان ئەڵێن: پێشەوای موسڵمانان و کـار بەدەستەکانیان پێویستە داد پەروەر و چاکەکاربن لەگەڵ موسڵمانان، توانای بەڕێوە بردنی کار و بـاری دانیشـتوانیان هەبێ بەو جۆرە پێویست بێ، بۆیە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ئەفەرموێ: ((ان لاینازعوا أمره)) ئـاژاوە مەگێڕن لەگەڵ ئەو کەسانەدا شایانی پێشەوایی بن، بـەڵام ئەگـەر گوناهبـار و زۆرداربـون وستەم کاربون، شایستە نین بۆ ئەو کارە، خوا ئەفەرموێ: ﴿لاینال عهدی الظالمون﴾

٢- زۆرترین لە زانایان ئەڵێن: ئارام گرتن لەسەر ستەمی فەرمان ڕەوایـی ستەم کـارو پێشەوایان چاکترە لە ئاژاوە نانەوە، نەوەك خوێن ڕێژی و کوشتن و تاڵان و سوتان و دزی پەیدابێ. دەستی خراپە کاران بەرەڵا بێ و گێرە شێونی پەرەبسێنی.

٣-موچەوەرگرتن لەکا ربەدەستانی ستە مکاربە سێ جۆرە:

یەکەم: ئەگەر ئەو سامانە لەلای ئەو کاربەدەستە یە بـە گوێـرەی دەسـتوری ئیسـلام وەرگیرابێ موچەوەرگرتن لەوان دروستە.

دووهەم: ئەگەر ئەو سامانە لە ڕەواو ناڕەوا پێك هاتبو چاك وایە ئـەو کەسـانەی بەشـی خۆیان دارائیان هەیە موچەیان لێ وەرنەگرن. بەڵام هەژاران بۆیان هەیە بەگوێرەی پێویسـت بۆ خۆیان موچەوەربگرن.

سێهەم: ئەگەر بەڕونی ئەزانرا ئەو سامانە بەگشـتی لەقەدەغـە کراوەکـان پێـك هـاتوە، پێویستە موچەیان لێ وەرنەگرن.

ئەو ئایەتانە بۆمان ڕون ئەکاتەوە خزمایەتی و دۆسـتایەتی و ڕەگـەز پەرسـتی لـە ئـایینی ئیسلامدا باوی پێ نادرێ، کەواتە ئادەمیزادی بێ باوەڕ لەگەڵ باوەڕدار پەیوەندیان پچڕاوە لەگەڵ یەکتریدا بێ گانەن، باوك و کوڕ و خێزان ژن و مێرد پەیوەندیان بـە یەکـەوە نیـە، بەمەرجێ یەکێکیان بێ باوەڕبێ، عەرەب و کورد و هەمو گەلانی تـر بـرای یـەکن ئەگـەر خاوەن باوەڕبن ﴿إنّمـا المؤمنـون إخـوة﴾ بەڕاسـتی بـاوەڕداران بـرای یـەکترن عـەرەب و

عەرەب کورد و کورد، باوك و کوڕ، براو خزم، پەیوەندیان بەیەکەوە نیە ئەگەر یەکێکیان بێ باوەڕبێ کەواتە بنە ماڵە بۆ موسڵمانان بە باوك و کوڕ و نەوە پێك نایە بەڵکو بە بیرو باوەڕ و خوا پەرستی پێك دێت، ئیسلام بە کۆمەڵی ڕەگەز پەرستان دروست نابێ، بە بیروباوەڕ دروست ئەبێ، ئەو کۆمەڵەی ئیسلام پێکی دێنێ بەبیروباوەڕە ، ئیتر بارەگەز و نشتیمان و ڕەنگیان جیاواز بێ، ئەو ئاینەی خوا داوای ئەکا پێویستە بەو جۆرە بێ کە خوای گەورە لەو ئایەتەدا باسی ئیبراهیمی کردوە. کەواتە بابزانین ئیبراهیم چ کەسێکە؟ ئیبراهیم باوکی هەمو پێغەمەرانی پاش خۆیەت پێغەمەرێکی بەڕێزە لای موسڵمانان و جولەکەو گاور و بت پەرستەکانی دانیشتوانی مەکە خۆیان بەنەوەی ئەو دا ئەنێن لە ئیسماعیل ئەبن بەکوڕی ئیبراهیم.

ئیبراهیم کوڕی ( تارح) واتە (ئازەر) کوڕی (ناحور) کوڕی (سروح) کوڕی (ڕوعو) کوڕی (فالح) کوڕی (عابر) کوڕی (شالح) کوڕی (أرفکشان) کوڕی (سام) کوڕی (نوح).

ئیبراهیم لە شاری (فرام ئارام) کە دێیەکە پێی ئەوترا (کوثـا) هاتۆتە جیهانەوە، ئەو شوێنە ئەکەوێتە نێوان هەردو ڕوباری دیجلەو فورات سەر بە هەرێمی بابل، کەئێستا بەشێکن لە عێراقی ئەم سەردەمە لەو کاتەدا فەرمان ڕەوای ئەو جێگایە (نەمرود) ی ستەم کاری کوڕی (کنعان) کوڕی (کوش) بوە. داوای خوایەتی کردوە ژێردەستەکانی ئەیان پەرست لەگەڵ ئەوەشدا چەندین بتیان بەدەستی خۆیان ئەیان تاشین و ئەیان پەرستن بۆیە ئیبراهیم پێغەمەر بەباشی زانی بانگیان بکا بۆلای پەرستنی خوای تاك و تەنها.

ئازەری باوکی بت پەرست و بت تاش بو نزیك تری کەس بو لە ئیبراهیمە بۆیە بەچاکی زانی پێش هەموان لە باوکیەوە دەست بکا بەبلاو کردنەوەی بیروباوەڕی خوا ناسی، زۆر بەڕێزەوە و نەرمی پێی ووت: ئەی باوکی خۆم چ شتێك تۆی وا لێ کردوە کڕنوش بۆ ئەو بتانە ببەیت کە تاشراوی دەستی خۆتن و هیچ شتێکیان لە تواناادا نیە؟ کوێر

و کەڕ و هیچ نەزان ، ووتیشی من لەلای خوای گەورەوە بەشێکی گەورەم پێ بەخشراوە پێت ناخۆش ئەبێ گوێم لێ بگرە باوەڕ بەخوای تاك و تەنها بهێنە کە دروست کەرمانە، ئازەر وەڵامی ئیبراهیمی زۆر بە توندی دایەوە و لێی توڕە بو ڕووی لێ گرژ کرد، ئیبراهیم بە دڵێکی فراوانەوە وەڵامی دایەوە و ووتی سڵاوی خوات لەسەربێ و داوای لێبوردنت لێ دەکەم.

هەروەها ئیبراهیم لەسەر ئامۆژگاری خۆی ڕۆیشت گەلەکەی باشتر لەسەر بێ باوەڕی بەهێزبون، پەرەی بەکارەکەی خۆی دا هتا ڕۆژی جەژنی بێ باوەڕان هات بەپێی دەستوری خۆیان، بێ باوەڕان بەهۆی جەژنەوە چون بۆ دەرەوەی شار ئیبراهیم بەتەنها لە بت خانە مایەوە و هەلی بۆ ڕەخسا و هەمو بتەکانی شکاند و ووردو خاشی کردن، بتە گەورەکەی هێشتەوە تەورەکەی لا دانا، دانیشتوانی شار لە سەیران و جەژن هاتنەوە و بەرەو بت خانە ڕۆیشتن تەماشایان کرد ماڵ وێران و سەرگەردان و خوا نەماو هەمو بتەکانیان شکاون و پارچ پارچە کراون سەرسام و سەرگەردان ئەبێ چ کەسێك ئەو کارەی کردبێ؟ کەسێ لەو ناوەدا هات ووتی: لاوێك هەیە پێی ئەڵێن ئیبراهیم، ناوی بتە کانمانی بە خراپە ئەبرد بێ و نەبێ ئەو کارە ئەو کردویەتی بت پەرستان لێی کۆبونەوە ئەیان ویست داخی دڵی خۆیانی پێ بڕێژن و بیکوژن، ووتیان: ئەی ئیبراهیم: تۆ ئەو کارەت کردوە بەخواکانمان؟ ئەویش زۆر لەسەر خۆ بەبێ پەشۆکان فەرموی بتە گەورەکەیان وای لە بتە بچکۆلەکان کردوە لێی بپرسن ئەگەر گفتو گۆ ئەکا، ئەوانیش هەتا ماوەیەك کرو مات سەریان دانەواند لەدوایدا بەناچاری ووتیان: ئەی تۆ نازانی ئەوانە نادوێن، ئیبراهیم فەرموی: ئەی ئێوە چۆنیان ئەپەرستن ، ئەوان هیچیان بۆ نەمایەوە، چاڵێکی زۆر گەورەیان هەڵکەند و درەخت و پوشی زۆریان تێ کرد و ئاگریان تێ بەردا و لەدورەوە بە مەنجەنیق ئیبراهیمیان فڕێ دایە ناو ئاگرەکەوە بۆئەوەی بسوتێ. بەڵام خوای گورە ڕزگاری کرد دوای کوژانەوەی ئاگرەکە چون بزان چ شتێك بەسەر ئیبراهیمدا

هاتوە. تەماشایان کرد بەساغی وەك خۆی زیندو ماوەتەوە و گەشەی سەر کولمـی دێت، بەهۆی ئەو کارە بەکەس نەکراوە زۆربەی دانیشتوان باوەڕیان هێنـا بۆیـە نـەمرودی ستەم کار لەو ڕوناکیە ترسا و ئیبراهیمی بانگ کرد و دەستی کـرد بـە ووتـو وووێـژ لەگـەڵی ئیبراهیم زاڵ بو بەسەریا ئەویش سەر شۆڕ بو بەناچاری فـەرمانی دەرکردبـۆ سـیخوڕەکانی کە ئیبراهیم و ئەو کەسانەی باوەڕیان هێناوە بیان خەنە ژێر چاودێری تەنگیان پێ هـەڵچنن ئیبراهیم وای بەچاك زانی لە نیشتمانی خـۆی دەرچـێ بـەرەو شام کەوتـە ڕێگـا خـۆیو ئازەری باوکی و خاتو سارای ژنی و لوتی برازای و چونە دێی حـەڕان، دووای دوو سـاڵ ئازەری باوکی لەوێ مرد، پاش ماوەیەك گرانیەکی زۆر سەخت لەشـامدا پـەیدا بـو بۆیـە ئیبراهیم و خێزانەکەی بەرەومیسر ڕۆیشتن وسێ مـانگ لـەوێ مانـەوە،فیرعـەونی میسـر هاجـەرەی کارەکـەری‌خۆی بەخشـی بەسـارا خـاتونی ژنـی ئیـبراهیم ،خـاتون سـارا وای‌بەباشـزانی بیبەخشـێ بـەئیبراهیم ،ئـەویش مارەی‌کردلـەخۆی،هاتنەوەبۆشـام،لەشـام لەهاجـەرەکوڕێکی‌بوو،ناوی‌نائیسـماعیل،بەفـەرمانی‌خوا ئیـبراهیم ئیسـماعیل ودایکـی بردنەحیجاز لەوجێگەیە کەشاری مەککەو کەعبەی لێ دروسـت کـراوە داینـان وبـەجێی هێشتن،هەموو کـاتێ ناوبـەناو ئیبراهیم سـەری لێ‌ئـەدان،ماوەیەلای‌هاجـەرە وکورەکـەی لـەحیجاز ئەمایـەوە،ماوەیـەکیش لەشام لـەلای‌خاتوو سـارا ئەمایـەوە،لەدوای ١٤ سـاڵ چواردەسـاڵ ئیـبراهیم لـە سـاراخاتون کوڕێکی‌بووناوی‌نـا ئیسـحاق.جـارێ لەوجارانـە کەئیبراهیم سەری‌ئەدا لـەئیسماعیل خوافەرمانی پێ‌دا خـۆی‌و کورەکـەی خانویـە دروسـت بکەن بۆپەرستنی خوابەتەنها.جێگەی خانوەکەیان لەلایەن خواوەبـۆ دیـاری‌کرا،ئیسـماعیل بەردی ئەهێناو ئیبراهیم دای‌ئـەنا لـەدیواری خانوەکـەدا خانوەکـەیان تـەواوکرد،ئیـبراهیم لەخوا پارایـەوە،فـەرمووی: ئەی‌خوایـە ئـەم جێگایـە چـۆڵ و بـێ ئـاو و بـێ کشـتوکاڵە نەتەوەیەکیان بۆ بنێرە ئاوەدانی بکەنـەوە ، داواکـارم ڕۆزی و خواردەمـەنی بـۆ نـەوەکانم ساختەبهێنێ بۆیانی لەم جێگەیەدا، خوای گەورە نزاکەی وەرگرت وتایفـەی جورهومـی بـۆ

ناردن و لەوێدا نیشتە جێ بون، ئیسماعیل ژنی لێ خواستن ، بەرە بەرە منالی زۆر بو، وای لێ هات جگە لەوان کەسی تر لەمکەکە نەمانەوە، بەر لەوان خوا بیری زەمزەمی پڕ لەئاوی شیرینی بۆ هەڵقوڵاندبون، پێغەمەری ئیسلام ﴿ﷺ﴾ لەهۆزی قورەیشی نەوەی ئیسماعیلە، ئەو خانوە کرا بەروانگە و جێگەی پەرستنی خوای گەورە ئەفەرموێ:

وَإِذْ جَعَلْنَا ٱلْبَيْتَ مَثَابَةً لِّلنَّاسِ وَأَمْنًا وَٱتَّخِذُوا۟ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ۖ وَعَهِدْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَـٰعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِىَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْعَـٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ﴿١٢٥﴾ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَـٰذَا بَلَدًا ءَامِنًا وَٱرْزُقْ أَهْلَهُۥ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ مَنْ ءَامَنَ مِنْهُم بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ ۖ قَالَ وَمَن كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُۥ قَلِيلًا ثُمَّ أَضْطَرُّهُۥٓ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلنَّارِ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٢٦﴾

﴿وإذا جعلنا البيت مثابة للناس﴾ موحەمەد تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە ئێمە ئەو خانوەمان کرد بە جێگەی گەڕانەوەی ئاواتی ئادەمیزاد کە بچن بۆلای بە کۆمەڵ کۆمەڵ بۆ بەجێ هێنانی حەج و عەمرە و پەرستنەکانی تری خوا و بگەڕێنەوە بۆلای ئەو خانوە ساڵ لەدوای ساڵ هەتا ڕۆژی دوایی و بگەڕێن بەهەر چوار لایدا و بیارێنەوە بۆ گەل و نیشتمان و خۆیان.

﴿وأمنا﴾ کردمان بە جێگەی ئاسایش و نەترسان، یانی ئادەمیزاد چونە ئەو جێگەیە و فەرمانەکانی خوایان بەجێ هێناو پەشیمان بونەوە و گەڕانەوە بۆ لای خوا بە نیازی پاکەوە

ترسیان لە سزای دووا ڕۆژ نامێنێ، هەروەها جێگەی نەترسانی ئــەو کەسـانەیە دانیشـتوی لای ئەو خانوەن خوا پێویستی کردوە هیچ کەسێ پەلاماری نەدرێ لەو جێگەیە، بـەجۆرێ ڕێزی لێ ئەگیرێ باوك کوژرا و باوك کوژی خۆی ئەبینی پشـتی لێ هەڵئـەکا وەك هیـچ نەقۆمابێ لە نێوانیانا.

ئەو کارە ڕەوایە بەردەوامە لە سەردەمی ئیسماعیلەوە هەتا ئـەمڕۆی ئێمـە. ئـەو ئایەتـە وامان پێ فەرمان ئەدا ئەو خانوە ڕێزی پێ دراوە پێویستە دانیشـتوانی ئـەو شـوێنە دەسـت درێژیان نەکرێتە سەر، تالاّن و کوشتن و گاڵتە کـردن دەربارەیـان نـەکرێ. مانـای وانیـە کوشتن و تالاّن و پێ شێل کردنی مافی دانیشتوان نەبینراوە، بیستومانە زۆرجاران جەنگ و ئاژاوە و کوشتن و تالاّن بە ناڕەوایی لەو جێگەدا پەیدابوە هەرچەندە قەدەغەیە لای خوا.

با ئەویش بزانین ئەگەر تاوانبارێ چوە نێو ئەو خانوە و شایانی کوشـتن بـوو تۆڵـەی لێ بسەنرێ پێویستە تەنگی پێ هەڵبچنرێ و نان و ئاوی نەدرێتێ هەتا خۆی ئەدا بەدەستەوە یا ئەمرێ وەنابێ یەکەم جار پەلاماری بدرێت لەبەر ڕێزی ئەو خانوە پیرۆزە.

﴿واتخذوا من مقام ابراهیم مصلی﴾ وە ئێمـە پێمـان ووتـن: ئێـوە جێگـەی ڕاوەسـتانی ئیبراهیم بکەن بە جێگەی نوێژ کردن بۆ خۆتان. زانایان بـۆ دیـاری کردنـی ئـەو جێگایـە هەریەکەیان بیروباوەڕێکیان هەیە هەمویان شایانی ئەوەن کە کاریان پێ بکـرێ. هـەندێکیان ئەڵێن: بەو هەمو جێگایانە ئەڵێن کارو باری حەج و عەمرەیان تێـدا بـەجێ ئـەهێنرێ، وەك جێگەی تەواف ناوی مزگەوتی ڕێز گیراو جێگای هاتوچۆی ڕاکردنی نێوان سەفا و مـەروا و عەرەفات و موزدەلیفە. هەندێ تریان ئەڵێن بریتی‌یە لە دەوروپشتی کەعبە کە مزگـەوتی ڕێز گیراوی لێ پێك دێت، بۆ ئـەوەی نوێژکـەران زۆربـەی کـاتی خۆیـان لـەوێ بـن یـا ئیعتکافی تێدا بکەن هەندێ تر سێهەمیان دەڵێن بەو جێگا دیاری کراوە ئەوترێ چـەترێکی دیاری کراوی بۆ کراوە و پێی دەوترێ مقام إبراهیم واتە جێگەی ڕاوەستانی ئیبراهیم بـۆ نوێژ کردن کەوا چاکە دو ڕکات نوێژی دوای تەوافی تێدا بکرێ.

﴿وعهدنا الى إبراهيم وإسماعيل أن طهرا بيتي﴾ وە ئێمە ئامۆژگـاری ئیبراهیم و ئیسماعیلمان كرد كە پاك بكەنەوە ئەو خانوەی من لە هەمو شتێ شایستەی ئەو نەبێ، لـە بتەكان و پیسای و چڵك و چەپەڵی و گفتو گۆی بێ سود ، لە داوێن پیسـی و لاذان لـە سنوری خوا و چەنەبازی ، رێز لەو خانوە بگرن وە فەرمان بدەن بە ئادەمیزاد بۆ كردنـی ئەوانەی باسكران.

﴿للطائفين والعاكفين والركع السجود﴾ پاكی بكەنەوە بۆ ئەو كەسانە ئەگەڕێن بـەدەری كەعبەدا بۆ بەجێ هێنانی حەج وعەمرە لە هـەمو كاتێكا كە بۆپەرستن ئەیانـەوێ بگـەڕێن بەدەوری كەعبەدا، پاكی بكەنەوە بـۆ ئەو كەسانە لـە مزگـەوتی رێـزداردا دائەنیشن و خەریكی خواپەرستی و نوێژ كردن و خوێندنی قورئانن، بۆ ئەو كەسانە نیشتە جێی ئـەوێن و پاكی بكەنەوە بۆ ئەو كەسانەی ئەچن بەركوعدا و سوژدە ئەبەن بۆ نوێژ كـردن، یـا بـۆ ئەوكەسانەی لە هەرێمەكانی ترە دێن بۆ حـەج و عەرەفـە و نوێـژ كـردن و پەرستن، لـە دووایدا ئەچنەوە بۆ نیشتمانی خۆیان.

﴿وإذ قال إبراهيم ربّ اجعل هذا بلداً آمنـاً﴾ وە بـیری ئـەو كاتـە بكـەرەوە ئیبراهیم پاڕایەوە، ووتی: ئەی پەروەردەكەری من تۆ ئەم جێگە چۆڵـەی بـێ كشـت و كاڵـە بكـە بەشارێكی هێمن و بێ ترس بۆ دانیشتوانەكانی و دوربێ لەخوێن رێژی و ستەم لـەیـەكتری كردن.

بیپارێزە لە بومەلەرزە و گێچەڵوكە. ئەبێ بزانین ئەگـەر كەسێ ستەمی تێدا كردبێ خاوەنەكەی زۆر نەژیاوە و لەناوچوە بەسەر شۆڕی.

﴿وارزق أهله من الثمرات من آمن منهم بالله واليوم الآخر﴾ وە تۆ ئەی خوایە رۆزی و خواردەمەنی ببەخشە بە دانیشتوانی ئەو شارە لە هەمو میوە و دانەوێڵەیە، ئـەو كەسـانەیان باوەڕیان هێناوە لەوان بە خوا و بەرۆژی دووایی.

کاتێ ئیبراهیم کەعبەی دروست کرد لەو جێگەیە کە خوا بۆی دیاری کردبو لەخوا بپارێتەوە ئاسایش و بێوەیی بلاّو بکاتەوە لەنێو ئەو جێگەدا بۆ سودی دانیشتوان و خواردەمەنیان بۆ بنێرێ لە هەمولایەکەوە، خوای گەورە نزاکەی لێ وەرگرت، رێز گرتنی ئەو جێگەیەی پێویست کردلەسەر ئادەمیزاد، هەمو جۆرە خواردەمەنی بۆ ناردن. خوا فەرموێ:

﴿ قال ومن كفر فأمتعه قليلاً﴾ وەمن خواردەمەنی ئەدەم بەکەسێ باوەڕی نەهێنابێ، دوایی من سود ئەبەخشم بەو کەسە ماوەیەکی کەم لە جیهاندا. بەراوردی پێشەوایی ئایینی لەگەڵ کاروباری جیهاندا ناکرێ، چونکە پێشەوایی ئایینی دەسەلاّتێکی ئایینی و کاتیە، ئەوەیش پێویستی بە باوەڕ بەخودا و دادپەروەری هەیە. بەلاّم ڕۆزی پێدان بۆ چاك و خراپە بەوێنەی ئاوو هەوا یە، گوناهو خراپە کاریگەر نیە لە تەمەنی مرۆڤدا و لە ڕۆزی پێدانی ئەم ژیانەی جیهان.

﴿ ثمّ أضطرّه إلى عذاب النار وبئس المصير﴾ لەپاشامن ئەو کەسە ناچار ئەکەم بۆ لای سزای ئاگری دۆزەخ، و خراپ جێگە یەئاگری دۆزەخ بۆ گەڕانەوەی ئەوان، وەکەس ڕزگاری ناکا.

وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَٰهِـۧمُ ٱلْقَوَاعِدَ مِنَ ٱلْبَيْتِ وَإِسْمَٰعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١٢٧﴾ رَبَّنَا وَٱجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَآ أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَّكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبْ عَلَيْنَآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٢٨﴾ رَبَّنَا وَٱبْعَثْ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ ۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١٢٩﴾

﴿وإذ يرفع إبراهيم القواعد من البيت وإسماعيل﴾ وە تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە ئیبراهیم و ئیسماعیل بنچینەی ئەو خانوەیان بەرز کردەوە وە بەهۆی یاریدەی خوای مەزنەوە، کردیان بەو خانوە کەبکرێ بەرووگەی نوێژ کردن.

ئەو زانایانە مانای قورئانیان کردوە، مێژو نوسان هەریەکەیان بەجۆرێ باسی کەعبەیان کردوە: ئایا ئەو خانەی خوایە پێش ئیبراهیم دروست کرابێ و ڕوخابێ و ئیبراهیم دروستی کردبێتەوە، وەك زۆرتر لەو زانایانە و مێژو ناسانی ئیسلام ووتویانە؟ یامێژووی دروست کردنی لە ئیبراهیمەوە دەستی پێ کردبێ مەبەستەکە ناگۆڕێ.

هەندێك لە زانایان لە باسی مێژوی کەعبەدا وەستاون بێ دەنگ هیچ بڕیارێکیان نەداوە، فەرمویانە خوا ئەیزانێ، دەربارەی ئەم باسانە ئایەتێکی قورئان و فەرمودەی بێگومانی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ نەبەڵگەیەکی ئەقڵی و نیشانەی کۆن و بیروبۆچونی زانایانی زەوی هەڵکەن بەدەستەوە نەهاتوە. کەواتەی ئێمەی موسڵمان پرسیارمان لێ ناکرێ لەلایەن

خوای گەورەوە، داوامان لێ ناکرێ لەلایەن خوای گەورەوە، داوامان لێ ناکات مێژوی دروستکردنی کەعبە بناسین.

ئیتر ئایا کەعبە پارچەیەکێ لە بەهەشت، یا بەشێ بێ لەزەوی؟ ئادەم و پێغەمەرانی دوای ئەوان چوون بۆ حەج لەو خانوەدا یانە؟ لەکاتی لافاوەکەی نوحدا برابێ بۆ ئاسمان و لە پاشان هێنرابێتەوە بۆ جێگەی ئەو سایی و ئێستای خۆی؟ بەردەرەشەکە جبریل لەبەهەشتەوە هێنای یانە؟ یا ئادەم لەبەهەشتەوە لەگەڵ خۆی هێنابێتی؟ یالەکێوی ئەبو قوبەیسەوە هاتوەتە دەرەوە؟ چەندین شتی تر: ئەوانە هەموی بەڵگەی بێ گومان لەسەریان نیە، جگە لەو هەواڵانەی یەك کەس لەپێغەومەرەوە گێراوێتیەوە، کەواتە ئێمە باخۆمانی بۆ ماندو نەکەین، ئەو شتەی داوامان لێ بکرێ دەربارەی کەعبە ئەمەیە: ئەگەر ئێمەی موسڵمان توانامان هەبو پێویستە بچین بۆلای، ڕێزی لێ بگرین و بە پیرۆزی دابنێین، بیپارێزین بە گیان و بەسامان، چاو لەپێغەمەر بکەین لەو بارەیەوە، هەروەك ئەو جۆرەی موسڵمانان کردویانەو پاراستویانە، بزانین خوا کردویەتی بە ڕووانگە بۆمان لەکاتی نوێژدا ڕووی تێ بکەین، بەجێگەی ئاواتی خۆمانی دابنێین و دڵی خۆمانی پێوە ببەستین، وەك بالندە بۆ هێلانەی خۆی.

﴿ربّنا تقبل منا﴾ ووتیان: ئەی پەروەردەکەری ئێمە ئەو کارە و نزایەمان لێ وەربگرە و پاداشتمان بدەرەوە، بەبێ گومان خوا نزاکەی وەرگرتن و پاداشتیان ئەداتەوە، خوا خۆی دەرگای پاڕانەوەی وازکردوەتەوە، لەبەندەکانی خۆی داناخا. بەتایبەتی بۆ ئەو کەسانەی خۆیان ئەپارێزن لەهەموکارە قەدەغەکراوەکان.

﴿إنك أنت السميع العليم﴾ بەڕاستی تۆ هەموشتێ ئەبیسی لەگەڵ پاڕانەوەی ئێمەدا. هەرتۆی هەمو شتێ بزانی و ئاگاداری و پاڕانەوەکانی ئێمەیشی.

﴿ربّنا واجعلنا مسلمین لك﴾ ووتیان: ئەی پـەروەردگاری ئێمـە: وەتـۆ ئێمـە بکەبـەو کەسانەی مل کەچی تۆبین و بەفەرمان بەرداری خۆت کە هەموشتێ لەتۆو بناسین و بۆتۆی بکەین بۆکەسی ترنەکەین، بەنهێنی و بەئاشکراواز لەپەرستنی تۆ نەیەرین.

﴿ومن ذرّیتنا أمّة مسلمةً لك﴾ وەتۆ دابنێ لە منالکـانی ئێمـە کۆمـەڵی نیازپـاك و مـل کەچ و تۆپەرستین، فەرمان بەرداری تۆبن. بەڕاستی پاڕانەوەکەیانوەرگیرا، ئـەوەتا بـەملیار خوا پەرست و باوەڕداریان لێ پەیدابوە.

﴿وأرینا مناسکنا﴾ وە تۆ نیشانی ئێمەی بدە و پێمان فێربکـە دەستوری ئاینەکـەمان و جێگەی بەجێ هێنانی حەج و عەمرە و چۆنیەتی کردنیان و چۆنیـەتی پەرستنەکانی تریـش خوای گەورە داواکەی وەرگرتن و فـێری چۆنێتـی پەرستنەکانی تریـش کـردن ، خـوای گەورە داواکەی وەرگرتن و فێری چۆنیەتی خوا پەرستی کردن.

﴿وتب علینا﴾ وە تۆ پەشیمان بونەوە بڕێژە بەسەر ئێمەدا، لە هەڵەکانمان ببـورە ئەگـەر ناتەواویمان هەبو خۆمان و منالەکانمان کە باوەڕیان بەتۆ هێنا.

بائەوەیش بزانین داوای لێ خۆشبون ئەوە ناگەیەنێ، ئەو کەسە گوناهباربـێ، بـە تایبـەتی ئەگەر ئەو داوایە لە پێغەمەرانەوە بێ، ئەوان هەر پلەیەکیان هـەبێ خۆیـان بەکـەم تەرخـەم دائەنێن لەئاستی پەرستنی خوادا، وای دائەنێن پەرسـتن بابگاتـە ئەوپـەڕی هێشـتا بەکـەمی دائەنێن بۆ ئەو پەرستنەی شایانی خوابێ.

﴿إنك أنت التواب الرّحیم﴾ بەڕاستی تو پەشیمان بونەوە وەرئـەگرێ لەبـەەندەکانت و لە هەڵەکانیان ئەبوورێ میهرەبانیتان زۆرە بۆیان.

﴿ربّنا وابعث فیهم رسولاً منهم﴾ ئەی پەروەردەکەری ئێمە: تۆڕەوانەبکە لـە نێـو ئـەو کۆمەڵە نیاز پاك و مل کەچ کەرە بۆ تۆ نێرراوی لـە خۆیـان، خـوای گەورەپاڕانەوەکـەی وەرگرت، لەنەوەی ئەوان پێغەمـەری ئیسـلامی بـۆ نـاردن، بۆیـە پێغەمـەر فـەرموی: مـن داواکراوی باپیرم ئیبراهیم و موژدە پێ دراوی عیسا و لەخەودا بینراوی دایکمم.

﴿يتلوا عليهم آياتك﴾ بخوێنێ بەسەریانا ئەو ئایەتانەی تۆ بەسـروش ئـەی نـێری بـۆلای کەبریتیە لە قورئان کە بەڵگەن لەسەر یەکێتی خوا.

﴿ويعلمهم الكتاب والحكمة﴾ وەبەوانی فێربکا ئەو نامەی خوایە، بەوانی فێربکا ناسینی ئایین و زانینی مانای قورئان و ئەو شتانەی دڵی مرۆڤیان پێ تەواو ئەبێ لەو هەمو زانیـاری و ئەو فەرمانانەی پێویستن بۆ ژیانی ڕۆژانەی ئادەمیزاد.

﴿ويزكيهم﴾ وەپاکیان بکاتـەوە لـە چڵـك و چەپـەڵی هاوبەشـدانان بـۆ خـوا و، لـە بەشەکانی تری گوناه بەهۆی ئەو هێزە بەرزەی خوا پێ‌ی بەخشیوین.

﴿إنك أنت العزيز الحكيم﴾ بەڕاستی تۆ زۆر بەتوانای، هەمو شـتێ لەجێگـەی شـیاوی خۆیانا دائەنێ، هیچ کەسێ توانای بەسەر تۆدا نیـە، هەرشـتێ تـۆ بیکـەی بـۆ مەبەسـتێکی شایستەیە.. لەنەوەی ئیبراهیم و ئیسماعیل جگە لە موحەمـەد کەسـی تـری بەفروسـتادەیی نەنێرراوە، پێغەمەرەکانی تر هەمویان لەنەوەی یەعقوبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمن.

ئەگێڕنەوە عەبدوڵای کوڕی سەلام داوای لە برازاکانی خۆی سەلەو موهـاجر کـرد و پێی ووتن: خۆ ئێوە ئەزانن خوا لەتەوراتا فەرمویەتی: من لەنـەوەی ئیسـماعیل پێغەمـەرێ ئەنێرم ناوی موحەمەدە، ئەو کەسەی باوەڕی پێ ئـەکات ڕانومـایی کـراوە، ئـەو کەسـەی باوەڕی پێ نەکا لە میهرەبانی خوا دورئەخرێتـەوە، سـەلەی بـرازای بـاوەڕی هێنـا. بـەڵام موهاجیر بەبێ باوەڕی مایەوە.. هەروەها جولەکەکان خۆیـان هەڵئەکێشـا و ئـەیان ووت: ئێمە نەوەی یەعقوبی کوڕی ئیسحاقی کـوڕی ئیـبراهیمین، گاورەکـان ئـەیان ووت: ئێمـە پێغەمبەرەکەمان عیسای کـوڕی مەریەمـەی کچـی عیمرانـە و لەنـەوەی ئیبراهیمـە. بـت پەرستان ئەیان ووت: ئێمە لەنەوەی ئیسماعیلی کـوڕی ئیـبراهیمین، هـەمویان خۆیـان بـە ئیبراهیمەوە هەڵئەکێشا، ئەیانزانی پێغەمەر لەنەوەی ئیسماعیلە. بێ گومـان ئـەو کەسـانەی باوەڕبە موحەمەد نەکەن، باوەڕیشیان بە ئیبراهیم نەکردوە، بۆیە خـوا بەهەڕەشـەوە بـەوان ئەڵێ:

وَمَن يَرۡغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبۡرَٰهِـۧمَ إِلَّا مَن سَفِهَ نَفۡسَهُۥۚ وَلَقَدِ ٱصۡطَفَيۡنَٰهُ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَإِنَّهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٣٠﴾ إِذۡ قَالَ لَهُۥ رَبُّهُۥٓ أَسۡلِمۡۖ قَالَ أَسۡلَمۡتُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٣١﴾ وَوَصَّىٰ بِهَآ إِبۡرَٰهِـۧمُ بَنِيهِ وَيَعۡقُوبُ يَٰبَنِيَّ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰ لَكُمُ ٱلدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٣٢﴾ أَمۡ كُنتُمۡ شُهَدَآءَ إِذۡ حَضَرَ يَعۡقُوبَ ٱلۡمَوۡتُ إِذۡ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعۡبُدُونَ مِنۢ بَعۡدِيۖ قَالُواْ نَعۡبُدُ إِلَٰهَكَ وَإِلَٰهَ ءَابَآئِكَ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ إِلَٰهٗا وَٰحِدٗا وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ﴿١٣٣﴾ تِلۡكَ أُمَّةٞ قَدۡ خَلَتۡۖ لَهَا مَا كَسَبَتۡ وَلَكُم مَّا كَسَبۡتُمۡۖ وَلَا تُسۡـَٔلُونَ عَمَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٣٤﴾

﴿ومن يرغب عن ملة إبراهيم﴾ وەئایا چ کەسێ بێ واز لەئاین و ڕێگەی ڕاستی ئیبراهیم بێنێ بەو ئایەتە ڕاستەوە هەیەتی، بێگومان هیچ کەسێ وازی لێ ناهێنێ.

﴿إلاّ من سفه نفسه﴾ مەگەر کەسێ خۆی بێ نـرخ و ریسـوا کردبـێ و نـەزانبێ وورد نەبێتەوە.

﴿ولقد اصطفيناه في الدنيا﴾ وەبەڕاسـتی ئێمـە ئیبراهیممـان هـەلبژاردەوە بـە پـاکی و پاکیزەیی بۆ پێغەمەرایەتی ئێمە هەمو شتێ لەجێگەی شایستە خۆیـا دائـەنێن، کردومانـە بـە پێغەمەر لـە جیهاندا.

﴿وإنّه في الآخرة لمن الصّالحين﴾ وەبەڕاستی ئیبراهیم لـە ڕۆژی دوایدا لە پیاو چاکەکانـە چونکە لـە جیهاندا لـەپیاو چاکان بوە، ئاینی ئیسـلام ڕۆژی دوایـی بـەکردەوەی جیهانـەوە ئەبەستێ، ئەو کەسەی لـەجیهاندا پێشەوای چاکان بوبێ لـە ڕۆژی دووایشدا هەر پێشەوایە.

﴿إذ قال له ربّه أسلم﴾ کاتێ فەرموی بە ئیـبراهیم پـەروەردگاری خـۆی: تـۆ فـەرمان بەردار و مل کەچی فەرمانەکانی من بە، بیخەرە دلـی خۆت بەلـگەیـە پـالـت پێـوە بنـێ بـۆ ناسینی ئێمە.

﴿قال أسلمت لربّ العـالمين﴾ ئیـبراهیم ووتـی: مـن فرمـان بـەردار و مـل کـەچم بـۆ پەروەردەکەری هەمو بونـەوەران. کەواتـە ئیـبراهیم هـەلبژاردەی خوایـە، وەلامـی هـەمو فەرمانەکانی خوای داوەتەوە، بەتەواوی بە کارە گرانەکانی پێغەمەرایەتی هەلساوە.

بەو ئایەتە خوای گەورە پاکی و بێ گەردی و پەرسـتن و فـەرمان بـەرداری ئیـبراهیمی ڕون کردوەتـەوە، هـەروەها سـەری جولەکـەکان و گـاور و بـت پەرستەکانیشـــی پـێ ئەکوتێتەوە کە خۆیانیان بە ئیبراهیمەوە هەلئەکێشـا، کـەچی لـە دووایـیدا دەسـتیان کـرد بەگوناه کردن و یاخی بـون لـەو کەسـەی ڕێگـەو ڕێبـازی ئیـبراهیمی زیندوکردوەتـەوە، ڕەوشت و بیروباوەڕی ئیبراهیم بلاو ئەکاتەوە کە پێغەمەری ئیسلامە ﴿ﷺ﴾.

﴿ووصّى بها ابراهيم بنيه﴾ وە ئیبراهیم ڕای سپارد و ئامۆژگاری کوڕەکانی کرد بۆلای ڕێگەی ڕاست. یا ئامۆژگاری کردنی بەپوختەی مانا و ناوەڕۆکی ووشەی (أسلمت) واتـە ئیـبراهیم هـەر بـەخۆی وازی نـەهێنا کـە ڕێگـەی ڕاسـت بگـرێ. بـەلکو ئامۆژگـــاری

کوڕەکانیشی کرد کە ئەوانیش مل کەچ و فەرمان بەرداری خوابن هەروەك خۆی. ئەو کوڕانەی ئیبراهیم ئەوەی ڕاستی بێ هەشت کوڕن:

١- ئیسماعیل دایکی ناوی خاتون هاجەرە لەنەوە قیبتیەکانی میسرە، کوڕی گەورەیی ئیبراهیمە بە شیرەخۆرەی لە مەکە نیشتەجێ کردوە لەگەڵ دایکیا، ئەو کوڕەیە خوا فەرمانی کرد کە ئیبراهیم سەری ببڕێ لەتەمەنی (١٣٧)دا کۆچی دوایی کردوە.

٢- ئیسحاق دایکی ناوی خاتون سارای ئامۆزای ئیبراهیمە، لە پاش ئیسماعیل بە (١٤) ساڵ لەدایك بوە. ڕۆم، یۆنان، ئەرمەن، جولەکەکان لەنەوەی ئیسحاقن، لەتەمەنی (١٨٠) سەد و هەشتا ساڵیدا کۆچی دوایی کردوە، لای ئیبراهیمی باوکی لە خاکی پیرۆزدا نێژراوە.

٣- ئیبراهیم لە پاش مردنی خاتون سارا قەنتورای کچی یەقنون لەنەوە کەنعان هێناوە، شەش کوڕی لەو ژنەیانی بوە: ناویان: مەدیەن. مەداین، نەهشتان، زەمران، نەشین، شیوخ، ئیبراهیم بە (٢٦٠٠) دوو هەزار و شەش سەد ساڵ بەر لەدایکبونی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ کۆچی دوایی کردووە.

﴿ويعقوب يابنيّ﴾ وە یەعقوب ئامۆژگاری کوڕەکانی خۆی کرد. یانی ئیبراهیم و یەعقوب هەردوولایان ئامۆژگاری کوڕەکانی خۆیانیان کرد، ووتیان ئەی کوڕانی خۆمان:

﴿إن الله اصطفى لكم الدّين﴾ بەڕاستی خوا هەڵبژاردوە بۆ ئێوە ئایینی بێ خەوشی ئیسلام کە پوختەی هەمو ئایینەکانە، لەپاش ئەو ئایینێ ترنایە، بۆ هەمو کاتێ دەست ئەدا.

﴿فلا تموتنّ إلاّ وأنتم مسلمون﴾ دووای ئێوە نەمرن مەگەر ئێوە موسڵمانبن، خوا پەرست و چاکە کەربن، مل کەچی فەرمانی خوا بن، پشت بە میهرەبانی خوا ببەستن، ڕاوەستن و بەردەوامبن لەسەر ئایینی ئیسلام، پشتی تێ نەکەن هەتا ئێوە ئەمرن، بۆئەوەی لەدووا ڕۆژدا لەسەری زیندو بکرێنەوە بەو ئایینە خاوێنەوە.

یەعقوب (١٢) دوازدە کوڕی بوە، ناویان: ڕۆبین ، شەمعون، لاویی، یەهوزا، یەش سوخود، زەبولون. زەوانا، نەفتونا، کوزا، ئوشیر، بنیامین، یوسف.

خوای گەورە بەو ئایەتە پیرۆزە ئاگادارمان ئەفەرموێ:

هەمو باوکێ لێپرسراوی منالەکانی خۆیانن، بەخێویان بکەنو پەروەردەیان بکەن، فێرکاری چاکیان بکەن، ڕانمویان بکەن بۆلای ئایینی پاك و ڕەوا، بەگوێرەی توانا کەمتەرخەمییان لەگەڵ نەکەن، لەخوا بپاڕێنەوە بۆیان و یاریدەیان بدەن، پاشە ڕۆژیان بدەنە دەستی خوای بە میهرەبان.

ئەوەی ڕابردو لەماناى ئەو ئایەتانەوە ئامۆژگاری ئیبراهیم و یەعقوب بون بۆ کوڕەکانی، بەجۆرێ ئیبراهیم و یەعقوب لەسەرەمەرگا ئەو ئامۆژگاریانەی لەبیر نەچوبو دووپاتیان ئەکردەوە وە بۆ کوڕەکانیان، هەتا وەکو هەمو کوڕانی ئیسرائیل پاش بیستنی لەبیریان ئەچێتەوە، هەروەها جولەکەکان ئەیان ووت: بەیەعقوب لەکاتی مردنیا ئامۆژگاری کوڕەکانی ئەکرد کە بەجولەکەیی بمرن. بۆ بەدرۆ خستنەوەیان خوا فەرموی:

﴿أم كنتم شهداء إذ حضر يعقوب الموت﴾ ئایا ئێوەی جولەکە ئامادەبون کاتێ کەیەعقوب لەسەرەمەرگی مردندا لەلای بون. بێ گومان ئێوە لەلای ئەو نەبون.

﴿إذ قال لبنيه ماتعبدون من بعدى﴾ ئەو کاتە یەعقوب فەرموی بەکوڕەکانی: چ شتێ ئەپەرستن ئێوە لەپاش مردنی من. کەواتە ئێوە لە چ لایەکەوە ئەو داوایەتان هێناوە بفەرموێ دوای من ئێوە جولەکەبن.

﴿قالو نعبد إلهك وإله آبائك إبراهيم وإسماعيل و إسحاق﴾ کوڕەکانی لە وولامیا ووتیان: ئێمە ئەپەرستین خوای تۆ و خوای باوکانی تۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق یانێ ئەو کەسە ئەپەرستین ئێوە و هەمو کەسانی تر ئەی پەرستن و شایانی پەرستنبێ. لەو ڕستەیەدا ئیسماعیل لە ڕیزی باوکی یەعقوبا دانرا کەچی مام یەتی و باوکی نیە، بۆئەوەی

بزانرێ مامیش بە وێنەی باوك پێویستە ڕێزی بگیرێ، بۆیە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فەرموی بە عەباس: ئەمە پاشماوەی باوکەکانی منە.

﴿إلهاً واحداً﴾ پەرستراوێکی تاك و تەنهایە، جگە لەو کەسی تر شایانی پەرستنی نیە. ئاشکرایە ئامۆژگاری ئیبراهیم بۆ کوڕانی خۆی و ئامۆژگاری یەعقوبیش بۆ کوڕانی خۆی جێگەی خۆیانیان گرت، بەچاکی چاودێری ئامۆژگاری ئەوانیان کرد.

﴿ونحن له مسلمون﴾ وە ئێمە بۆ ئەو خوا تەنهایە مل کەچ و فەرمان بەرداریـن، هەرئەو ئەپەرستین. کەواتە ئەی جولەکەکان: ئێوە ئەگەر لەکاتی مردنی یەعقوبا لەلای بون و فەرمودەی ئەوتان ببیستایە ئەتان زانی خۆتان درۆئەکەن لەداواکاریەکەتانا کە یەعقوب ووتوێتی بە کوڕەکانی: ئێوە هەر بە جولەکەیی بمرن، پڕوپاکندەی درۆینە مەکەن بۆ پێغەمەرانی خوا، پێویستە ئێوەی جولەکە ئایینی ئیسلام بپەرستن ئێوە و ئەوان زۆر دووردن لە یەکتری، بۆیە خوا فەرموی:

﴿تلك أمّةٌ قد خلت لها ماكسبتْ﴾ ئەوانە کە ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاقە کۆمەڵێ بون ڕابوردوون بەرێگەی خۆیانەوە ڕۆیشتن و مردن، بۆ ئەوان هەیە ئەو شتەی کردویانە لە کردەوەی چاك، چاکەیان هەر بۆ خۆیانە، لایان نەداوە بۆ لایەتر، جگەی لە پەرستنی خوا و چاکە کردن.

﴿ولكم ماكسبتم﴾ وە بۆ ئێوەیش هەیە شتی کردوتانە، لەلای خوا جگەی کردەوەی خۆتان هیچ شتێ ناگاتە فریاتان.

﴿ولا تسألون عمّا كانوا يعملون﴾ وە ئێوە پرسیارتان لێ ناکرێ لەشتێ ئەوان کردویانە ئێوە واز لەوان بێنن، ئێوە بەرپرسیارن لەکردەوەی خۆتان، پاداشتی چاکەی کەس بۆ ئێوە نابێ، بە خراپەی کەسیش ئێوە گیرۆدە نابن.

خوای گەورە بەو ئایەتە هەڕەشە لەو کوڕانە ئەکا کردەوەیان وەك کردەوەی باوك و باپیریان چاك نەبێ، باوك و باپیریان ناگاتە فریایان، ئیتر نابێ بە چەنەبازی و ئاواتی خراپیان

خوا بەدرۆبخەنەوە، بۆ نازانن هەمو ئادەمیزادی سەرزەوی هەمویان لە بنچینەدا لەنەوەی پێغەمبەرێکن؟ زۆربەیان بێ باوەڕو دۆزەخین، بۆیە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فەرموی: (( ئەی سەفیەی پوری موحەمەد، ئەی فاتیمەی کچی موحەمەد، بێن بۆلای من لە ڕۆژی دوایدا بە کردەوەکانتانەوە. نەك بە نەسەب و باوك و باپیرتانەوە، ئەو کەسەی کردەوەی دووای خستبێ نەسەبی نایخاتە پێشەوە.. ئەو فەرمودەی پێغەمەرە لەژێر ڕوناکی ئەو ئایەتە ڕابوردووانەوە هاتوە. مانای ئایەتی ﴿فلا أنساب بینهم یومئذٍ ولا یتساءلون﴾ دووایی نەسەبەکان لەو ڕۆژەدا لە نێوان ئەواندا نیە، لە یەکتری پرسیار ناکەن.

جولەکەکان ئەیان ووت: ئێوە ببن بە جولەکە، چونکە موسای پێغەمەری ئێمە گەورە ترینی پێغەمەرانە، تەورات گەورەترین نامەیە، ئایینی ئێمە گەورەترین ئایینە، باوەڕیان بە عیسا و ئینجیل و موحەمەد و قورئان نەبو. گاورەکان ئەیان ووت: ئێوە ببن بەگاور، پێغەمەری ئێمە عیسایە و نامەکەمان ئینجیلە، ئایین و نامەی پێغەمەر و نامەی ئێمە گەورەترن لەهەمو ئایین و پێغەمەر و نامەکانی تر، باوەڕیان بە موحەمەد و قورئان نەبو.

خوای گەورە بۆ بەدرۆ خستنەوەیان لەو داوایانەیان، ئەم ئایەتانەی نارده خوارەوە:

وَقَالُوا۟ كُونُوا۟ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ تَهْتَدُوا۟ ۗ قُلْ بَلْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِـۧمَ حَنِيفًا ۖ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٣٥﴾ قُولُوٓا۟ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ وَمَآ أُوتِىَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَآ أُوتِىَ ٱلنَّبِيُّونَ

مِن رَّبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ﴿١٣٦﴾ فَإِنْ ءَامَنُوا۟ بِمِثْلِ مَآ ءَامَنتُم بِهِۦ فَقَدِ ٱهْتَدَوا۟ ۖ وَّإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّمَا هُمْ فِى شِقَاقٍ ۖ فَسَيَكْفِيكَهُمُ ٱللَّهُ ۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١٣٧﴾ صِبْغَةَ ٱللَّهِ ۖ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ صِبْغَةً ۖ وَنَحْنُ لَهُۥ عَٰبِدُونَ ﴿١٣٨﴾

﴿وقالوا كونوا هوداً أو نصارى﴾ وە جولەکەو گاورەکان ئەیان ووت بە موسـڵمانان: ئێوە بن بە جولەکە یا بەگاور. واتە جولەکەکان ئەیان ووت: ئێوە بن بەجولەکە، چونکـە بەگومانی خۆیان ڕانموی وەرئەگرن، ڕانموی هەر لای ئەوانە. گاورەکان ئەیان ووت: ئێـوە بن بەگاور، ڕانومایی هەر لای ئێمەیە و بەس، جولەکە و گاورەکان خۆیـان لـەنێو خۆیانا هەریەکەیان ئەوی تریان بەهیچ شتێ دانانێن، یەکتری بە درۆزن ئەژمێرن.

﴿تهتدوا﴾ ئەگەر ئێوە بن بەگاور یابەجولەکە ئێوە ڕانومایی وەرئـەگرن، ئـەو گفتوگـۆ نارەوایە وێنەی ئەوەیە ئـەیان ووت: جولەکـە و گاورنـەبێ کەسـی تـر ناچێتـە بەهەشـت، لەکاتی ماناکردنی ئایەتی (١١١) سەد و یازدەی ئەم سورەتە وڵامیان درایەوە خوا فەرمانی دا بەپێغەمەر لێرەیشدا بەم ئایەتە ووڵامیان بداتەوە فەرموی:

﴿قل بل ملّة إبراهيم حنيفاً﴾ موحەمـەد تـۆ بڵـێ بـەوان: بـەڵکو ئێمـە دووای ئـایینی ئیبراهیم ئەکەوین وازی لەهەمو ئاینێ هێناوە، ڕوی کردوەتـە ئـاینی پـاك و خـاوێن، ئێـوە ڕێگەی خوار و خێچتان گرتوە.

﴿وماكان من المشركين﴾ وە ئیبراهیم لەو کەسانە بوە هاوبەشیان بۆ خوا دانەناوە، وەك ئێوە نەبوە هاوبەشی بۆ خوا دانابێ: جولەکەکان گومانیان وایە عوزەیر کوڕی خوایە. گاورەکان ئەلێن: عیسا کوڕی خوایە. ئێوە بەو سەرلێ شێوایەوە بەکەڵکی ئەوەنایەن کەس لەگەڵتانبێ. خوا فەرمانی دا بەموسڵمان و فەرموی:

﴿قولوا آمنا بالله﴾ ئێوەی موسڵمان بڵێن: ئێمە بڕوامان بەخوا هەیە کەبێ هاوبەشە و تاك و تەنیایە. بێ وێنەیە و کەسی لێ نەبوە.

﴿وما أنزل إلينا﴾ وە بڕوامان بەو شتە هەیە نێردراوە بۆلای ئێمە کە قورئانە، بەلامانەوە وایە گەورەترین نامەیە کە هاتوەتە خوارەوە بۆ سەر ئادەمیزاد.

﴿وما أنزل الى إبراهيم﴾ وە بڕوامان بەو شتە هەیە نێردراوەتە خوارەوە بۆ سەر ابراهیم کە پێی ئەوترێ (صحف) واتە پەڕاوەکان کە (١٠) پەڕەن.

﴿وإسماعيل وإسحاق ويعقوب والأسباط﴾ وە بڕوامان بەو شتە هەیە هاتۆتە خوار بۆسەر ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب ئەسبات، ئەوانە هەر چەندە نامە و پەڕاویان بۆنەهاتوە. بەڵام چونکە کاروباریان بەنامەی ئیبراهیم بوە، وەك بۆ ئەوان نێرابێ وایە.

کەواتە جێگەی خۆیەتی بژێری بۆ ئەوان هاتوەتە خوارەوە.

ئیسماعیل و ئیسحاق کوڕی ئیبراهیمن، یەعقوب کوڕی ئیسحاقە، ئەسبات بریتین لەنەوەی (١٢) دووازدە کوڕی یەعقوب کەدوازدە هۆزی جولەکەی لێ پێك هاتوە، هەتا هاتنە خوارەوەی تەورات بۆسەر موسا پێویست بوە لەسەریان دەستور و یاسایان نامەی ئیبراهیم بێ.

﴿وما أوتي موسى وعيسى﴾ وە بڕوامان هەیە بەشتێ بەخشراوە بە موسا و بەعیسا وەك تەورات و ئینجیل ئەو کاربەکەس نەکراونە کەدراوە بەوان.

﴿وما أوتي النّبيون من ربّهم﴾ وە بڕوامان هەیە بەشتێ بەخشراوە بە پێغەمبەرەکان لەلایەن پەروەردەکەری خۆیانەوە لەگەڵ ئەو هەموکارە بەکەس نەکراوانەدا.

﴿ لا نفرق بين أحدٍ منهم ﴾ ئێمەی موسوڵمان جیاوازی ناخەینە نێوان هیچ یەکێ لەو پێغەمەرانە ، بڕوامان بەهەموویان هەیە ئیتر نامەیان بۆ هاتبێ یان نە .

﴿و نحن له مسلمون ﴾ وە ئێمە مل کەچ و فەرمان بەردارین بۆ خوا، بڕوامان بەهەمو پێغەمەران و نامەکان هەیە، خوا بەتاك و تەنها ئەزانین بۆ پەرستنن.

﴿فأن آمنوا بمثل ماآمنتم به﴾ دووایی ئەگەر خاوەن نامەکان و بت پەرستان باوەڕیان هێنا بو بە وێنەی شتێ ئێوە باوەڕتان بەو شتە هێناوە، بە بڕوایێکی پاك و خاوێن کە بڕوایە بە خوای تاك و تەنها و بڕوا بەهەمو پێغەمەران و هەمو نامەکان.

﴿فقد اهتدوا﴾ دووایی بەڕاستی ئەوان ڕێنموییان وەرگرتوە، وە ڕێگە ڕاستیان گرتوە.

﴿وإن تولّوا﴾ وە ئەگەر پشت بکەنە ڕاستی، بڕوا بەهەمو پێغەمەران و هەمو نامەکان ئەیەرن، جیاوازی بەکار بهێنن.

﴿فانما هم في شقاق﴾ دووایی بەڕاستی ئەوان لە نێوئاژاوە و دووبەرەکیدان، هەر یەکەیان لایێکیان گرتوە، بەتەنها دژی تۆ نین، دژایەتی یەکتریش ئەکەن، لەتێکدانی نێوان ئادەمیزاد ناوەستن و دوژمنی هەمویانن.

﴿فسيكفيكهم الله﴾ دووایی خوا لە مەوپاش تۆ ئەپارێزێ لە گێرەشێوێنی ئەوان، خوا بەسە بۆ تۆ و پاراستنی تۆ لەفێڵی ئەوان، فێڵەکەیان بۆخۆیان ئەگەڕێتەوە و جگەری خۆیان ئەبڕێ، بەڕاستی ئەو بەڵێنە بەرزەی خوا هاتەدی موسڵمانان سەرکەوتن، بەچاوی خۆیان بینیان بەنی قورەیزەکان دیل کران و کوژران، بەنی نەزیر دەربەدەربون.

﴿وهو السميع العليم﴾ وە هەر خوایە هەمو شتێ ئەبینێ، پاڕانەوەی تۆ ئەبیستێ، هەمو شتێ ئەزانێ.

﴿صبغة الله﴾ ئێمەی موسڵمان ڕەنگ کراوین بە ڕەنگی خوا کە ئاینێکی ئەو تۆیە دڵی ئادەمیزاد و ئەقڵی ئادەمیزاد پاك ئەکاتەوە لە چڵك و چەپەڵی، ئێمە بەو ئاینە پاکە ڕەنگ کراوین و پشتی تێ ناکەین، نەك وەك ڕەنگی گاورەکان کە لەدووای حەوت ڕۆژ لەدایك

بونی منالەکانیان ئەبەن لە ئاوێکی زەرد هەڵیان ئەکێشن و ئەڵێن: بەناوی بـاوك و کـوڕ و جوبرەئیلەوە ناوی ئەبەن بە (العمودیە) یانێ تەڕکراو بـە گومـانی خۆیـان بـەو کـارە پـاك ئەکەرێنەوە، ئەوەی ڕاستی بێ هەر تەنها گاورەکان وانین. بەڵکو هەمو خاوەن بیرو باوەڕێ بەو بیروباوەڕە ڕەنگ کراون، پـەیڕەو نەخشـە و ڕەوشـتی پێشـەواکانیان ئەکـەون. بـەڵام پێویستە موسڵمانان پەیڕەوی ڕەنگ و ئاینی خوا بکەون، ڕەنگی تر بەچاك نەزانن وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿ومن أحسن من الله صبغةً﴾ وە چ کەسێك شیرین و چاکتر بێ لە خوا لەلایەن ڕەنگ کردنەووە و لەلایەن ئایینەوە؟ بێگومان هیچ کەسێ لەخوا چاکتر نیە لەو لایەنەوە.

﴿ونحن له عابدون﴾ وە ئێمـە خـوا پەرسـتی ئەکـەین، بەتەنـهای ئـەزانین بـۆ پەرسـتن، باوەڕمان بەخوا و هەمو پێغەمەران و هەمو نامەکان هەیە.

جولەکەکان ئاژاوەیان ئەنایەوە بۆ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ هەر لەبەر ئەوەی ئەترسان کە سودی تایبەتی خۆیان لەکیسیان بچێ، وەك فرۆشتنی ناموسی خۆیان و فرۆشتنی ئـارەق و قومـار کردن و سود خواردن. بەبێ شەرمانە ئەیان ووت: تـۆ پێغەمـەرنیت ، پێویسـتە خـوا هـەر لەجولەکە پێغەمەر بنێرێ، خوا هەر خوای ئێمەیە، ئـادەمیزاد بـۆ ئێمـە دروسـت کـراوە. گاورەکانیش لە پڕوپاگەندەی نارەوا و بەڵگەی پڕوپوچ هەروەك جولەکەکان نەئەوەسـتان ئەیان ووت: ئەگەر خوا پێغەمەر بنێرێ ئەبێ خاوەنی سامانبێ، لە مرۆڤە ماقوڵـەکانی ئێمـە بێ، بۆیە خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە، فەرمانی بەپێغەمەر دا بەوان بڵـێ: ئـەو کەسە باوەڕی بەو کەسانە نەبێ خوا چاکەیان لەگـەڵ ئـەکاو ئـەیانکا بـە پێغەمـەر تۆڵـەی خواوە و ئەگرێ، ئەفەرموێ:

قُلْ أَتُحَاجُّونَنَا فِي اللَّهِ وَهُوَ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ وَلَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُخْلِصُونَ ﴿١٣٩﴾ أَمْ

تَقُولُونَ إِنَّ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطَ كَانُوا۟ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ ۗ قُلْ ءَأَنتُمْ أَعْلَمُ أَمِ ٱللَّهُ ۗ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَتَمَ شَهَٰدَةً عِندَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿١٤٠﴾ تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ ۖ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ ۖ وَلَا تُسْـَٔلُونَ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٤١﴾

﴿قل أتحاجوننا في الله﴾ موحەمەد تۆ بڵێ بەگاوڕو جولەکەکان: ئایا ئێوە دوژمنایەتی ئێمە ئەکەن لە بارەی ئایینی خواوە و هەڵبژاردنی پێغەمەر لە عەرەب. بەگومانی خۆتان ئایینی ئێوە ڕاستە و ڕانومایی‌و چونی بەهەشت بەستراوە بەئایینی ئێوە، پێتان وایە بەهەشت هەرئێوە تێ ئەچێ، بەموسڵمانان ئەڵێن: ئێوە ببن بە گاور و جولەکە.

﴿وهو ربّنا وربّكم﴾ وەخوا پەروەردەکەری ئێمە و پەروەردەکەری ئێوەیشە، کارو فەرمانی هەمومان بەدەستی خوایە، ئیتر ئێوە دوژمنایەتی ئێمە بۆ ئەکەن، خوا بۆ هەمومان یەکسانە.

﴿ولنا أعمالنا﴾ وە بۆ ئێمەیە کردەوە و پاداشتی کردەوەکانمان، ڕێك و پێکە لەگەڵ فەرمانی خوادا، کردەوەی ئەمڕۆ بنچینەیە بۆ پاداشتی پاشە ڕۆژ.

﴿ولكم أعمالكم﴾ وە بۆ ئێوەیە کردەوەکانی خۆتان، پاداشتی ئەوانە وەرئەگرن، کردەوەی خراپ و نارێك ناگونجێ لەگەڵ فەرمانی خوادا، چۆن داوای دۆستایەتی خوا ئەکەن؟ دوژمنایەتی ئێوە لەگەڵ مندا کە خوا منی هەڵبژاردوە بۆ پێغەمبەرایەتی زیان بە خۆتان ئەبەخشێ.

﴿ونحن له مخلصون﴾ وە ئێمە بۆ خوا نیاز پاکین، پاکی خۆمان تەرخان ئەکەین بۆ بەندەیی خوا فەرمان بەرداری خواین، هەمو کارێکمان هەواڵەی لای خوا ئەکەین بەوێنەی ئێوە نین کە ئەڵێن: ئێمە داووای هەرشتێ لەخوا ئەکەین پێویستە بمان داتێ. بە گومان و بێ شەرمی خۆتان خوا فەرمان بەرداری ئێوەیە.

﴿أم تقولون إنّ إبراهیم و أسماعیلَ وإسحاق ویعقوب والأسباط کانوا هوداً أو نصاری﴾ ئێوە دوژمنایەتی ئێمە ئەکەن ئایا ئێوە ئەڵێن: بەڕاستی ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و ئەسبات جولەکە یا گاوربون، بۆیە ئێمە پەیڕەوویان ئەکەین. چۆن ئێوە دوژمنایەتی خوا ئەکەن؟ ئاواتی ئێوە چ شتێکە؟ ئێوە دوو شت ئەڵێن: یەکەمیان ئەوەیە خوا پێغەمەر لە عەرەب نانێرێ، ئەو کارە بەدەستی کەس نیە لە جگەی خوا، خوا خۆی ئەزانێ چ کەسێك ئەکا بە پێغەمەر و چ کەسێ شایستەیە؟ دووهەمیان ئەوەیە بە گومانی ئێوە پێویستە ئاین هەر ئاینی ئێبراهیم و نەوەکانی بێ، چونکە ئەوان جولەکە بوون، ئەو گومانەتان پوچ و بێ بەڵگەیە ئیبراهیم نە جولەکەبوە، وە نە گاوربوە. بەڵکو ئیبراهیم پاك و خاوێن بوە، هاوبەشی بۆ خوا دانەناوە، گاور و جولەکە پاش ئیبراهیم پەیدا بوون. کەواتە هەردوو داواکانتان پڕوپوچە.

قورائانی پیرۆز بەو ئایەتە ڕانومایمان ئەکا بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ دوژمنانی خومان بەم شێوەیە بین، هەمولاێکیان لێی ببەستین و تەنگیان پێ هەڵ چنین و سەریان پێ شۆڕبکەین، بەجۆرێکی ژیرانە کە بەگوێرەی ئەقڵ هیچیان بۆ نەکرێ یاداواکەمان وەرگرن، وەیا بێدەنگیان بکەین. نەك بەتوڕەیی لەگەڵیان گفتوگۆ بکەین و یەکەم جار دڵیان برینداربکەین.

تەماشا بکە ئەگەر کەسێ بە ئێوە بڵێ ڕوبەڕوی خۆتان: من لەئێوە زاناترم. بێگومان ئێوە پێتان ناخۆشە، ئەو کەسە بەبێ نرخ و نەزان دائەنێن، یا ئێوە مرۆڤێکتان بینی ووتی بەکەسێ ئەو سارووخەی دروست کردوە ئەچێتە نێو مریخ: من لەتۆ زاناترم کەچی لە

ناوەڕۆکانەزانە، بۆتان دەرئەکەوێ لەو کەسە گێل و گـوج ترتـان دەسـت ناکـەوێ. لـە هەموکەسێ بێ نرختر ئەو کەسانەن خۆیانیان بە ئامۆژگاری کـەری خـوا دائـەنێن، ئـەڵێن: پێویستە پێغەمەر هەر ئەبێ لە ئێمە بێ، بۆیە خوا فەرمان ئەدا بەپێغەمەر وولامیان بداتـەوە و بلێ: ﴿ قل أأنتم أعلم أم الله ﴾ تۆ بلێ : ئایـا ئێـوە زانـاترن بـە ئـاینی ئـەو پێغەمەرانـە و نەوەکانیان ، یا خوای گەورە زاناترە لەئێوە ، بێگومان خودا زانـاترە بـەئاینی ئـەوان نـەك ئێوە.

﴿ و من أظلم ممن كتَمَ شهادة عنده مـن الله ﴾ و چ کەسـێ سـتەمکار تربـێ لـەکەسـێ شایەتی دانی خوا بشارێتەوە کە فەرمویەتی ئیبراهیم لـەسەر ئاینی پـاك بـووە ، زۆر بەباشـی حاوەن نامەکان ئەزانن کەلەلایەن خواوە بۆیان هاتوە کە ئیبراهیم و کوڕەکانی و نەوەکانی پاکبوون و نیازپاك بوون ، خوایش بەو پاکیەی ئەوان ئێوەی ئاگادار کردوە لە نامەکانیانا.

کەچی ئێوە لـە ئادەمیزادی ئەشارنەوە، ئەو شتەی دژی زانین و ویسـتی خـوا بـێ ئێـوە ئەڵێن، ئیتر چ کەسێ لـە ئێوە ستەمکارترە؟ وە ئەیشتان زانـی خـوا پێغەمـەرێ ئـەنێرێ لـە عەرەب و لـەنەوەی ئیسماعیل، لـەگەڵ ئەوەیشا نەتان ئەوت و ئەتان شاردەوە، بێ شـەرمانە نامەی خوا ئەگۆڕن. کەوا بو ئێوە شایستەی سزای سەختن لـەلایەن خواوە لـەبەزەیی خـۆی دورتان ئەخاتەوە.

﴿وما الله بغافل عمّا تعملون﴾ وە خوا بێ ئاگا نی‌یە لـەشـتێ ئێـوە ئەیکـەن، ئـەو کـارە ناڕەوایە ناخرێتە ئەولاوە، بەبێ تۆڵـەو سـزا دەرناچـێ خاوەنـەکانیان ، ئـەو ڕستەیە هـەمو هەڕەشەیەکی تێدا کۆکراوەتـەوە بـۆ خـاوەن نامـەکان، هـەمو کەسـێ وێنـەی ئـەوان بـن لـەشاردنەوەی کاری ڕەوادا و هەڵسان بە دژی کاری چاك توشی سـزای سـەخت ئـەبن، شاگردەکانیان ئێستا زۆر بوون و چاوەڕووانی مرۆڤایەتیان لێ ناکرێ.

﴿تلك أمّةٌ قد خلت﴾ ئەوانە کۆمەڵێ بون لە پێغەمەران ڕابوردوون بەپیشە و کردەوەی خۆیانەوە.

﴿لها ماكسبت ولكم ماكسبتم﴾ بۆ ئەو کۆمەڵە پێغەمەرانە هەیە شتێ کردویانە و بۆ ئێوەیش هەیە شتێ ئێوە کردوتانە.

﴿ولا تسألون عمّا كانوا يعملون﴾ وە ئێوە پرسیارتان لێ ناکرێ لە شتێ ئەوان ئەیانکرد هیچ کەسێ لێپرسراوی کردەوەی کەس نیە، هەمو کەسێ بەرپرسیارە لە کردەوەی خۆی.

مانای ئەو ئایەتە بەدرێژی تر لەمانای ئایەتی (١٠٤) سەدو چوار باسکراوە، بەڵام لێرەدا دوپات کراوە ئەوە بۆ سەرزەنشتی جولەکە و گاور و بت پەرستان و هەمو بێ باوەڕانی تر کەخۆیان خەریك نەکەن بەباسی گەلانی خۆیان و ئایینی خۆیان، هەتا بزانن ئەو ئایینانە ڕۆیشتن و باویان نەما و ڕۆناکیان کوژاوەتەوە ئەمڕۆ باس باسی موسڵمان و ئایینی ئیسلامە، کەدەماری خۆی بەنەلەخشاوی داکوتاوە بەبەڵگە و بەڵێنی کاریگەرەوە. ئەوەی ئەبینرێ ئێستا بیروباوەڕی ڕاستی ئیسلامە پێویستە ئێمە پەیڕەوی بکەین، ئەو ئایینانە ڕابوردوون نازانرێن و یاسایان نازانین، بۆیە باویان نەماوە، ئەو کەسانەی دووای ئەوان پرسیاری کردەوە پێشوانیان لێ ناکرێ، ئاینی ئیسلام شیاوی ئادەمیزادە لە هەموکات و لەهەمو جێگەیە پێویستە بیکەین بە ڕوناکی بۆ خۆمان، هەموشتی پی ببینین.

پاك نوسی مانای جزمی یەکەم بەیاریدەی خوا کۆتایی پێ هات
مانگی ڕەبیعی دووهەم ڕۆژی یەك شەممە ١٤١٨/٣/١ کۆچی
ڕێکەوتی ١٩٩٧/٧/٢ زاینی.

بەیارمەتی خوای گەورە
چاوەڕوانی بەشەکانی تری ئەم تەفسیرەبن

**تێبینی :**

سەرچاوەکان لەدوا بەشی ئەم تەفسیرەدا بڵاو دەکرێتەوە .

﴿ پێڕست ﴾



﴿ پێڕست ﴾

﴿ پێڕست ﴾



﴿ پێڕست ﴾

﴿ پێرست ﴾



﴿ پێرست ﴾

## ﴿ پێڕست ﴾



## ﴿ پێڕست ﴾

﴿ پێڕست ﴾



﴿ پێڕست ﴾

﴿ پێرست ﴾



﴿ پێرست ﴾